پ.د.ئەورەحمانی حاجی مارف

# ڕێزمانی کوردی

## بەرگی یەکەم
## (وشەسازی)

## بەشی یەکەم
## (ناو)

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب : | ڕێزمانی کوردی/ بەرگی یەکەم/ (مۆرفۆلۆژی) بەشی یەکەم/ نـــاو |
| ناوی نووسەر: | د. ئەورەحمانی حاجی مارف |
| ڕێکخستن و پێداچوونەوەی | د. نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو |
| نـــرخ: | (٦٠٠٠) دینار |
| دەرهێنانی هونەری ناوەوەو بەرگ | خەلیل هیدایەت مام شێخ |
| شوێنی چاپ: | چاپخانەی ڕۆژهەڵات – هەولێر (٤٦٣٩٥٣١) |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی ( ٧٧٩ ) ساڵی ٢٠١٤ ی دلوەتێ

بەڕێوەبەری هونەری دەزگا

سلام محمد رسول

# پێشەکی



ڕێزمان (grammar) وەك ماددەیەكی زانست یەكێكە لە بەشە پێكهێنەرەكانی زمانناسی و بریتییە لە كۆمەڵێ یاسا و دەستوور لەبارەی گۆڕینی وشە و چوونە پاڵ یەكدی وشە لە ڕستەدا. زاراوی (grammar) لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە و وەك ئاشكراشە بناغەی ڕێزمانی زانستی لە یۆنانی كۆندا دامەزراوە. بە زمانی یۆنانی بە ڕێزمان دەڵێن (grammatika) كە واتای ((هونەری نووسین)) دەگەیەنێ. بەم جۆرە زانایانی زووی ڕێزمان وا تەماشای ڕێزمانیان دەكرد، كە دەبێ بەر لە هەرچی لە ڕووی ڕێنووس و لە ڕووی شێوازەوە، مرۆڤ فێری ڕاست نووسی بكات.

هەر زمانێك خاوەنی ڕێزمانی خۆیەتی، لەبەر ئەوە ڕێزمان وەك زانستێك لەسەر كەرەستەی چەسپاوی ئەو زمانە دادەڕێژرێ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا وەك ماددەیەكی زانست ڕێزمانی گشتی هەیە، ئەویش كە مەبەستی ڕێكخستنی شێوازی گشتییە لە لێكۆڵینەوەی پێكهاتنی ڕێزماندا. هەرچەندە هەر زمانە خاوەنی كەرەستەی تایبەتی و شێوەی جیاواز و بەكارهێنانی سەربەخۆیە و ئەو تایبەتییانە لە زمانی جیاوازدا دەبینرێن، كەچی سەرەڕای ئەوەش هەندێ بنەما هەن كە پێویستە بخرێنە نێو بناغەی لێكۆڵینەوەی هەر زمانێكەوە."[1] بەو پێیە بۆ تێگەیشتنی ڕێگە سەرەكییەكانی ڕێزمانی كوردی

---

[1]– ڤ . ڤ . ڤینۆگرادۆڤ ، زمانی ڕووسی ئەمڕۆ (مۆرفۆلۆژی) ، مۆسكۆ، ١٩٥٢ ، ل ٢٢.

پێویست بە ئاوڕدانەوە و لێکدانەوە و شیکردنەوەی هەندێ کێشەی زانستی زمان هەیە.

لە خوێندن و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی ی ئەمڕۆدا هەریەکێك لەم بەشانە: لێکسیکۆلۆژی و فریزیۆلۆژی، فۆنەتیك و فۆنۆلۆژی، نووسین و ڕێنوس، وشەڕۆنان، ڕێزمان (مۆرفۆلۆژی و سینتاکس)... بایەخی تایبەتی و پێویستی خۆیان هەیە.

مۆرفۆلۆژی و سینتاکس دوو بەشی گرنگ و هاوسەنگی ڕێزمانن"[٢]".
ڕێزمانیش ئەو زانستەیە کە لە پێکهاتنی وشە و ڕستە دەدوێ.

پێکهاتنی ڕێزمانی هەر زمانێك لە ئەنجامی تێپەڕبوونی چەند سەدەیەکە وە پەیدابووە و موڵکی هەموو میللەتە، نەك هی تەنیا چینێك.

ڕێزمان وەك زانست بریتییە لە دوو بەشی هاوبایەخ:

١- مۆرفۆلۆژی (علم الصرف Morphology): زاراوی مۆرفۆلۆژی کە لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە، لە: (morphe- شێوە، فۆرم) و (logos- زانست، لێکۆڵینەوە) پێکهاتووە. بەم جۆرە مۆرفۆلۆژی بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە بارەی وشەوە لە ڕووی پێکهاتن و گۆڕانەوە.

٢- سینتاکس (علم النحو- Syntax): زاراوەی ئەم زانستەش، لەوشەی (Syntaxis )ی یۆنانییەوە کەوتۆتەوە، کە واتای (دانان، ڕێکخستن...) دەگەیەنێ. بەو پێیە سینتاکس لێکۆڵینەوەیە لە یەکگرتنی وشە لە ئاخاوتن و ڕستەدا.

---

[٢]- هەندێ لە زانایانی زمان ، فۆنەتیك- لێکۆڵینەوەی دەنگەکانی ئاخاوتن- یش بە بەشێك لە ڕێزمان دادەنێن، بەڵام زۆربەی زمانناسان بە بەشێکی تایبەتی لە زانستی زمانی دەژمێرن و نایخەنە نێو ڕێزمانەوە.

لێکۆڵینەوەی زانستی و قووڵ و فراوان و تێرو تەسەلی ئەو دوو بەشە گرنگە هاوسەنگی ڕێزمان– (مۆرفۆلۆژی و سینتاکس)ی کوردی وردبوونەوە و گەڕان و سەرچاوە و ماوەی تەواوی دەوێ، بێگومان ئەنجامیش سەدان لاپەڕە داگیردەکا... بە پەرۆشەوە، ماوەیەکە خەریکی بەجێ هێنانی ئەو ئەرکەم. بەداخەوە، لەبەر چەند هۆیەك هەموو ڕوویەکی ئەو کارە بەباشی نایەتە ئەنجام... دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر لە باسی مۆرفۆلۆژیدا، توانیم بەشی (ناو) تەواو بکەم و بە کتێبێکی سەربەخۆ بڵاوی بکەمەوە. بەشەکانی دیکەی ئاخاوتنیش بە چەند کتێبێك پێشکەش دەکەم. لێکۆڵینەوەی سینتاکسیش، هەر بەو چەشنە دەبێ. واتە ئەم کارەمان کە بەناوی (ڕێزمانی کوردی)یەوەیە، بریتییە لە دوو بەرگ : بەرگی یەکەم – (مۆرفۆلۆژی)، بەرگی دووەم– (سینتاکس). هەر بەرگێکیش لە چەند بەشێك پێك دێت. ئەم کتێبەی ئیستا لەبەر دەسدایە و لە بارەی (ناو)ەوەیە، بەشی یەکەمە لە بەرگی یەکەم.

دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بۆ گەیاندنە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی بەشە ئاخاوتنی ناو، ئەوەی بۆم کرا کردم و ئەوەی لە توانستمدا بوو بە جێم هێنا... هیچ گومانم لەوەدا نییە، کە ئەم کارەی پێشکەش بە نەتەوە خۆشەویستەکەمی دەکەم، کارێکی تەواو نییە و کەم و کورتی تێدا هەیە، بەڵام ئەوەندەش هەیە، ئەم کتێبە سەرەتایەکە لەبارەی کێشەی مۆرفۆلۆژی زمانی کوردییەوە و گەلێك کەرەستەی نوێی وەهای تێدایە، کە تا ئیستا لە لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی کوردیدا باسیان نەکراوە.

ئەرکی سەرەکی ئەم کتێبە ((ناو))، تۆژینەوە و کۆڵینەوەیە لەو کێشە گرنگانەی لە ڕووی مۆرفۆلۆژی و زانستی زمانەوە پێوەندییان بە بەشە ئاخاوتنی ناوەوە هەیە لە زمانی کوردیدا، بە تایبەتی وەك: (پێناسەی ناو، ناو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە- ناوی تایبەتی و ناوی گشتی و ناوی کۆمەڵ، ناو لەڕووی هەبوونەوە - ناوی مادی و ناوی مەعنەوەی، ناو لەڕووی پێکهاتنەوە - ناوی سادە و ناسادە... جنسەکانی ناو ، ژمارەی ناو، نیشانەکانی ئیزافە...)."[٣]"

(ناو) دانەیەکی گرنگە لە باسی مۆرفۆلۆژی. ناوەڕۆك و کاکڵی بنەڕەتی مۆرفۆلۆژیش بریتییە لە لێکۆڵینەوەی بەشەکانی ئاخاوتن و پێکهاتنیان و جۆرەکانیان و گۆڕانیان. بەو بۆنەیەوە، بە پێویستی دەزانم ئاوڕێك لە کێشەی بەشەکانی ئاخاوتن بدەینەوە.

ئەوەی پتر لە نێو زماناندا هاوبەش بێ، مەسەلەی بەشەکانی ئاخاوتنە. لە لێکدانەوەی کێشەی بەشەکانی ئاخاوتنەوە باسی ڕێزمانی هەموو زمانێك دەست پێ دەکات.

---

[٣]- لێرەدا ئەوە دەخەمە پێش چاو، کە: أ- بەشێك لەو باسانەم ، بەتایبەتی باسی (ژمارەی ناو، نیشانەکانی ناسیاوی و نەناسیاوی ...) بە شێوەی وتار بڵاوم کردۆتەوە، بەڵام کەهێنامنە ناو ئەم کتێبەوە دەستکارییەکی زۆرم کردن.

ب- هەرچەندە باسی (ڕۆنانی ناو)م لە کتێبی ((وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا)) کردووە ، بەڵام نەدەبوو لەم کتێبەشدا پشت گوێ بخرێ. جا وەنەبێ باسی ناوبراوم بۆ ئێرە تەنها گوێزرابێتەوە، بەڵکو بە کەرەستەی نوێ تەواو فراوانیشم کردووە.

ج- دەبوو لەم کتێبەدا لە باسی (ئەرکی ناو لەڕستەدا)ش بدوێم، بەڵام بەداخەوە هەندێ هۆ ئەو کەلێنەیان تێ خست.

بۆ یەکەم جار نەخشەیەکی لەباری بەشەکانی ئاخاوتن لەلایەن زانا یۆنانییەکانی ئەسکەندەرییەوە (سەدەی دووەمی پێش زایین لە شاری ئەسکەندەرییە) کە بۆ زمانی خۆیان سازکردبوو هاتە ناوانەوە.

ڕۆمانەکان ئەو نەخشەیەیان بە دەستکارییەکی کەمەوە بۆ زمانی لاتینی وەرگرت. لە سایەی دەوری زمانی لاتینییەوە لە کولتووری سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەو نەخشە کۆنە بۆ لێکۆڵینەوەی هەندێ لە زمانە ئەوروپاییە نوێیەکان بەکارهێنرا و دواتر بۆ زمانەکانی دیکەی جیهان کەڵکی لێ وەرگیرا."[4]"

لەو نەخشە یۆنانی – لاتینییەدا، هەشت بەشی ئاخاوتن– کە ئەو دەمە پێیان دەوتن (بەشەکانی وشە)– دیاری کرابوون... لە زۆر زماندا تا ماوەیەکی درێژ هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهێنرا، بەڵام دواتر گەشەی پێ درا. بە وێنە لەیەکەم کاری ڕێزمانیدا کە دەربارەی زمانی ڕووسی (نەک زمانی کڵێسەی سلاڤیانی) "[5]" نووسراوە و خاوەنەکەی زانای بەناوبانگ (میخایل ڤاسیلۆڤیچ لۆمۆنۆسوڤ)ە، ساڵی ١٧٥٥، هەروەک لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانی کڵێسەی سلاڤیانی، هەروەها لاتینی و یۆنانی، هەشت بەشی ئاخاوتنی دیاری کردووە.

ئەم ڕێزمانەی م.ڤ. لۆمۆنۆسوڤ ماوەی (٧٥) ساڵێك بنکەی ئەو ڕێزمانە کورتانە بوو کە بۆ خوێندن دادەنران، واتە لەمانەشدا ددان هەر بە هەشت

---

[4]– ئا.ئا. ڕیفۆرماتسکی، سەرەتایێکی زماننناسی، چاپی چوارەم، مۆسکۆ، ١٩٦٧، ل ٣٢٠ – ٣٢١.

[5]– لە هەموو لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانی زمانی کڵێسەی سلاڤیانیشدا، هەر هەشت بەشی ئاخاوتن دەستنیشان کرابوون.

بەشی ئاخاوتندا نرابوو. ئەلێکساندەر خریستۆفۆرۆڤیچ ڤۆستۆکۆڤ بە بلاْوکردنەوەی کتێبی ((ڕێزمانی ڕووسی))، چاپی یەکەم، پیترسبورگ، ١٨٣١، چاپی دووەم، پیتر سبورگ، ١٨٣٥و، چوونە ناو زمانی زگماکەوە، کارێکی نوێی لە زمانی ڕووسیدا هێنایە ئەنجام. ئەم زانایە نۆ بەشی ئاخاوتنی دیاری کردووە، واتە بەشە ئاخاوتنی (ژمارە)ی لێ زیاد کردووە.

لە مەسەلەی ڕێزمانی ڕووسیدا تاکو سەرەتای سەدەی بیستەم، دەیان لێکۆلْینەوەی زانستی و بەناوبانگ بلاْوکراوەتەوە و لە دیاری کردنی ژمارەی بەشەکانی ئاخاوتندا کێشەی زۆر هەبووە، بەلاْم زانایانی ئەمڕۆی ڕووس دابەش کردن و نەخشەی زانای مەزن (ڤ.ڤ.ڤینۆگرادۆڤ)یان وەرگرتووە. "[٦]"

ئەو نووسەرانەی لەبەر ڕووناکی ڕێزمانی ئینگلیزیدا باسی ڕێزمانی کوردییان کردووە، لە هەشت بەشە ئاخاوتن (١– ناو ،٢– ئاوەلْناو ، ٣– جێناو ، ٤– کردار/چاوگ، ٥– ئاوەلْکردار، ٦– پریپۆزیشن، ٧– ئامرازی پەیوەندی، ٨– ئامرازی سەرسوڕمان و بانگێشتن) دواون. "[٧]" هەرچی ئەو نووسەرانەشن کە سوودیان لە ڕێزمانی ڕووسی وەرگرتووە، دە بەشە ئاخاوتنی (١– ناو ، ٢– ئاوەلْناو ، ٣– جێناو ، ٤– ژمارە ، ٥– کردار / چاوگ ،٦– ئاوەلْکردار، ٧– پریپۆزیشن ، ٨– ئامرازی پەیوەندی ، ٩–

---

[٦]– ئی. گ .گرۆلاْتۆڤ ، مۆرفۆلۆژی زمانی ڕووسی ئەمڕۆ، چاپی دووەم، مۆسکۆ، ١٩٦٥، ل ١٦–٣٢.

[٧]– بەوێنە بڕوانە:

أ– تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩.

ب– نووری علی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠.

ج– ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆلْینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی، بەغدا، ١٩٧٦.

..... هتد .

ئامرازی سەرسوڕمان و بانگێشتن ، ١٠- پارتیکل) یان دیاری کردووە."[٨]... هتد"[٩].

جیاوازی نێوان ئەو دوو بەرەیە لەوەدایە کە بەرەی یەکەم — (ژمارە) و (پارتیکل)یان بە بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆ دانەناوە، بەڵام بەرەی دووەم جیایان کردووەتەوە و مامەڵەی بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆیان لەگەڵ کردوون..

من لەو ڕایەدام کە (ژمارە) و (پارتیکل)یش دوو بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆن و پێویستە حیسابیان بۆ بکرێ. ڕاستە، تاڕادەیەك نزیکی لە نێوان (ژمارە) و (ئاوەڵناو)دا هەیە، بەڵام لەڕووی مانای ڕێزمانی و گۆڕان و بەکارهێنانی سینتاکسییەوە لەیەك جیادەبنەوە. ئەمانەش مەرجی سەرەکین، بۆ ئەوەی بە دوو بەشە ئاخاوتن دابنرێن... هەرچی پارتیکلی (دەی، دا، دە، با، دەبا، خۆ، جا...)ن، هیچ نێوانێکیان لەگەڵ ئامرازی سەرسوڕمان و بانگێشتندا نییە و بە هیچ چەشنێك ڕاست نییە بە یەك دەستە بدرێنە قەڵەم."[١٠] "

---

[٨]- بە نموونە بڕوانە:

أ- قەناتی کۆردۆ (کوردۆییێڤ)، دەستووری زمانی کوردی، مۆسکۆ- لێنینگراد، ١٩٥٧.

ب- ك. ڕ. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا، دیالێکتی کوردی موکری، لێنینگراد، ١٩٦٨. هتد

[٩]- بێگومان لەسەر بناغەی زمانی عەرەبی و هەندێ زمانی دیکەش لە ڕێزمانی کوردی کۆڵراوەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە لە باسەکەماندا پەیڕەوی ڕێزمانەکانی وڵاتەکانی ڕۆژئاوامان کردووە و سەرەڕای ئەوەش لەبەر ڕووناکی ڕێزمانی ئینگلیزی و ڕووسیدا پتر لە ڕێزمانی کوردی تۆژراوەتەوە، بایەخمان بەو لایەنە داوە.

[١٠]- بێ گومان، کاتێ دێینە سەر لێکۆڵینەوەی دوو بەشە ئاخاوتنی (ژمارە) و (پارتکیل)، ئەوە بە نموونە و بەڵگەی تەواوەوە ئەو ڕایەمان دەچەسپێنین.

بەشەکانی ئاخاوتن، کە باسی هەرە سەرەکی مۆرفۆلۆژین، لە زمانی جیاوازدا، جیاوازی لە ژمارەیاندا هەیە وخاوەنی تایبەتێتی سەربەخۆن.

دەتوانرێ بەشەکانی ئاخاوتن، کە لە هەموو زمانێکدا پەیدا دەبن، لە ڕێگەی سێ تایبەتییەوە لە یەك جیابکرێنەوە و دیاری بکرێن: ١- مانای ڕێزمانی، ٢- گۆڕان، ٣- بەکارهێنانی سینتاکسی.

بەو جۆرە لە هەڵکەوتنی زمانی کوردیدا، دەتوانرێ دە بەشە ئاخاوتن دیاری بکرێ:

١- ناو — الاسم — Noun, Substantive

٢- ئاوەڵناو — الصفة — Adjective

٣- جێناو — الضمیر — Pronoun

٤- ژمارە — العدد — Numeral

٥- کردار(چاوگ)[11] — الفعل — Verb

٦- ئاوەڵکردار — الظرف — Adverb

٧- پریبۆزیشن — حروف الجر — Preposition

٨- ئامرازی پەیوەندی — حروف العطف — Conjunction

٩- ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشتن — اداة التعجیب و النداء — Interjection

١٠- پارتکیل""[12]"" — Particles

---

[11]- لەبەر ئەوەی کردار و چاوگ لە بنەڕەتدا یەك بەشن، دانانیان بە دوو بەشی ئاخاوتنی سەربەخۆ شتێکی ڕاست نییە.

[12]- لە باسی هەر بەشێك لە بەشەکانی ئاخاوتندا بە دوور و درێژی لە گشت ڕوویەکیان دەدوێین.

دەتوانرێ ئەو دە بەشە ئاخاوتنەی لە سروشتی زمانی کوردیدا دەبینرێن، بەسەر دوو جۆردا دابەش بکرێن:

أ- وشــەی تــەواو"[13]" (الكلمــة التامــة – Autosemantic word)
وشەی تـەواو، ئـەو وشـانەن کـە سـەربەخۆ و ڕاسـتەوخۆ مانـای دیاردەیەکی مەوزوعی و واقیعی جۆراو جۆر دەبەخشن و دەتـوانن وەك ئەنـدامێکی ڕسـتە خۆیان بنوێنن.

بە گوێرەی ئەو پێناسەیە، شەش بەشـی ئاخـاوتنی کـوردی (١- نـاو،٢- ئاوەڵنـاو، ٣- جێنـاو، ٤- ژمـارە، ٥- کردار/چـاوگ، ٦- ئـاوەڵکردار) بـەر وشەی تەواو دەکەون.

ب- وشەی ناتەواو"[14]" (الكلمة الناقصة – Syntactic word)
وشــەی ناتــەواو، ئـەو وشـانەن کـە ڕاسـتەوخۆ پێوەنـدییان بـە دیـاردەی واقعییەوە نییە و سـەربەخۆ نـاتوانن وەك ئەنـدامێکی ڕسـتە خۆیـان بنـوێنن، بــەڵکو دەوریــان یاریــدەدانی وشــە تــەواوەکانی بەشــەکانی ئاخاوتنــە لــە بـەجێهێنانی ئەرکەکانیانـدا، بـە تایبـەتی لـە دەربڕینـی واتایانـدا و پێکـەوە بەستنیان لە ڕستەدا.

بە پێـی سـەرنجدان چـوار بەشـەکەی دیکـەی ئاخـاوتن: (١- پریپۆزیشـن، ٢- ئــامرازی پەیوەنــدی، ٣- ئــامرازی سەرســوڕمان و بانگهێشــتن، ٤- پارتیکل) بەر گرووپی وشە ناتەواو دەکەون"[15]".

[13]- هەروەها دەکرێ پێی بوترێ – (وشەی سەربەخۆ).

١٤- دەتوانرێ (وشەی یاریدەر) یاخود (وشەی بەستراو)یشی پێ بوترێ.

دەتوانرێ ئەو دابەشکردنەی بەشەکانی ئاخاوتنی زمانی کوردی، کە لەسەرەوە باسمان لێ کرد، لە شێوەی ئەو نەخشەیەی خوارەوەدا نیشان بدرێ.




[15] - لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد لە باسی وشەی ناتەواودا (کەئەو زاراوەی وشەی بەستراوی بۆ داناوە) پێشگر و پاشگر و نیشانەی بە جۆرێك لە وشەی ناتەواو داوەتە قەڵەم (بڕوانە: ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٤٦٧).

لەو ڕایەدام کە پێشگر و پاشگر و نیشانە، وشە نین و ئەو مەرجانەیان تێدا نییە کە لە وشەدا هەن...چونکە بەر لەهەرچی بوونی سەربەخۆیان نییە و ئەو دەورەی وشە لە ڕستەدا دەیبینێ ئەمان ناتوانن بیبینن. ئەوەی پتر ڕاستی ئەو ڕایەمان بۆ دەردەخا، ئەوەیە کە لیژنە خۆی ئەوەی ڕەچاو کردووە، کە پێشگر و پاشگر و نیشانە تەنیا لەگەڵ وشەیەکی تردا دەور دەبینن (بڕوانە: ل ٤٦٧، ٤٧١...).

بەو بۆنەیەوە لیژنە هەندی نموونەی هێناوەتەوە، وەك: پێشگری (وەر) لە وشەی ((وەرگرتن))دا، (تیّ) لە وشەی((تێپەڕ))دا... پاشگری (وان/ەوان) لە وشەی ((باخەوان))دا ، (ەك) لە وشەی ((دەستەك))دا... نیشانەی (ان) لە وشەی ((منالاّن))دا ،(ەكە)لە وشەی ((پیاوەكە))دا... دەبینین، ئەو پێشگر و پاشگر و نیشانانەی لیژنەی بە نموونە هێناویێتیێوە هیچ مەرجێكی بە وشە دانانیان تێدا نییە. لە ڕاستیدا پێشگر و پاشگر دەوری وشەڕۆنان دەبینن و جۆرێكی تایبەتین لە مۆرفێم و لە زانستی زماندا بە مۆرفێمی وشەدارێژ (Derivational morpheme) ناسراون. هەرچی نیشانەشە كە مۆرفێمی وشەگۆڕ (Inflexional morpheme)ی پیّ دەوتریّ دەچێتە سەر وشە و حالاّتی جیاوازی ڕێزمانی پێك دێنیّ. بەم جۆرە، ئەو دوو چەشنە مۆرفێمە — واتە مۆرفێمی وشە دارێژ و مۆرفێمی وشەگۆڕ — كەرەستەی ڕۆنان و گۆڕینی وشەن. بەگوێرەی بۆچوونی لیژنە بیّ ئەوە دەبیّ لە نێوان ئەو مۆرفێمە ئەفیكسیانەی یاریدەی ڕۆنانی وشەی ناسادە دەدەن یاخود واتای ڕێزمانی دەگەیەنن، لەگەلّ ئەو وشە ناتەواوانەی لە ڕستەدا دەور دەبینن و بوونی سەربەخۆیان هەیە جیاوازی نەكرێن و تێكڕا بە وشە و بە بەشی ئاخاوتن دابنرێن.

هەروەها ئەو چەند وشەیەی لە لاپەڕە ٣١٥دا دەمڕاستی لیژنە دەربارەی پرێپۆزیشن تۆماری كردوون: ((ئەم وشانە كە بوون بە پێشگر لەوە دەشۆرێنەوە پێیان بگوترێت پرێپۆزیشن، چونكە دەوریان

حەصر دەبێت لە ناو وشە نەك لە ناو ڕستە))، ئەو ڕایەی ئێمە پتەو دەکەن.

بێ گومان. هۆی دانانی پێشگر و پاشگر و نیشانە بە چەشنێك لە وشەی ناتەواو، دەگەڕێتەوە بۆ کەم و کورتی ئەو پێناسەیەی لیژنە بۆ وشەی ناتەواوی سازکردووە.

لە ئەنجامی پێشکەوتن و گەشەکردنی زماندا، وشە لە بەشێکی ئاخاوتنەوە دەگوێزرێتەوە بۆ بە شێکی دیکەی ئاخاوتن. لە ئەنجامی ئەو ڕاگوێزانەشدا، وشە خاسیەتی پێشووی نامێنێ و شێوەی نوێ وەردەگرێ و لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکی سینتاکسی دەگۆڕێت. بەوێنە وشەی ((شیرین)) لە ڕستەی ((چای شیرین خۆشە)) و ((شیرین کچێکی جوانە))دا دوو بەشی جیاوازی ئاخاوتن و دوو ئەندامی جیاوازی ڕستەن. لە ڕستەی یەکەمدا ((شیرین)) ئاوەڵناوە و دیارخەرە، بەلاّم هەر ئەو وشەیە لە ڕستەی دووەمدا واتایەکی تری وەرگرتووە و مەبەستێکی دیکەی داوە– واتە بووە بە ناو و دیارخراو بەجێ دێنێ. وشەی ((شیرین)) لە سەرەتادا هەر ئاوەڵناو بووە، بەلاّم دواتر – واتە لە ئەنجامی گەشەکردن و پێشکەوتنی زماندا– وەك ناوی تایبەتیش کەوتۆتە کار. وشەی ((پیاوانە)) لە ڕستەی ((وەستا عەلی جلی پیاوانە دەدوورێ))دا ئاوەڵناوە، چونکە وەسفی ناو دەکا. بەلاّم ئەگەر بووترێ ((شێرکۆ پیاوانە دانیشتووە))، ئەوە وشەی ((پیاوانە)) دەبێتە ئاوەڵکردار، چونکە لێرەدا وەسفی کردار دەکا– واتە چۆنیەتی دانیشتن نیشان دەدات، هەروەها لە ڕووی سینتاکسییەوە ئەرکی جیاواز

دەبینین. وشەی ((هێمن)) لە ڕستەی ((ئازاد منداڵێکی هێمنە))دا ئاوەڵناوە، لە ڕستەی ((هێمن کوڕێکی زیرەکە))دا ناوە، لە ڕستەی ((دارا هێمن دەڕۆیشت))دا ئاوەڵکردارە. بەم جۆرە دەبینین کە وشەی ((هێمن)) وەک ئاوەڵناو و ناو و ئاوەڵکردار خۆی دەنوێنێ — واتە وەک سێ بەشی ئاخاوتن بەکاردەهێنرێ. وشەی ((ئەژی)) لە ڕەسەندا کردارە، وەک دەوترێ ((مام هۆمەر بەتەنیا ئەژی)). بەڵام بۆ وشە بە ناو، وەک لەڕستەی ((ئەژی چوو بۆ قوتابخانە))دا دەبینرێ... هەندێ وشە هەن، وەک(دەر، بەر، سەر، لا، پێش، پاش، دوا، ژێر، بن...) کە ناو و ئاوەڵکردارن— واتە وشەی واتادارن، بەڵام دەتوانن وەک پێشگریش خۆیان بنوێنن، بە وێنە (بەر) لە وشەی لێکدراوی ((بەرماڵ))دا یاخود لەڕستەی نەسرین چووە بەر هەتاوەکە))دا وشەیە، بەڵام لە وشەی ((بەربوون)) و ((بەردان))...دا پێشگرە. هەروەها ژمارەیەک پریپۆزیشن، بە وێنە (پێ، تێ، لێ...)، وەک پێشگریش خۆیان دەنوێنن، بە نموونە ((پێکەنین، پێگەیشتن...)) ، ((تێکردن، تێگرتن...))، ((لێدان، لێنان...))... هتد. "[16]"

گوێزانەوە و گۆڕانی وشە لە بەشێکی ئاخاوتنەوە بۆ بەشێکی دیکەی ئاخاوتن، دیاردەیەکی هەمیشەییە لە زماندا، لە بەر ئەوە

[16] - وشەکانی (دەر، بەر، سەر، لا، پێش، پاش، دوا، ژێر، بن...) و (پێ، تێ، لێ...) کە دەبنە پێشگر لە وشەیی دەشۆرێنەوە و سەربە هیچ یەکێك لەو (دە) بەشەی ئاخاوتنەی کوردی نابن. جا دەزانین کە لەو شوێنەدا ناوەڕۆکی باسەکەمان هەندێ لە مەبەستی دیاری کراو دوورکەوتۆتەوە، بەڵام بە پێویست زانینی نیشاندانی ئەو جۆرە ڕاگوێزرانەش بووە هۆی ئەوەی لێ یان بدوێین.

دابەش کردنی وشە بەسەر بەشەکانی ئاخاوتندا کارێکی گرانە." [17]"
بێگومان هەر زمانێکیش لە گواستنەوەو گۆڕانی وشەکانیدا، خاوەنی توانست و تایبەتێتی خۆیەتی.لە زمانی کوردیدا، وەنەبێ هەموو بەشەکانی ئاخاوتن وەك یەك بە ئاسانی بگۆڕێن، بە وێنە ئاوەڵناو زوو دەبێتە ناو و ئاوەڵکردار، پریپۆزیشن و ئاوەڵکردار چالاکتر لە بەشەکانی تری ئاخاوتن دەبنە پێشگر، بەڵام جێناو لەو ڕووەوە بێ توانستە.

زۆر میللەت هەر لەزووەوە گرنگی و بایەخیان بە لێکۆڵینەوەی زمان داوە، بەتایبەتی، چونکە بەشێکی زۆری ژیان بە ئاخاوتن و گوێ گرتن و خوێندنەوە و نووسینەوە بەسەردەبرێ. ئەوچوار دیاردەیەش کە بەهەموویان زمان پێك دێنن، هۆیەکی بەکەڵکن بۆ لەیەکتر گەیشتن. وەك ئاشکراشە گرنگی و بایەخدان بە لێکۆڵینەوەی زمان، بەر لە هەمووشتێك مەبەست ڕێزمانە، چونکە ڕێزمان ناوەڕۆك و کاکڵی زمانە. هەرچەندە لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە ژمارەیەك لێکۆڵینەوە نووسراوە، بەڵام هەموو ئەوە هێشتا وەك تنۆکێك ئاوە لە دەریایەکی قووڵ و مەزن... بۆ پێشخستن و گەشەپێدانی زمانی شیرینی زگماکمان، توانستی خۆمم تەرخان کردووە. مایەی بەختەوەریم دەبێ و هیوا و

---

[17] - لە بەشێکی زۆری ئەو باسانەدا کە لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە نووسراون گەلێ حاڵەتی وەها بەرچاو دەکەوێ کە بەشەکانی ئاخاوتن تێکەڵ کراون — واتە ئاوەڵناو بە ناو دانراوە، یاخود ئاوەڵکردار بە ئاوەڵناو لە قەڵەم دراوە... بێ گومان ڕێك و پێکی جیاکردنەوەی بەشەکانی ئاخاوتن و دابەش کردنی وشە بەسەریاندا بە لێکۆڵینەوەی زانستی لە مۆرفۆلۆژی دەگاتە ئەنجام.

ئاواتێکی گەورەم دێتە دی، ئەگەر بتوانم بەم کارە خزمەتێکی بچووک پێشکەش بە زانیاری گەلەکەمان بکەم و لە بارەی ڕێزمانی زمانی کوردییەوە چەند وشەیەکی بەکەڵك بنووسم.

پڕ بەدڵ سوپاسی مامۆستایان: محەمەدی مەلا کەریم و شوکور مستەفا و کاك عەبدولڕەحمان زەنگەنە و فریاد محێدین دەکەم، کە لە دەرکردنی ئەم کتێبەدا گەلێك هاریکاریان لەگەڵ کردم. هەروەها زۆر سوپاسم بۆ کرێکاران و لێپرسراوی چاپخانەی کۆڕ، کە بەڕاستی دڵسۆزانە لە چاپدانی ئەم کارەیان بۆ هەڵسوڕاندم.

**د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف**

## - ١ -

## کورتە هەڵسەنگاندنێکی

## ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی (ناو)دا کراوون

لە هەندێ لەو کتێب و نامیلکە و وتارانەدا کە لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە نووسراون، چاومان بە باسی (ناو– الاسم – Noun) دەکەوێ... زۆربەی ئەو نووسراوانەی لەو کێشەیە دواون، نەك هەر کەم و کورتی و ناتەواوی زۆریان تێدایە، بەڵکو بەلای گەلێك ڕووی مەسەلەکەشدا هەر نەچوون... بێگومان، ئەم باسەش وەك هەموو باسێکی دیکەی ڕێزمانی کوردی پێویستی بە لیکۆڵینەوەی زانستیانە و تایبەتی و سەربەخۆ هەیە. لە بەجێهێنانی ئەم کارەدا – واتە دوای هەڵسەنگاندن و نرخاندن و بەراوردکردنی ئەوەی هەر لە زووەوە تاکو ئەمڕۆ لەبارەی ئەو کێشەیەوە نووسراوە، چوونە ناو زمانەکە و لێکدانەوە و شوێنکەوتن ئەو ڕێگەیەیان بۆ خۆش کردم، کە ئەوەی دەربارەی ناو لە زمانی کوردیدا ڕاست و زانستیانە نووسرابێ، وەربگرم و بیچەسپێنم. ئەوەی هەڵە و چەوتیشە ڕەتی بکەمەوە و وەڵامی بدەمەوە.

لەنێو زمانەوانانی کورددا بەر لە هەر کەس مامۆستا سعید صدقی کابان لە کتێبی ((مختصر صرف و نحوی کوردی))دا لەو کێشەیە دواوە..." [١٨] " لەم نووسراوەدا باسی ناو بە پێناسەیەك دەستی پێکراوە، کە دەڵێ: ((اسم –

---

[١٨]– سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی، بەغدا، ١٩٢٨.

کلمەییێکە دانرابێ بۆ ناوی انسانێ، یا حیوانێ، یا بۆ ناوی شتێ. وەکو (پیرۆت، وشتر، کێو))) (بڕوانە: ل ٧). هەرچەندە ئەم پێناسە زۆر تەواو نییە و هەندێ ناتەواوی تێدایە، بەلأم لە گەلێك لەو پێناسانەی لەم سالأنەی دواییدا بۆ ناو دانراون ڕاستتر و لە بارتر و گونجاوترە. سەرەڕای ئەوە، لە هێنانەوەی نموونەدا ڕێك و پێكی و تەرتیب دەبینرێ. بە وێنە وشەی ((پیرۆت)) بەرانبەر بە ناوی (انسان)، وشەی ((وشتر)) بەرانبەر بە ناوی (حیوان)، وشەی (کێو) بۆ ناوی شت هێنراوەتەوە — واتە هەر یەکێك لەو سێ نموونەیەی نووسەر بەرانبەر مەبەست دەوەستن.

دوابەدوای ئەو پێناسە کەمێك لە ناوی تایبەتی و گشتی کە ئەو (اسم خاص) و (اسم عادی)ی پێ وتوە دواوە (بڕوانە: ل٧). هەرلە هەمان لاپەڕەدا باسی ناوی تاك و ناوی کۆی کردووە. هەرچەندە ئەو چەند باسە تۆزێ لە نێو لاپەڕەی پتر گرتۆتەوە، بەلأم بە نیسبەت ئەو سەردەمەوە پێناسەکانی خراپ نین. ئەوەش کە سەرنج ڕابکێشێ، ئەوەیە کە لە باسی ناوی کۆدا، وتوویە (لە کوردیدا اداة جمع (ان)ە. بعضا بە (گەل) و بعضا بە (ات) جمع دەکرێنەوە) (بڕوانە: ل٧)، بەلأم هەندێك لەو نووسراوانەی دواتر تەنیا باسی (ان)یان کردووە.

لە لاپەڕە (٨)دا هەندێ مەشقی بۆ ڕاهێنان داناوە. لە لاپەڕە (٩)شدا لەژێر سەرباسی (اسم مصغر — بچوك کراو)دا چوار پاشگر (ڵە، ۆکە، وولکە، ۆچکە)ی دەست نیشان کردووە، کە دەوری بچووك کردنەوەی ناو دەبینین. بەلأم لە زمانی کوردیدا ژمارەیەکی تر پاشگر هەن کە بۆ بچووك کردنەوەی ناو بەکار دەهێنرێن و نووسەر ناوی نەبردوون، وەك: (یلە — ئەنگوستیلە،

وولە — مێشوولە، ۆڵە — کیژۆڵە، چکە — گوێچکە، لە — مێروولە، چە — باخچە، ۆڵە — بەرخۆلە، ۆڵ — ئاسکۆڵ، وو— پووشوو، یلکە— چاویلکە...).

لە لاپەڕە (١٠)شدا بە چەند دێڕێك لە ناوی سادە و ناسادە (کە ناوی ((تەنیا)) و ((تێکەڵ))ی ناو ناون) دواوە. لێرەدا مامۆستا سەعید صدقی نەك هەر هەڵەی زۆری کردووە، بەڵکو کەم و کورتیشی ئەوەیە کە دەربارەی ئەو پێشگر و پاشگرانەی ناوی داڕێژراو سازدەکەن نەکۆڵیوەتەوە، یاخود لەو حاڵەتانە نەدواوە کە ناوی لێکدراو پێك دێنن. بەم بۆنەیەوە پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشین، کە گەلێ باسی گرنگی دیکە، کە پەیوەندیان بە باسی ناوەوە هەیە یاداشت نەکراوون، بە وێنەوەك باسی :(ناوی مادی و ناوی مەعنەوی)،(ناوی کۆمەڵ)،(جنسەکانی ناو)،(نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی)... هتد.

لەنێو نیشانەکانی ئیزافەشدا کە پێوەندی زۆریان بەناوەوە هەیە، نووسەر تەنیا باسی (ی) کردووە و ناوی ئەوانی دی نەبردووە. سەرەڕای ئەوەش مامۆستا سەعید صدقی وەك هەموو ئەو زانایانەی تر کە لەسەر بنچینەی زمانی عەرەبی لە زمانی کوردیان کۆڵیوەتەوە لە هەر شوێنێکدا نیشانەی (ی)ی ئیزافەی بەشێکی جیاواز داناوە و بەپێی شوێن ناوی بۆ داناوە. بە وێنە لە باسی (مضاف و مضاف إلیة، ل ١٤ — ١٦)دا بە (ی)ی ئیزافەی ناوبردووە، کەچی لە باسی (صفت، ل ٢٥ — ٢٦)دا بە (ی)ی وەصفی داوەتە قەڵەم. جا لەبەر ئەوەی نیشانەی ناوبراو لە ڕووی دەور بینینەوە لە ڕستەدا لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەمان دەوری ڕێزمانی دەبینێ، کە ئەویش بە یەکەوە

بەستنی دیارخەر و دیارخراو لەگەڵ نیشاندانی پێوەندی نێوانیان، بۆیە پێویست ناکا بە نیشانەی جیاواز بدرێنە قەڵەم"[19].

مامۆستا وا تێگەیشتووە کە ئەگەر (مضاف) یاخود (موصوف) کۆتاییان بە دەنگی کۆنسۆنانت بێت، ئەوە(ی) وەردەگرن، بەڵام بێتو بە دەنگی بزوێن کۆتاییان بێت، ئەو دەمە(ی) یان پێوە دەلکێ.

هەڵەی نووسەر لە بەشی دووەم — واتە لە حاڵەتی کۆتایی بە بزوێن — دایە، ئەویش ئەوەیە کە لەم حاڵەتەدا نیشانەکە دەبێتە (ی — Y)، نەك (ی — i). تێکڕا ئەو چەند لاپەڕە کەمەی مامۆستا سەعید صدقی کابان لە بارەی (ناو)ەوە نووسیویێتی، لەگەڵ هەموو کەم و کورتی و ناتەواوییەکیدا وەك تەجروبەی یەکەم نرخ و بایەخی تایبەتی خۆی هەیە.

پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی مامۆستا سەعید صدقی کاباندا، کتێبی ((دەستووری زمانی کوردی))ی زانای گەورە و مەزنی کورد مامۆستا تۆفیق وەهبی لە چاپ درا"[20]. نووسەری ئەم کتێبە گەلێك فراوانتر لە نووسەری کتێبی ((مختصر صرف و نحوی کوردی))لە ناو کۆڵیوەتەوە.

لە سەرەتادا لە دابەشکردن و باسی پارچەکانی ئاخاوتندا تەعریفی هەموو پارچەکانی کردووە و لە پێناسەی ناودا نووسیویێتی: ((ناو کلمەیێکە کە بۆ ناونانی کەسێ یان شتێك بەکەڵك ئەهێنرێ، وەکو: خولە لە باخەکەدا

---

[19]— شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئەو ڕایەمان لە بەشی (ئیزافە)ی ئەم کتێبەدایە.

[20]— تەوفیق وەهبی ، دەستوری زمانی کوردی، جیزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩.

مارێکی کوشت. لەم جوملەیەدا (خولە) ناوی کەسێکە، (مار) ناوی شتێکە (گیاندارێك)، (باخ) ناوی شتێکە (جێ ییێك))) (بڕوانە: ل ١٦). دواتر — واتە لە لاپەڕە (٣١)ەوە کە هاتۆتە سەرباسی (ناو) بە هەمان پێناسە باسەکەی دەست پێ کردووە. بێگومان دیارە ئەم پێناسەیەی مامۆستا وەهبیش کەم و کورتی تێدایە، دوابەدوای ئەو پێناسەیەش لەژێر سەرباسی ((سیقەکانی ناو))دا لە ((ناوی تایبەتی))و ((ناوی هەمووـ ناوی گشتی — ئەوڕحمان))و((ناوی مەعنەوی))و((ناوی مەسدەر))و ((ناوی کۆمەڵ)) دواوە (بڕوانە: ل ٣١ — ٣٢). هەرچەندە لەم چەند باسەدا هەندێ ناتەواوی بەدی دەکرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە نیسبەت ئەو سەردەمە زۆر سەرکەوتووە.

پاشان مامۆستا هاتۆتە سەرباسی ((جینسی ناو)) و دوو جینسی (نێر) و (مێ)ی دەست نیشان کردووە. ناتەواوی ئەم بەشە لەوەدایە کە نووسەر هەستی بەوە نەکردووە کە لە زمانی کوردیدا جگە لەو دوو جنسە، ناو دوو جنسی دیکەشی هەیە، وەك: (ناوی دوولایەن) و (ناوی بێ لایەن)"[٢١]".

لە لاپەڕە (٣٣)وە لەژێر ناوی (ئەداتی تەعریف)دا کەوتۆتە لێکۆڵینەوەی (نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی). هەرچەندە ئەم باسەی مامۆستا وەهبی دەوروبەری پەنجا ساڵێك لەمەوبەر بووە، بەڵام لە زۆر ڕووەوە لە هەندێ لەو باسانەی ئەم ساڵانەی دوایی زانستییانەترو قوڵترە.."[٢٢] نووسەر گەلێك

---

[٢١]— بڕوانە ئەو باسەی لەم کتێبەدا دەربارەی جنسەکانی ناو کراوە.

[٢٢]— بەوێنە مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لە کتێبی ((ڕێزمانی کوردی))دا (بەغدا،١٩٧٦) و د. جەمال نەبەز لە کتێبی ((زمانی یەکگرتووی کوردی))دا (بامبێرگ، ١٩٧٦) نەك هەر بەشێوەیەکی ساکار لەو باسە دواون، بەڵکو هەڵەی زۆریشیان کردووە. بۆیە مادەم نووسەرانی ناوبراو توانستی ئەوەیان نەبووە بەرهەمێکی نوێ بێننە ئەنجام، باشتر وابوو بۆیان هەرئەوەی

لایـەنی ئـەو کێشـەیەی ڕوون کردۆتـەوە و وەسـتایانە تۆژیویەتـەوە. لـە سـەرەتادا پێناسـینێکی کـورتی کـردووە و ئنجـا دەوری نیشـانەکانی دەرخسـتووە. دوابـەدوای ئـەوەش لـە چـۆنیەتی لکانـدنیان بـە وشـەی جۆراوجۆرەوە دواوە.

شایەنی باسە مامۆستا تۆفیق وەهبی (ەکە)ی بە نیشانەی ناسیاوی و (ێك، یێ)ی بە نیشانەی نەناسیاوی دانـاوە و تـا بلێـی زانایانـە بـۆ ئـەم باسـە چووە. بێگومان، ئەم بەرهەمەی مامۆستا وەهبیش، وەك هەر کارێك بێ کـەم و کوورتی نییە، بەتایبەتی نووسراوێکی وا لە چاو ئەمڕۆدا دێرین. ئـەو کـەم و کورتییانـەش بـەزۆری لـە بەشـی چـۆنیەتی لکانـدنی نیشـانەکاندا بەرچـاو دەکەون. بە وێنە نووسەر وای داوەتە قەڵەم کە بزووێنی (وو) هەروەك دەنگە کۆنسۆنانتەکان (ەکە) وەردەگرێ، بەڵام لەڕاستیدا وا نییە و بەڵکو لـە نێـوان ووشە و نیشانەکەدا نیمچە بزوێنـی (و‒ W) پەیـدا دەبـێ، هـەروەها بزوێنـی (وو)ش هەندێ کورتتر لە زار دێتـە دەر... نووسـەر وای لێـك داوەتـەوە، ئـەو وشانەی کۆتایی یان بەبزوێنی (ا، یێ، ۆ) دێت، ئەگەر یەك برگـەیی بـن، وەك: (گا، دێ، دۆ)، ئەوە لە نێوان وشە و نیشانەکەدا نیمچە بزوێنـی (ی، Y) دێتـە کایەوە ‒ واتە دەبنـە (گایەکـە، دێ یەکـە، دۆیەکـە)، بـەڵام ئەگـەر وشـەکان دووبڕگـەیی بـن، وەك (کـابرا، هـەرمێ، پـەڕۆ)، ئەوسـاکە بزوێنـی(ە)ی سەرەتای(ەکە) تیادەچێ ‒ واتە دەبنە (کابراکە، هەرمێ کـە، پەڕۆکـە). مـن

---

مامۆستا وەهبی دووپات بکەنەوە. دەتوانم بەوپەڕی دڵنیاییـەوە بڵـێم مامۆسـتایانی نـاوبراو لـە باسی ئەو کێشەیەدا نەك لێکۆڵینەوەیەکی پەنجا ساڵ لەوەوبەریان لە کـەو نـەداوە و گەشـەیان پێ نەکردووە و پێشیان نەخستووە، بەڵکو شێواندوویشیانە و پەردەیان بەسەردا داوە و بـەرەو دواوەیان گێڕاوەتەوە. بێگومان شتی وایش لە زانستدا ڕەوا نییە.

لەو ڕایەدام کە لە هەڵکەوتی زمانی کوردیدا ئەمە وا نییە و بڕگە لێرەدا دەور نابینێ، بەڵکو ڕاستی ئەوەیە کە بێ کارتێکردنی بڕگە هەردوو بارەکە — واتە پەیدابوونی نیمچە بزوێن یاخود تیاچوونی بزوێن — دەبینرێ، وەك:

**گا — گاکە — گایەکە**

**کابرا — کابراکە — کابرایەکە**

**دێ — دێ کە — دێ یەکە**

**هەرمێ — هەرمێ کە — هەمێ یەکە**

**دۆ — دۆکە — دۆیەکە**

**پەڕۆ — پەڕۆکە — پەڕۆیەکە**

بۆ تەواو سەلماندنی ئەو وشانەمان، ئەگەر ئاوڕێك لە ئەدەبی کوردی بدەینەوە، ئەوە گەلێك وشەی یەك بڕگەیی دەبینین کە بێ یاریدەی نیمچە بزوێنی (ی — Y)، نیشانەی (ەکە)ی ناسیاوییان پێوە لکاوە، وەك:

**ئەوا ئەمڕۆشمان تێ پەڕان**

**بچینەوە بۆ دێ کەمان**

**(بێکەس، ل ١٣٤)**

بە پێچەوانەشەوە، گەلێك وشەی دوو بڕگەیی پێش چاو کە بە یاریدەی نیمچە بزوێنی (ی — Y)یەوە نیشانەی (ەکە)ی ناسیاوییان وەرگرتووە.

دوای لێکۆڵینەوە لە نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی، مامۆستا هاتۆتە سەرباسی (تاك و کۆ). نووسەر لەم بەشەدا هەندێ زانیاری باشی

تۆمارکردووە. کەم و کورتی ئەم بەشەش، ئەوەیە کە لە هەندێ شوێندا بە هەڵە چوون و باس نەکردن ڕووی داوە. بە وێنە نووسەر دەڵێ: ((بۆ گەل کردنەوەی ناوێ ئەبێ ئەداتی تەعریفی مەعیەنی لەگەڵ بێ...)) (بڕوانە:ل ٣٨). لەو ڕایەدام کە لە زمانی کوردیدا بە ئاسانی دەکرێ ناو کۆبکرێتەوە و نیشانەی ناسیاویشی لەگەڵ نەبێ، وەك: (پیاو — پیاوان ((پیاوان بەرەو گۆڕستان کەوتنەڕێ)))، (ژن — ژنان ((ژنان لە ماڵەوە قوڕیان دەپێوا)))، (منداڵ — منداڵان ((منداڵان لە کۆڵانیان یاری دەکەن)))... هەروەها هەڵدانەوەی بەرهەمی ئەدەبی کوردی ئەو ڕایەی ئێمە دەچەسپێنێ و ڕای مامۆستا وەهبی ڕەت دەکاتەوە، ئەویش لەبەرئەوەی سەدان نموونە دەبینرێن کە (ان)ی کۆ بێ یاریدەی نیشانەی ناسیاوی، کۆی سازکردووە، وەك:

**لە دوگمەی سوخمەی دوێنێ نوێژی شێوان**

**بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان**

**(نالی، ل ٣٢٠)**

**سەرئەوان و سەر هەموو یارانی پێغەمبەر، خودا**

**داڕژێ ڕەحمەت هەموو دەم پڕ زەمین و پڕ فەلەك**

**(مەحوی، ل ١٩٦)**

**ئەگەر لە جافان یەکێك بمێنێ، حەقی بەرودوا لە گشت ئەستێنێ.**

**(پەندی پێشینان، ل ٣٦)**

یاخود دەڵێ: ((ئەگەر دوا دەنگی ناو کۆتایی بە بزوێنی (وو) بێت، ئەوە لە کۆکردنەوەدا، ڕاستەوخۆ نیشانەی (ان)ی پێوە دەلکێنرێ...)) (بڕوانە:

ل٣٩). لە هەڵکەوتی زمانی کوردیدا بەو چەشنە نییە کە مامۆستا وەهبی وتوویە، بەڵکو ڕاستی ئەوەیە کە لە نێوان ناو و نیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (و — W) دێتە کایەوە، هەروەها بزوێنی (وو)ی کۆتایی ناوەکە کەمێك لەباری ئاسایی کورتتر دەوترێت... نووسەر لەوە دواوە کە ئەگەر ناو کۆتایی بەدەنگی بزوێنی (وو) و (ە) بێت و نیشانەی (ان)ی کۆی پێوە بلکێنرێ چی گۆڕانێکی فۆنەتیکی ڕوودەدات، کەچی باسی ئەوەی نەکردووە کە ئەگەر ناو کۆتایی بەبزوێنی (ا، ۆ، ێ، ی) هاتبێت لە حاڵەتی کۆکردنەوەیاندا چی ڕوودانێك دەبێ...

لە هەندی بەندی باسی ((وەزیفەی ناو))دا (ل ١٨— ٢٠ — ٢١، ٤٥ — ٤٧) کەمێك لە نیشانەی (ی)ی ئیزافە دواوە. ناتەواوی ئەم باسەی نووسەر تەنیا ئەوە نییە کە لە نێو نیشانەکانی ئیزافەدا تەنیا باسی (ی)ی کردووە، بەڵکو ئەوەشە کە بە ئامرازی لە قەڵەم داوە و لەگەڵ ئامرازی پێوەندی جیای نەکردۆتەوە.

دوای ئەمە نووسەر هاتۆتە سەر باسی ڕۆنانی ناو (بڕوانە: ل ٥٠ — ٥٨). شایەنی باسە کە مامۆستا وەهبی بۆ یەکەم جار لە زمانی کوردیدا بە ڕێك و پێکی جیاوازی لە نێوان ناوی داڕێژراو و لێکدراودا داناوە"[٢٣]"، کەچی بەداخەوە بەشێکی زۆر لە زمانناسانی کورد ئەو دوو جۆرە وشەیەیان تێکەڵ بەیەکتر کردووە"[٢٤]". بەم چەشنە مامۆستا وەهبی لە سەرەتاوە ئەم باسەی لەسەر بناغەیەکی ڕاست و گونجاو دامەزراندووە. دەربارەی ناوی داڕێژراو

---

[٢٣]- مامۆستا تۆفیق وەهبی ((ناوی دروست کراو)) و ((ناوی لێکدراوی)) داناوە.

[٢٤]- بۆ زانستی زیاتر لەم بارەوە، بڕوانە: د.ئەورحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٣ — ٢٠.

ئەوەی دەست نیشان کردووە کە لە ئاوەڵناو و ناو و کردار بە یاریدەی هەندێ پاشگر ساز دەبێ و، ژمارەیەك پاشگری تۆمار کردووە کە ئەو دەورە دەبینن. سەبارەت بەناوی لێکدراویش، گەلێك لەو حاڵەتانەی یاداشت کردووە، کە لە زمانی کوردیدا وشەی لێکدراو ڕۆدەنێن... کەم وکورتی ئەم چەند لاپەڕەیەی نووسەر بە تایبەتی لەوەدایە کە ژمارەیەکی زۆری ئەو پاشگرانەی یاریدەی ڕۆنانی ناوی داڕێژراو دەدەن لە یاد کردووە، هەندێ پێشگریش هەن کە هەمان دەور دەبینن، کەچی نووسەر بەهیچ جۆرێك ناوی نەبردوون. نووسەر بۆ ئەوە نەچووە کەناوی داڕێژراو، جگە لە ئاوەڵناو و ناو و کردار، هەروەها لە ئاوەڵکرداریش دروست دەبن، وەك ((پێش+ ین = پێشین))، ((بن+ار= بنار))،(پێش+ ەوا = پێشەوا))... بۆ جۆرەکانی وشەی لێکدراویش گەلێ حاڵەتی ئاشکراو دیاری بەبیردا نەهاتووە...

دوا بەشی باسی ناو لە کتێبی نابراودا، بەناوی ((ناوی بچووك کراو))ەوەیە (بڕوانە:ل ٥٩ — ٦٠). لەم شوێنەدا باسی هەندێ لەو پاشگرانە کراوە کە ناو بچووك دەکەنەوە. لیرەشدا بەداخەوە بەشی هەرە زۆری ئەو جۆرە پاشگرانە یاداشت نەکراون.

ئەو جۆرە کەم و کورتیانە و هەندێکی دیکە لە نووسراوی ناوبراودا بەدی دەکرێن. بێگومان، ئەمانە بایەخی کاری ئەم شاسوارەی زماننासی کوردی کەم ناکەنەوە، جگە لەوە کە ئەم بەرهەمە نزیکەی پەنجا ساڵێك لەمەوبەر بڵاوکراوەتەوە، ئینجا ڕووە باشەکەی هەموو ناتەواوییەکی شاردۆتەوە.

مامۆستا نوری عەلی ئەمین بە بەرهەمە بەهادارەکانی خزمەتێکی گەورەی زمانی کوردی کردووە. لەو کتێبەدا بەناوی ((ڕێزمانی کوردی))یەوە بڵاوی

کردۆتەوە"[٢٥]" لە (ناو) دواوە"[٢٦]" (بڕوانە : ل ٦٣ — ٨٣). ئەمیش وەك نووسەرانی پێشوو باسی ناوی بە پێناسەیەك دەست پێ کردوە، کە دەڵێ: ((ناو وشەیەکە بۆ ناونانی کەسێ یان شتێ بەکار ئەهێنرێ، بەبێ ئەوەی کە سەیری تافی تیا بکرێ، وەك: شاسوار، گەلاوێژ، هەڵووژە،بەراز، دهۆك)) (بڕوانە: ل ٦٣). جیاوازی ئەم پێناسەیە لەگەڵ ئەوەی مامۆستا تۆفیق وەهبی تەنیا ئەو زیادیەیە کە نیشانەی بێ پێوەندێتی ناو لەگەڵ کاتدا دەدات.

پاش پێناسەی ناو نووسەر ناوی بەسەر سادەو لێکدراودا دابەش کردووە و لێی دواوە. وا چەند کەم و کورپییەکی ئەم بەشە دەخەینە ڕوو: نووسەر ناوی داڕێژراو و لێکدراوی وەك یەك تەماشا کردووە و لە یەکتری جیانەکردونەتەوە. بەوێنە، هەندێك ناوی داڕێژراوی بەلێکدراو داناوە، وەك: ((ئاسنگەر، نانەوا، پرسیار، بڕیار...)). ئەو وشانەی لە ڕیزی ناوەی لێکدراودا باس کردووە (بڕوانە: ل ٦٣).

لە دیاری کردنی بار و دەوری هەندێ پاشگردا ناتەواوی دەبینرێ، بە وێنە دەربارەی پاشگری (ی، ەتی، ێتی، ایەتی، ایی)، دەڵێ: ئەو پاشگرانە ((ناوی مەعنەوی لە ناو پێ دروست ئەکرێ)) (بڕوانە: ل ٧٧). ڕاستە ئەو پاشگرانە ناوی واتا لە ناو دروست دەکەن، بەڵام نووسەر بۆ ئەوە نەچووە کە

---

[٢٥] - نوری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠.

[٢٦] - نووسەری ناوبراو لە کتێبی ((قواعدی زمانی کوردی))یشدا، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٦، ل ٤٢ — ٦٠ ، بەرگی دووەم، بەغدا ١٩٥٨، ل ٤٨ — ٥٨ لە ناوی کۆڵیوەتەوە. هەرچەندە لەبەشی ناوی کتێبەکانی مامۆستا نوری عەلی ئەمیندا هەندێ جیاوازی دەبینرێ، بەڵام کاکڵ و کەرەستەیان یەکە. جا لەبەرئەوە تەنیا لەیەکێکیان دەدوێین.

هەندێکیان دەچنە سەر ئاوەڵناویش و ناوی لێ دروست دەکەن، وەك: ((بڵندی، سپێتی، بەرزایەتی، ڕەشایی...هتد)). کەم و کورتییەکی دیکە لە دیاریکردنی ئەم پاشگرانەدا، ئەوەیە کە (ی) و (یی)، بە دوو پاشگر داناوە و وشەی ((ئاشەوانی)) و ((ساوایی)) بە نموونە بۆ هێناونەتەوە، بەڵام مامۆستا لەمەدا بە هەڵە چووە و یەك پاشگرن، کە ئەویش (ی)یە. حاڵەتی دووەمیان ئەوەیە کە بەپێی دەستووری فۆنەتیکی کوردی نیمچە بزوێنێك لە نێوان دوو بزوێندا پەیدابووە... هەروەها مامۆستا (ەتی – پیاوەتی)و (یەتی – نانەوایەتی)یشی بە دوو پاشگر داوەتە قەڵەم. لێرەشدا نووسەر بە هەڵە چووە و ئەوانیش هەر یەك پاشگرن و ئەویش(ەتی)یە... (بڕوانە: ل ٧٧).

هەرچەندە نووسەر زۆربەی زۆری ئەو پاشگرانەی یاداشت کردووە کە ناوی داڕێژراو ساز دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی لەیاد کردووە، جگە لەوە بۆ ئەوەش نەچووە کە پاشگری (ین)و (ار)و (ەوا) دەتوانن بچنە سەر ئاوەڵکردار و ناوی لێ پێك بێنن. هەروەها هەندی حاڵەتی پەیدابوونی ناوی لێکدراویشی تۆمار نەکردووە. ئەمانە و هەندێ تاتەواوی تر لەم بەشەدا بەدی دەکرێن. پێویستە ئەوەش لەیاد نەکەین، کە ئەو هەموو پێشگر و پاشگرانەی مامۆستا نوری عەلی ئەمین لێرەدا تۆماری کردوون و لێیان دواوە، ئەمڕۆ لە مەسەلەی وشەڕۆنانی زمانی کوردیدا کەرەستەیەکی کەم هاوتان و هێشتا زماناسانی کورد شتێکی ئەوتۆیان لێ زیاد نەکردوە.

لە لاپەڕە (٦٤)دا لە ژێرناوی (ئامراز)دا باسی هەندێك لەو ئینتەرفیکسانەی کردووە، کە لە ڕۆنانی ناودا هاریکاری دەکەن، وەك: (ە، و،

ەو، او، ان). لەم بەشەشدا جگە لەوەی هەڵە لە هێنانەوەی هەندێ نموونەدا دەبینرێ، هەروەها ئینتەرفیکسی (بە)ش یاداشت نەکراوە.

بە دوای ئەو باسانەدا ئینجا لەبارەی (ناوی تایبەتی) و (ناوی گشتی) و (ناوی مادی) و (ناوی مەعنەوی) و (ناوی کۆمەڵ) دواوە و پێناسەی بۆ داناون و شەرحی کردوون و نموونەی بۆ هێناونەتەوە (بڕوانە: ل ٦٥ — ٦٦). ئەم بەشە تێکڕا زانستییانە سەرکەوتووە و تەنیا کەمێ ناتەواوی لە هەندێ پێناسە و نموونەدا بەرچاو دەکەون.

کاتێ نووسەر هاتۆتە سەر باسی (جینسەکانی ناو) (بڕوانە: ل ٦٦ — ٦٨)، سێ جنسی دیاری کردووە: ناوی نێر، ناوی مێ، ناوی بێ لایەن. هەرچەندە لەم باسەدا ناوی دوولایەنی وەك جنسێکی سەربەخۆ دانەناوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە لە یادی نەکردووە و لە باسی (ناوی مێ)دا لێی دواوە. بە تایبەتی لەم بەشەدا مامۆستا نوری عەلی ئەمین هەندێ زانیاری نوێی وای تۆمار کردووە کە نووسەرانی پێش خۆی دەرکیان پێ نەکردووە.

بە ناوی (ئامرازی پێناس)ەوە لە لاپەڕە (٦٨ — ٧٠)دا چاومان بە باسی نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی دەکەوێ. لە سەرەتادا بەناوی (ئامرازی نەشوناس)ەوە لە نیشانەی نەناسیاوی دواوە و دەڵێ: ((ئەم پیتە پاشگرانە (ێ، ێك، یەك) ئەگەر خرانە دوا ناوێکی سادە یا لێکدراوەوە، لە وێنەیەکی نەشوناسدا، ئەیکەن بە ناسیاو...)) (بڕوانە: ل ٦٨)و بە ناوی ئامرازی شوناس)ەوە باسی نیشانەی ناسیاوی کردووە و نووسیویێتی: ((ئەم پیتە پاشگرانەن (کە، ەکە) ئەگەر خرانە دوا ناوێکی سادە یا لێکدراوەوە لە

وێنەیەکی شوناسدا، ئەیکەن بە ناسیاو)) (بروانە: ل ٦٩). سەرەڕای ئەوەش لە چۆنیەتی لکاندنیان دواوە.

ناتەواوی و کەم و کورتی ئەم باسەی نووسەر بەر لە هەموو شتێك لەوەدایە کە سێ نیشانەی (یێ، ێك، یەك)ی بۆ نەناسیاوی داناوە، کە خۆی لە ڕەسەندا هەر (ێك)ە و گۆڕانی بەسەردا هاتووە، دوو نیشانەی (کە، ەکە)شی بۆ ناسیاوی دیاری کردووە، بەڵام لە بناغەدا هەر (ەکە)یە و لە هەندێ وشەدا باری دەنگەکان کاریان تێ کردووە.

لە دیاریکردنی دەوری نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاویدا هەندێ تەم و مژ بەسەر نووسینەکەیەوە هەیە. کاتێك لە نیشانەی نەناسیاوی دەدوێ، دەڵێ: ((ناو لە وێنەیەکی نەشوناسدا ئەکەن بە ناسیاو)) — واتە مەبەستی ئەوەیە کە نیشانەی نەناسیاوی ناو لە باری نەناسراوییەوە دەکاتە ناسراو. لێرەدا نووسەر بە هەڵەدا چووە، دەوری نیشانەی (ێك) ئەوەیە کە ناوێك یا ئاوەڵناوێك بکاتە نەناسیاو، نەك ناسیاو. جگە لەوەش تاکایەتی (افرادیە) نیشان دەدات.

لە چۆنیەتی لکاندنیشیاندا بە تەواوی باری جۆراوجۆریانی دەست نیشان نەکردووە و هەندێ حاڵەتی گرنگی لە بیرچووە. بە وێنە بۆ ئەوە چووە کە وشەیەك کۆتایی بە بزوێنی (ا، ۆ) بێت، ئەوە (کە)ی بۆ بەکاردەهێنرێ (ڕاستتر ((ە))ی سەرەتای ((ەکە))تێ دەچێ — ئەوڕەحمان)، کەچی ئەوەی لە یادکردووە کە هەندێ جار نیمچە بزوێنی (ی — Y) پەیدا دەبێ، وەك:

**چرا – چراکە – چرایەکە**

**برا – براکە – برایەکە**

**چەقۆ – چەقۆکە – چەقۆیەکە**

**پەڕۆ – پەڕۆکە – پەڕۆیەکە**

یاخود نووسەر ئەوەی باس نەکردووە کە ئەگەر (ەکە) بە وشەیەکەوە لکێنرا، کە کۆتایی بە بزوێنی (وو، یٚ، ی) هاتبێت، چ گۆڕانێك ڕوودەدات.

سەرەڕای ئەوانەی سەرەوە لێیان دواوین، (ە)ش وەك نیشانەی ناسیاوی ناونەبردووە و باسی نەکردووە.

لەژێر سەرباسی (ژمارەی ناو)دا لە تاك و کۆ دواوە (بڕوانە: ل ٧٠ – ٧٢) و نیشانی داوە کە نیشانەی (ان)ی کۆ دوای دەنگە کۆنسۆنانتەکان و هەندێ دەنگی بزوێن چۆن خۆی دەنوێنێ. ناتەواوی گەورەی ئەم بەشە لەوەدایە کە وای داناوە ئەگەر ناوێك ((کۆتایی بە پیتە بزوێنی (أ، یٚ، ۆ، ی) هاتبوو، ئامرازی (یان) ئەلکێنرێ بە دوایەکەیەوە)) (بڕوانە: ل (٧١). لە ڕاستیدا (یان) نیشانەیەکی سەربەخۆ نییە. ئەو (ی – y)یە نیمچە بزوێنێکە و لە نێوان دوو بزوێندا پەیدا بووە. بەم چەشنە دەبینین کە نیشانەکە هەر (ان)ە. کەم وکورتییەکی دیکەی ئەم باسە لەوەدایە، کە نووسەر لەوە نەدواوە، ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (وو) بێت، لە حاڵەتی لکاندنی (ان)ی کۆدا چی ڕوودەدات. هەروەها هەندێ حاڵەتی دیکە هەن، کە لە کوردیدا کۆ نیشان دەدەن و مامۆستا باسی نەکردوون.

لە کۆتایی بەشی ناودا لە (ئەرکی ناو لە ڕستەدا) دواوە و هەشت ئەرکی بۆ دیاری کردووە (بڕوانە: ل ٧٩).

ئەوەی پێوەندیشی بە کێشەی ئیزافە و نیشانەکانی ئیزافەوە بێت، تەنیا ئەو چەند دێڕەیە کە لە لاپەڕە (٢٠٠ — ٢٠١)دا دەربارەی (ی) نووسیویێتی. سەرەڕای کورتی باس، ناتەواوی گەورەش ئەوەیە کە نیشانەی ناوبراوی بە پریپۆزیشن داناوە و لە تەک ئەواندا باسی کردووە. ناتەواوییەکی تری دیاری ئەو باسە لەوەدایە کە لەنێو نیشانەکانی ئیزافەدا هەر ناوی (ی) هێناوە.

بەلاّم لەگەڵ ئەم کەم و کورتیانەشدا، ڕاست وایە، پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە نووسراوەکانی مامۆستا نووری عەلی ئەمین تاکو ئەمڕۆ نرخ و بایەخیان بەردەوامە و هێشتا هەر لە ڕیزی پێشەوەن.

لە باسی ناوی کتێبی ((ڕێزمانا زمانێ کورمانجی))ی مامۆستا ڕەشید کورددا"[٢٧]" ئەو سەرباسانەی خوارەوە دەبینرێن: ((ناڤ — الاسم))(ل ٢٤ — ٢٥)، ((ناڤێن بەرناس — اسم العلم)) (ل ٢٥ — ٢٦)، ((ناڤێن جەلەب — اسم الجنس)) (ل ٢٦ — ٢٨)، ((ناڤێ ئوس — اسم المكان)) (ل ٢٨ — ٣١)، ((ناڤێ ئالاڤ — اسم الالة)) (ل ٣١ — ٣٢) ((ناڤێ دومل — الاسم المركب)) (ل ٣٣)، ((ناڤێن بچوك كەر — اسم التصغير)) (ل ٣٤)...

بەمەدا بۆمان دەرکەوت کە نووسەری ناوبراو تا ڕادەیەك لە کێشە سەرەکییەکانی ناو دواوە. هەرچی ڕادەی زانستی کارەکەشە، هەرچەندە لە هەندێ شوێندا ساکاری و هەڵە و ناتەواوی تێدا دەبینرێ، بەلاّم بە نیسبەت ئەو دەمەوە، سەرکەوتووە و تەنانەت لە گەلێك لێکۆڵینەوەی ئەم ساڵانەی

---

[٢٧] - ڕەشید کورد، ڕێزمانێ کورمانجی، چاپخانەیا کەرەم، شام، ١٩٥٦.

دوایی کە لەلایەن نووسەرەکانی دیکەی کرمانجی ژوورووەوە کراون ڕێك و پێکتر و پوختترە.

لە تەماشاکردنێکی سەرپێیی باسی ناوی کتێبی ((اوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی))ی مامۆستا جگەرخوێن دا[٢٨]، سەرەڕای ناتەواوی و هەڵەیەکی زۆر، تێکەڵ کردنێکی نەشارەزایانە بەرچاو دەکەوێ.

نووسەر کاتێ لە جۆرەکانی ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە دواوە، نەك تەنیا داڕێژراو و لێکدراوی جیا نەکردۆتەوە، بەڵکو هەندێ ناوی داڕێژراویشی لە ڕیزی سادە داناوە. لەو هەموو پاشگرانەی یاریدەی ڕۆنانی ناوی داڕێژراو دەدەن و ئەو هەموو حاڵەتانەی ناوی لێکدراو ساز دەکەن تەنیا لە بەشێکی ئیجگار کەمیان دواوە (بڕوانە ل ١٥ — ١٦). هەڵەو تێکەڵ کردنی زۆر بە تایبەتی لە باسی ناوی کۆدا بەرچاو دەکەوێ (بڕوانە: ل ١٧ — ١٩).

نووسەر (ان، أن، أێن، أێت، أێد، گەل)ی بە نیشانەی کۆ داناوە و ((سواران، سوارن، سوارێن، سوارێت سوارێن...))ی. بە نموونە بۆ هێناونەتەوە. جگە لە (گەل) لە تێکڕای ئەوانی دیکەدا مامۆستا جگەر خوێن بە هەڵە چووە، چونکە بەر لە هەموو شتێك ئەو نیشانانە (ان، أێن، أێت، أێد...) نین بەڵکو (ان، ن، ێن، ێت، ێد...)ن. ئینجا دەبێ ئەوە بڵێین کە لەو کۆمەڵەشدا تەنیا (ان) نیشانەی ڕاستەقینەی کۆی ناوە. هەرچی (ن)ە جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی کۆیە، ئەوانی تریش — واتە (ێن، ێت، ێد) نیشانەی ئیزافەن لە حاڵەتی کۆدا.

---

[٢٨] - جگر خوین، اوائو دەستوورا زمانێ کوردی، بەغدا، ١٩٦١، ل ١٣ — ٣٢.

لە کۆتایی باسی کۆی کتێبی ناوبراودا، دوو هەڵەی دیکەش دێتە پێش چاو:

١- نووسەر وای داوەتە قەڵەم کە نیشانەی (گەل) تەنیا لە وڵاتی ئەردەڵاندا بۆ کۆ بەکاردێ.

٢- مامۆستا جگەرخوێن وا تێگەیشتووە کە نیشانەی (ات) لە زمانی فارسییەوە وەرگیراوە"[٢٩].

دوابەدوای ناوی کۆ بەشێوەی سادە و پڕ هەڵە دەربارەی ناوی کات و ناوی جێگە و ناوی ئامێر و ناوی بچووککراوە دواوە (بڕوانە: ل ٢١ – ٢٤)و ئینجا هاتۆتە سەر جنسەکانی ناو. لێرەدا سێ جنس (نێر، مێ، دوولایەن)ی دەست نیشان کردووە و لە (ا)ی نیشانەی جنسی مێ و (ێ)ی نیشانەی جنسی نێر دواوە.

لە کۆتایی بەشی ناودا لە دوو کێشەی (صفة و موصوف) و (مضاف و مضاف إلية) دواوە. سەرەڕایی هەڵەیەکی زۆر سانایی، ناتەواوی لەوەشدایە کە تەنیا ناوی دوو نیشانەی (ا) و (ێ)ی بردووە و بیری بۆ ئەوانی تر نەچووە.

ئەو چەند لاپەڕە سادە و ساکارەی مامۆستا جگەرخوێن لە بارەی ناوەوە نووسیوێتی پڕهەڵە و ناتەواوی و کەم و کورتین.

مامۆستا محمد ئەمین هەورامانی لە کتێبی ((سەرەتایەك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی))دا"[٣٠]" لە هەندێ کێشەی ناو دواوە. ئەمیش وەك نووسەرانی

---

[٢٩]- دواتر لەو دوو خاڵە دەدوێین.

[٣٠]- محەمەد ئەمین هەورامانی، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٣.

دیکە باسەکەی بە پێناسەی ناو دامەزراندوە و دەڵێ: ((... بەلای منەوە، ناو، یاوشەیەکە یاخود زیاترە لە وشەیەك، هیچ کاتی تێدا نییە و سەربەخۆ واتادارە، وەك ئەم نموونانەی خوارەوە: ١- کامەران، دێ، بانی خێلان، سەرسەنگ. ٢- منداڵ، کچان، گەل، کرێکاران. ٣- ڕووبار، دارگوێز، شێر، خوێ. ٤- برسێتی، ئازایەتی، هێز، ترس)) (بڕوانە: ل ١٤٠). بەڕای من ئەم پێناسەیە، نەك هەر ناتەواوە، بەڵکو هەڵەی گەورەشی تێدایە. بەر لە هەموو شتێك ڕەخنە لە بەندی یەکەمی پێناسەکە دەگرین، کە دەڵێ ((... ناو یا وشەیە یاخود زیاترە لە وشەیەك)). کەچی تێکڕای نموونەکانی لە وشەیەك زیاتر نین. ڕاستە نموونەکانی نووسەر وشەی سادە و داڕێژراو و لێکدراویان تێدایە، ئاشکراشە کە وشەی داڕێژراو لە وشەیەك و زیادییەك پێك دێ، وە وشەی لێکدراو بەلایەنی کەمەوە لە دوو وشەی واتادار دروست دەبێ، بەلام لە ئەنجامدا دەبنە وشەیەك نەك پتر. با پێکهاتنی ئەو جۆرە وشانە بەو چەشنەبێ، بەلام هەڵەیە بەو جۆرەی مامۆستا هەورامانی ناو ببڕێن. ڕاستتر وابوو بڵێ، ناو یا وشەیەکی سادەیە یاخود ناسادەیە.. چونکە کە وترا لە وشەیەك زیاتر، ئەو دەمە سەرنج بۆ ئەوە دەچێ کە مەبەست لە دەستەواژەیەك یاخود ڕستۆکەیەك بێت.

ناتەواوی ئەوەش کە نووسەر ناو بە وشەیەك دادەنێ کە ((هیچ کاتێ تێدانییە و سەربەخۆ مانادارە)) لەوەدایە، کە جگە لە (ناو)، هەروەها (جێناو، ئاوەڵناو، ژمارە، چاوگ)یش سەربەخۆ واتا دەگەیەنن و بە کاتەوە نەبەستراون. بەم جۆرە ئەو پێناسەیەی مامۆستا هەورامانی بۆ ناو دایناوە،

ئەو پارچانەی دیکەشی ئاخاوتن کە لە سەرەوە ناومان بردن دەگرێتەوە و بەو پێیە هیچ جیاوازیەك لە نێوانیاندا نابێ "[٣١]".

دوابەدوای ئەو پێناسە، لە ڕووی پێکهاتنەوە (کە ئەو ناوی ناوە ((لەڕووی قەوارەوە))) دوو جۆر ناوی دیاری کردوە: ١- ناوی سادە (کە ئەو زاراوەی ((ساکار))ی بۆ داناوە) و ٢- ناوی لێکدراو. ئەو پێناسەی بۆ (ناوی سادە)ی داناوە تا ڕادەیەك لەبار و گونجاوە، بەڵام بە داخەوە پێناسەی (ناوی لێکدراو) زۆر ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەڵ و پڕ هەڵەیە (بڕوانە: ل ١٤١). هەڵەی هەرە بەرچاویشی، ئەوەیە کە نووسەر وای داوەتە قەڵەم، کە گوایا لە پێکهاتنی وشەی لێکدراودا هەمیشە دەبێ ناوێك سەرەبێ... نووسەر هەستی بەوە نەکردووە کە لە زمانی کوردیدا ناوی لێکدراوی وا هەن کە لە پارچەکانیاندا نەك هەر وەك سەرە، بەڵکو بە هیچ جۆرێك ناویان تێدا نییە، وەك: ((**هات** و چۆ، مشت و ماڵ، گفتوگۆ...))، کە لە دوو ڕەگی کردار، بە یارمەتی ئینتەرفیکسی (و) پەیدابوون "[٣٢]"، هەروەها ((بنکڕ)) کە لە ئاوەڵکردار و ڕەگی کردار دروست بووە... **هتد**"[٣٣]".

ئەو نموونانەی کە نووسەر بۆ ناوی لێکدراوی هێناونەتەوە و ئەو جۆرە ناوە لێکدراوانەی یادداشتی کردوون، بەداخەوە ناتەواویان زۆر تێدایە،

---

[٣١] - بۆ تەواو ڕوونکردنەوەی ئەو باسە و ڕەتکردنەوەی ئەو ڕایە، بڕوانە: ئەو ڕەخنەیەی لە لاپەڕە (٤٢ — ٤٣) دا لە لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ گیراوە.

[٣٢] - بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو لە بارەی ئەو جۆرە پێکهاتنەوە، بڕوانە: د.ئەورحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، بەغدا،١٩٧٧، ل ٨٥ — ٨٦.

[٣٣] - بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٨٦

ئەویش بەتایبەتی لەوەدایە کە گەلێك پێکهاتنی گرنگ و دیار و ئاشکرای ناو نەهێناوە."[34]

وەك لە سەرەوە وتمان، مامۆستا هەورامانی لە ڕووی پێکهاتنەوە، دوو جۆرە ناوی دەستنیشان کردووە، کە ئەویش (سادە و لێکدراو)ە. (بڕوانە: ل ١٤٠ — ١٤٢)، هەرچی ناوی داڕێژراوە نە کەوتۆتە بەرئەم دابەش کردنەوە و نە ناوی هێنراوە... بەلاَم ئەوەی سەرنج ڕابکێشێ ئەوەیە کە پاش تێکڕای باسەکانی دیکەی ناو، نووسەر بێ هیچ موناسەبەیەك لەژێر سەرباسی ((ناوی داتاشراو(یاخود دروست کراو)دا)) (بڕوانە: ل ١٥١ — ١٥٥) لە ناوی داڕێژراو دواوە.

بەر لە هەموو شتێك پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین، کە (ناوی داڕێژراو)یش بەشێکی ناوە لە ڕووی پێکهاتنەوە، لەبەر ئەوە دەبوو نووسەر لە دابەش کردنەکەیدا ئەمیشی لەبیرنەکردایە و لەتەك ناوی سادەو لێکدراودا دای بنایە و باسی بکردایە.

لە تەماشاکردنێکی سەرپێیی ئەم باسەی کتێبی ناوبراودا هەندێ کەم و کورتی بەرچاو دەکەوێ:

لە بەشی ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و دەیکەنە ناوی داڕێژراو، کە ئەو لەژێر سەرباسی (دروست کردنی ناو لە ئاوەڵناو)دا لێی دواوە (بڕوانە: ل ١٥١)، تەنیا ناوی چوار پاشگری هێناوە (ی، ەتی، ایی، ە). جگە لەو چوار پاشگرە ژمارەیەك پاشگری دیکەش هەن، وەك: (ێتی،

---

[34] - بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٨٤ — ٨٦.

ایــەتی، لاَن/ەلاَن، ێنــە، کــە، ك، ik –، ان، انــە، ەن، ەك، یــن، نــدە، ەمەنی...)و دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و دەیکەنە ناوی داڕێـژراو..."[35]"، کەچـی، بەداخـەوە نووسـەر نـاوی نـەبردوون. ئەگـەر ئاوڕێـك لـە نامیلکـەی ((گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی))ی"[36]" مامۆستا نـوری عـەلی ئـەمین بدەینەوە، زۆربەی ئەو پاشگرانە دەبینینکە ناومان بردن... دەبـوو مامۆسـتا هەورامانی لایەکی لەو نووسراوە بکردایەوە، کە (١٥) ساڵێك بەر لەوەی خـۆی بلاّوکراوەتەوە.

کــەم و کورتیــەکی دیکــەی زەقــی ئــەو چــەند دێــڕەی نووســەر ئەوەیەکە(ی)و(یی) بە دوو پاشگر داناوە، وە پاشگری (ەتی)شی بـە (یـەتی) نـاوبردوە. وشـەی ((ڕەشـی)) بـۆ (ی)، وە ((ئـازایی)) بـو (یی)بەنموونـە هێناوەتەوە. بێگومان مامۆسـتا لەمـەدا بەهەڵـە چووە و یـەك پاشـگرن، کـە ئەویش(ی)یە. حاڵەتی دووەمیـان ئەوەیـە کـە بـەپێی دەسـتووری فۆنـەتیکی کوردی نیمچە بزوێنێك لە نێوان دوو بزوێندا پەیدا بووە... هەروەها لە وشەی ((ئازایەتی))شدا نووسەر بە هەڵە چووە و پاشـگرەکە(ەتی)یە، نـەك (یـەتی) واتە لێرەشدا نیمچە بزوێنی (ی – y) هاتۆتە کایەوە.

لە بەشی (أ)ی خاڵی دووەمی هەمان باسدا کە بە ناوی ((دروسـت کردنـی (ناو) لـە (فرمـان)))ەوەیـە نووسـیویەتی دەڵـێ: ((ئـەم جـۆرە نـاوە دروسـت کراوانـە هـەمووجۆرە چـاوگێ دەگرێتـەوە)) (بڕوانـە: ل ١٥٢). ئینجـا کەسـی

---

[35] - بۆ دەوری ئەو پاشگرانە لە ڕۆنانی ناودا، بڕوانە: د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، و شـەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٥٩ – ٦١.

[36] - نوری عەلی ئەمین، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٨٥.

سێیەمی کرداری ڕابوردووی کردووە بە بنکەی ڕۆنانی چاوگ و وای داناوە کە هەر پێنج جۆرە چاوگەکە لەسەر ئەو بناغەیە ڕۆنراون... لە پەراوێزی (١٠٧)یشدا دەڵێ: ((من بۆیە ئەڵێم ناوە، چونکە جێگای ناو ئەگرێتەوە و کرداری (ناو) ئەکات، لە ناوڕستەدا...)). دەبینین نووسەر لێرەدا چاوگی بە ناو داناوە... ڕاستە چاوگ لەڕستەدا دەتوانێ دەوری ناو ببینێ، بەڵام ئەمە نابێتە هۆ بۆئەوەی چاوگ بەناو بژمێررێت... خۆ هەندێ بەشی دیکەی ئاخاوتن هەن، کە ئەوانیش لەڕستەدا دەوری ناو دەبینن (بەتایبەتی جێ ناو)... ئەگەر بەو بۆ چوونەی مامۆستا هەورامانی بێت، ئەو دەمە پێویست بەوە ناکات، وەك بەشی سەربەخۆی ئاخاوتن جیابکرێتەوە...

هەروەها، ئەگەر تەماشای ئەرکی ناو لە ڕستەدا بکەین، دەبینین کە جۆراوجۆر خۆی دەنوێنێ. جا ئەگەر بەو پێیە بێ دەبێ چۆن موعامەلەی ناو بکەین؟...سەرەڕای ئەوانەش، ئەگەر مامۆستا ڕای وابێ کە (چاوگ)یش (ناو)بێت، ئەی بۆچی لەو هەموو نموونانەدا کە دوای پێناسەی ناو تۆماری کردوون، یەك چاوگ چییە، تێیدا نییە؟.

لایەنێکی تری ڕەخنە بەرامبەر ئەوە دەوەستێ کە مامۆستا هەورامانی، وای داناوە کە چاوگ لە کرداری ڕابوردووەوە پەیدا بووە... بێگومان، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ باش بۆی چووە کە دەڵێ: ((ساغ کردنەوەی ئەو لایەنە ئاخۆ (چاوگ) سەرچاوەی ئیشتیقاقە، وە یاخود چاوگ خۆی لە کارەوە وەرگیراوە، باسێکی فراوانە و دەمەتەقێیەکی ورد و قوڵ

هەڵدەگرێت...))"[37] "... ئیتر مامۆستا هەورامانی چۆن بێ لێکۆڵینەوە ئەو بڕیارەی داوە؟.

لە بەشی (ب)ی ئەم باسەدا کە لەژێر ناوی ((ناو لەڕەگی فرمان))دایە، تەنیا دەست نیشانی پاشگری (ە)ی کردووە. ئاشکرایە کەژمارەیەکی زۆری پاشگر هەن دەچنە سەر ڕەگی کردار و ناوی داڕێژراو سازدەکەن، وەك: (ار، یار، ەر، مان، ۆکە، گە، ەن، ەك، اك، وە/ەوە، کە، ەوار، مەنی....)"[38]" کەچی مامۆستا هەر ناویشی نەبردوون.

ئەو ناوە داڕێژراوانەش کە لە ناوی سادەوە دروست کراون، بەسەر دوو جۆردا دابەشی کردوون: أ — ئەوانەی ((لە هەندێ ناوەوە))(بڕوانە: ل ١٥٣)، ب — ئەوانەی ((بە کۆکردنەوەی ناو)) (بڕوانە: ل ١٥٤) سازدەبن. هەندێك لەو پاشگرانە دەوری بچووك کردنەوە دەبینن لە کۆمەڵی (أ)دا داناوە. بۆ جۆری (ب)ش هەندی لەو نیشانانەی کاری کۆکردنەوە بەجێ دێنن کردووە بە کەرەستە.

ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ناوی سادە و دەیانکەنە ناوی داڕێژراو گەلێك زۆرن، بە وێنە نووسەری ئەم باسە لە کتێبی ((وشە ڕۆنان لە زمانی کوردیدا))دا (٥٨) پاشگری دیاری کردووە"[39]. کەچی مامۆستا هەورامانی

---

[37] - بڕوانە: ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٢٢٦.

[38] - بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو سەبارەت بەو پاشگرانە، بڕوانە: د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٦١ — ٦٤.

[39] - بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل ٥٠ — ٥٩.

تەنیا چەند پاشگرێکی باس کردووە، کە ئەوانیش ئەوانەن کە هەر دەوری بچووك کردنەوە دەبینن.

نووسەر لەوەشدا بە هەڵە چووە کە ناوی لە حاڵەتی (کۆ)دا بە وشەی دارێژراو داناوە، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە لە ڕێگای نیشانەی (ان)ی کۆوە پێك دێ وەك: (کچان، کوڕان، برایان...). هەڵەیەکی دیکەشی ئەوەیە کە جگە لە (ان) و (ات)،(یان) و (هات)یش بەدوو نیشانەی تر تێ گەیشتووە.

لە دوا بەشدا: ((دروست کردنی (ناو) لە ئاوەڵکردار)) (ل ١٥٤ — ١٥٥) سێ نموونەی هێناوەتەوە: (ژێرپیاڵە، سەربان، لاپاڵ). بەر لەم بەشە مامۆستا وای داناوە کە ناوی دارێژراو بە یاریدەی پاشگر دروست دەبێ کەچی لێرەدا لە دەستوور لای داوە و وشەی واتاداری سەربەخۆی، وەك (پیاڵە، بان، پاڵ)ی بۆ ئەو جۆرە پێکهاتنە بە نموونە هێناوەتەوە. لە مەدا نووسەر بە هەڵە چووە و هەرسێ نموونەکەی وشەی دارێژراو نین، بەڵکو لێکدراون. بۆ ئەم بەشە بەڕای من وشەی وەك (بنار، پێشەوا، پێشین...) دەتوانن ببنە نموونەی لەبارو گونجاو. بەمە و چەند نموونەیەکی تردا وا دەردەکەوێ کە مامۆستا هەورامانی جیاوازی لە نێوان (پێشگر و پاشگر) و (نیشانە) و (وشە)دا نەکردووە.

هەروەها لە بەشی ناوی کتێبی ناوبراودا، باسی ناوی تایبەتی (نووسەر واتەنی — ناوی ناسراو)و ناوی گشتی(— ناوی ئاسایی) (ل ١٤٢ — ١٤٥)، ناوی تاك و کۆ (ل ١٤٥ — ١٤٦)، جنسەکانی ناو (ل ١٤٦ — ١٤٨)... بەرچاو دەکەوێ.

لە هەندێ ڕووەوە ئەم چەند باسە لەوانی پێشوتر سەرکەوتووترن. بە وێنە لێرەدا پەیدابوونی نیمچەبزوێن، یاخود تێچوونی بزوێن شێوەی ڕاستی (ان)ی نیشانەی کۆی لێ تێك نەداوە. هەرچەندە ناوی دوولایەنی وەك جنسێکی سەربەخۆ جیا نەکردۆتەوە، بەڵام نەشی خستۆتە پشتگوێ... بە داخەوە لە باسی (ناوی کۆ)دا دەربارەی نیشانەی (ات، ەها) هیچی نەوتووە. هەندێ وشەش هەن کە یاریدەی سازبوونی کۆ دەدەن نووسەر هەر ناوی نەبردوون... سەرەڕای ئەوانە، هەروەها گەلێك باسی گرنگی پەڕاندووە، وەك دەربارەی (نیشانەکانی ناسیاوی و نەناسیاوی)"[٤٠]"،(ناوی مادی)،(ناوی مەعنەوی)،(ناوی کۆمەڵ)... ئەوەی لەم کتیبەی مامۆستا هەورامانی دا پێوەندی بە کێشەی ئیزافەوە هەبێت، ئەوەیە کەلە باسی پاشگرەکاندا کەمێك دەربارەی (ی)ی ئیزافە دواوە(ل١١٦)... ناتەواوی دیاری ئەم بەشەش نەك هەر لەوەدایە کە نیشانەی ئیزافەی بەپاشگر داناوە بەڵکو لەوەشدایە کە ناوی نیشانەکانی دیکەی ئیزافەی نەبردووە.

ئەو جۆرە کەم و کورتی و هەڵانە و هەندێکی تر، بە تایبەتی لە ڕووی زاراوە و شێواز و لاوازی زمان...ەوە لە بەشی (ناو)ی کتێبی ((سەرەتایەك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی))دا بەرچاومان کەوتووە نووسەری ئەم کتیبە نەك تەنیا نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی، بەڵکو گەلێك نیشانەی دیکەشی بە پاشگر ژماردووەو کەچی هەر لەو کاتەدا بەشێکی زۆری پاشگرە گرنگەکانی باس نەکردووە. بەوێنە (ەکە) — ((پیاوەکە...))، (مان) — ((مێژوومان...))،

---

[٤٠] - مامۆستا هەورامانی لە شوێنکی تردا (ل ١١٤ — ١٥٠) — واتە لە باسی پاشگرەکاندا — بە چەند دێڕێك لە (ەکە)و(ێك) دواوە.

(ن) – = ((هەستن...))، (تر) – ((گەورەتر...))... بە پاشگر داوەتە قەڵەم، بەلاّم گەلێك پاشگری چالاك و بەرچاوی یادداشت نەکردووە، وەك: (گەر) – ((ئاسنگەر...))، (گە) – ((کارگە..))، (دان) – ((مۆمدان...))، (بان) – ((فێڵبان...))،(ێنی) – ((کورێنی...))... و گەلێکی تر. بە هیچ جۆرێکیش لە چۆنیەتی لکاندن و باری جۆراوجۆری نیشانەی ناسیاوی ونەناسیاوی نەدواوەو حاڵەتی جیاوازیانی دەستنیشان نەکردووە، واتە باسی ئەوەی نەکردووە کە ئەگەر بەدوا بزوێنەکاندا بێن چ گۆڕانێك ڕوودەدا. لە باسی نیشانەی ناسیاویدا، ئەوەی یاداشت نەکردووە کە ناو دەکاتە ناسیاو، یاخود لە باسی (ەکە)دا تەنیا ئەوەی دەستنیشان کردووە کە دەوری ناساندن دەبینێ، بەلاّم بۆ ئەرکەکانی دیکە نەچووە.

ئەوەی تەواو بەرچاو بێ و جێگەی ڕەخنە بێ، ئەوەیە کە جگە لە (ەکە)،هەروەها (کە) – ((ماواکە...))، (ەکەش) – ((پیاوەکەش...))، (ەکەشی) – ((کتێبەکەشی...)) هەر بە پاشگر (ڕاستتر نیشانە – ئەورحمان)ی ناسیاو داناوە. بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە کە نووسەر (ەکە)ی ناسیاوی و (ش)ی عەتف بە یەکەوە بکاتە نیشانەی ناسیاوە. ئەگەر بەگوێرەی ئەو جۆرە لێکدانەوەی مامۆستا هەورامانی بێ، ئەوە دەبێ (کەمی) – ((بەرەکەمی..))، (ەکەمی) – ((کورەکەمی..))، (کەی) – ((پەردەکەی...))، (ەکەی) – ((ژنەکەی))، (کەت) – ((شەدەکەت...))، (ەکەت) – ((چاوەکەت...))... و گەلێکی تریش ((پاشگر)) بن و دەوری ناساندن ببینن کە بێگومان ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە.

لیژنــەی زمــان و زانســتەکانی کــۆڕی زانیــاری کــورد لــە ســەرەتای دامەزراندنیەوە تاکو ئیستا چالاکانە و گورج و گۆلآنە خەریکی بەجیٚ هێنـانی ئەرکەکانی بووە و لەو ڕووەوە گەلێك تێکۆشاوە و هەولٚ و تەقەلایـەکی زۆری داوە. بەوپەڕی بڕوا و دلنیاییەوە دەتوانم بلێم، سەرکەوتوترین لیژنـەی کۆڕە و سەلماندنی ئەمەش، ئـەو بەرهەمەیـەتی کـە لـە چـەند ژمارەیـەکی گۆڤـاری کۆڕدا و"[41]" دوو سالٚ لەمەوبەر بـە کـۆکراوەیی لـە کتێبێکـی گـەورەی (٤٧٨) لاپەڕەییدا، بە ناوی ((ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆلینەوەی لیژنـەی زمان و زانستەکانی))یەوە"[42]" بلاوی کردۆتەوە.

ئەم نووسراوە بە شێوەیەکی سەرەکی دەربارەی بەشـەکانی ئاخاوتنـە و بریتییە لە باسی: ناو(ل ١٠ — ٢٦)، جێناو — لیژنەی ڕاناوی پیٚ وتـووە — (ل ٢٧ — ٧٤)، ئاوەلناو (ل ٧٥ — ٩١)، کردار — لیژنـە کـاری پـیٚ و تـووە — (ل ٩٢ — ٢٦٧)، چـــاوگ (ل ٢٦٨ — ٢٨٣)، ئـــاوەلکردار — لیژنـــە زاراوەی ئاوەلکاری بۆ داناوە (ل ٢٨٤ — ٣٠٣)، پرێپۆزیشن (ل ٣٠٤ — ٣٢٥)، ئامرازی عەتف (ل ٣٢٦ — ٤١٦)، ئامرازی تعجب (ل ٤١٨ — ٤٤٧)، ئامراز و گـیرەك و نیشانە (ل ٤٤٧ — ٤٧٧)"[43]".

[41] - بڕوانـە((گۆڤاری کـۆڕی زانیـاری کـورد))، ب٣، ژ١، بەغـدا، ١٩٧٥، ل ٣٩٨ — ٤٩٦ ، ب٣، ژ٢، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٢٤١ — ٣٥٨، ژ٤، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٢٩٨ — ٤٠٠...

[42] - ڕێزمـانی ئاخـاوتنی کـوردی بـەپێی لێکۆلینـەوەی لیژنـەی زمـان و زانسـتەکانی، بەغـدا، ١٩٧٦.

[43] - لە هەموو شوێنێکی ئەم باسەدا پەنجە بۆ لاپەڕەکانی کتێبەکە ڕاکێشراوە.

نووسەرانی ئەم کتێبە بەم کارە خزمەتێکی زۆری زمانی کوردییان کردووە و کەلێنێکی گەورەیان پڕکردۆتەوە بەوەی پەردەیان لە ڕووی گەلێك کێشەی نادیار و شاراوەی ڕێزمانی کوردی لابردووە. لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی وەستایانە و زانایانەیان کردووە. بەلاّم لەگەڵ هەموو ئەو وەستایەتی و سەرکەوتووییەشدا، بەداخەوە کەم و کورتی و ناتەواوی و هەڵە دەبینریٚ.

هەر بەشێکی ئاخاوتن کە ئەوان باسیان کردووە پێویستی بەدەسکاری هەیە، کە ئەویش یا لابردنە یا زیادکردنە یا ڕاستکردنەوەیە یا گۆڕینە...

لەبەر ئەو هۆیەی لە یەکەم لاپەڕەی ئەم فەسڵەدا پەنجەمان بۆ ڕاکێشاوە و وەك ڕووناکبیرێکی کورد بە ئەرکی سەرشانمی دەزانم بیروڕای خۆم دەربارەی ئەو کارە دەربڕم و لە نیگای بۆچوونی خۆمەوە لێی بدوێم و لە ڕێگەی ڕەخنەوە خزمەت بە زمانەکەمان بکەم و هەروەها وەك دۆستێکی دڵسۆز داوای ئازیزان بەجیٚ بهێنم کە دەڵێن: ((لیژنەی (ڕێزمان و زانستەکانی) لەم بەرهەمەیدا، کە دیاریەکی کۆڕی زانیاری کوردە بۆ ڕۆشنبیری کوردی، گەلاّلەی چالاکی چەند ساڵەی خۆی بە تەوازوعەوە دەخاتە بەر نیگای ڕەخنە و نرخاندنی زمانزانانی کوردی)) (ل٤٤٧)

کتێبی ناوبراو گەلێك شوێنی جێگەی سەرنج و ڕەخنە و لێدوانە، بەلاّم بەداخەوە لێرەدا مەودای ئەوەمان نییە لە گشت باسێك و ڕوویەکی بکۆڵینەوە. ئەو چەند لاپەڕەیەی خوارەوە تەنیا هەندیٚ سەرنجی سەرەتایی و سەرپێییە بۆ نیشاندانی بەشێك لەو کەم و کورتی و ناتەواویانەی لە باسی (ناو)دا بەرچاومان کەوتوون.

وەك لەسەرەوە باسمان کرد، ئەم نووسراوە بەشێوەیەکی سەرەکی دەربارەی بەشەکانی ئاخاوتنە و بەو پێیە لیژنە لە لاپەڕە (١٠)ەوە — واتە دوای پێشەکی لەژێر سەرباسی (ناو)دا لە یەکەم دانەی ئاخاوتنی کۆڵیوەتەوە.

باسی ناو بە پێناسەیەك دەست پێ کراوە، کە دەڵێ: ((ئەو وشەیەیە سەربەخۆ واتایەك دەگەیەنێت کە بە کاتەوە نەبەستراوەتەوە، وەك: کاوە، ساڵ، بەرد، پیاوەتی، هەولێر، ڕۆیشتن، گوڵ، پەپوولە، فڕۆك، بەستەڵەك، هەڵپەڕکێ، تێ هەڵکێشان)) (بڕوانە: ل١٠). من لەو ڕایەدام کە ئەو پێناسە ناتەواوە، چونکە جگە لە (ناو)، هەروەها (جێناو، ئاوەڵناو، ژمارە، چاوگ)یش سەربەخۆ واتە دەگەیەنن و بە کاتەوە نەبەستراون. ئەم هەڵەیەش لەوە وەهاتووە کە لیژنە دوو دابەشکردنی تێکەڵ کردوە — واتە ئەوەی کە زانایانی عەرەب، وشە بەسەر (اسم) و (فعل) و (حرف)دا دابەش دەکەن، لەگەڵ ئەوەی ئەورووپییەکان بەشەکانی ئاخاوتن بە (ناو) و (جێناو) و (ئاوەڵناو) و (ژمارە) و (چاوگ/کردار) و (ئاوەڵکردارو) و (ئامراز)... دادەنێن — جا لیژنە لە کارەکەیدا بە پێی دابەشکردنی دووەم کۆڵیوەتەوە، کەچی پێناسەی عەرەبی بۆ ناو کە (ناو و جێناو و ئاوەڵناو و ژمارە و چاوگ) دەگرێتەوە، وەرگێڕاوەتە سەرکوردی و بەسەر ناوی ڕووتیدا سەپاندوە. ڕاستە لە دابەشکردنی عەرەبیدا (ناو و جێناو و ئاوەڵناو و ژمارە و چاوگ) دەکەونە بابی ناوەوە، بەلام لیژنە لێکۆڵینەوەکەی بەپێی ڕێگە ئەورووپاییەکەیە و لەو شوێنەدا لە ناوی ڕووت (substantive,noun) دەدوێ، نەك لە بابی ناو. بەڵگەش بۆ ئەمە، ئەوەیە کە لە شوێنی خۆیدا بە

جیا لە ڕاناو و ئاوەڵنا و چاوگ دواوە و بەجیا تەعریفی کردوون. سەرەڕای ئەوە لەو نموونانەدا کە دوابەدوای پێناسەکە هێنراونەتەوە دوو وشەیان: (ڕۆیشتن، تێ هەڵکێشان) چاوگن و تێکڕای ئەوانی دیکە ناون. لێرەدا دوو پرسیار دێتە گۆڕێ : ١- کە ڕێگەی جیاکردنەوەی بەشەکانی ئاخاوتن گیراوە، ئیتر بۆچی ئەو دوو چاوگە کەوتوونەتە نێو ئەو نموونانەوە؟ ٢- ئەگەر لیژنە ناوی بەشێوەیەکی فراوانتر تەماشاکردووە، ئەی ئەوە بۆچی نموونەکانی وشەیان تێدا نییە کە جێناو و ئاوەڵناو و ژمارە بن.

دوابەدوای ئەو پێنایەسە لە دوو ڕووەوە لە ناو دواون:

**١- لە ڕووی پێکهاتنەوە.**

**٢- لە ڕووی واتاوە.**

لە ڕووی پێکهاتنەوە ناوی بەسەر (سادە) و (ناسادە)دا دابەش کردووە. هەرچی (ناسادە)شە (داڕێژراو) و (لێکدراو)ی لێ جیاکردۆتەوە. ئەو بۆچوونەی لیژنە شتێکی لەبارە و بەر لەو بەو شێوە زانستیە و بەو ڕێك و پێکییە دیاری نەکرابوو. بەم جۆرە لیژنەی ناوبراو سنوری تەواوی لەنێوان وشەی (سادە)و (داڕێژراو) و(لێکدراو)دا کێشاوە و لە هیچ شوێنێکی باسەکەیدا تێکەڵی نەکردوون... بەڵام لەگەڵ ئەو سەرکەوتوویيەشدا لەم بەشەدا کەم و کورتی زۆرە:

یەکێك لەو ناتەواوییانە، ئەوەیە ئەم باسە شتی لاوەکی زۆر تێ ئاخنراوە، کەچی هەندێ شتی سەرەکی و پێویستیش باس نەکراوە. بە وێنە ئەم باسە شەش لاپەڕە دەبێت و ماکەکەی لە لاپەڕە یەك تێناپەڕێ. ئەو زیادییەش

ئەوەیە کە بەدوور و درێژی لە نووسینی زمانەوانی کورددا چی دەربارەی ئەو باسە هەیە لە ڕووی زاراوە و دابەشکردنەوە... تۆماریان کردوون. گومان لەوەدا نیە کە پێویستە سوود لەو کارانە وەربگیرێ کە لەو مەیدانەدا کراون و پەنجەیان بۆ ڕابکێشرێ و موناقەشە بکرێن و ئەوەی باشە لێیان وەربگیرێ و بچەسپێنرێ، ئەوەشی هەڵەیە ڕەت بکرێتەوە و لە جێگەی ئەو بیرو ڕای ڕاست و لە بار و گونجاو دابنرێ، بەڵام لیژنە بە شێوەیەکی ساکار تەنیا عەرضی کردووە"[٤٤]. بەو جۆرە لەوە دەچێ کە ئەو نووسراوانەی دەربارەی ڕێزمانی کوردی نووسراون بەپێی باس لێکی دابن. لەم باسەدا تەنانەت ئەوەشی یادداشت نەکردوە کە ئەو سەرچاوانەی ئەو عەرضی کردوون، وشەی دارێژراو لێکدراویان وەك یەك تەماشا کردوە و بە یەك جۆر دایان ناون و لە یەکتریان جیانەکردونەتەوە.

کەم وکورتییەکی دیکەی باسی وشەی سادە و ناسادە، ئەوەیە کە دوابەدوای پێناسەی وشەی ناسادە، سێ وشەی (مارماسی، بەردەنوێژ)، بن

---

٤٤- بە داخەوە نیشاندانەکەش زۆر ناتەواوە، چونکە تەنیا ناوی نووسەری کتێبەکانی هێناوە، بێ ئەوەی ناوی تەواوی کتێب و ژمارەی لاپەڕە و شوێن و ساڵی لەچاپدان... دەربخا. بە وێنە لەلاپەڕە (١٣)دا دەڵێ: مامۆستا نوری عەلی ئەمین بۆ وشەی (ناسادە) زاراوەی (ئاوێتە)ی بەکارهێناوە. بەڵام نەی نووسیوە لەم کتێبیدا، لە چ لاپەڕەیەکدا... ئاشکرایە، مامۆستا نوری عەلی ئەمین چەند کتێبێکی لەسەر ڕێزمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە، ئیتر خوێنەر لە کوێوە بزانێ لیژنە مەبەستی لە کام کتێبیانە... هەر بەو جۆرەش نووسیویتی، کە کوردۆییێف زاراوەی (بارگران)ی داناوە... جا مامۆستا کوردۆ ژمارەیەك کتێب و نامیلکە و وتاری لەسەر ڕێزمان داناوە و من بەش بەحاڵی خۆم ئاشنایەتیم لەگەڵ خۆی و هەموو کارە زانستیەکانی هەیە، کەچی ناشزانم سەرچاوەی لیژنە کامیان بووە. ئیتر خەڵکی چۆن بتوانن ئەو سەرچاوەیە ببیننەوە.. بێگومان بەو چەشنە سود لە سەرچاوە وەرناگیرێ و بەو جۆرە پەنجەی بۆ ڕاناکێشرێ!.

بەردەقیلە) بە نموونە هێنراونەتەوە، کە ڕاستە ناسادەن، بەلام هەرسێکیان لێکدراون. لە بەر ئەوەی لە ناوەڕۆکی ناسادەدا، داڕێژراو و لێکدراو جیاکراونەتەوە، بۆیە دەبوو چەند نموونەیەکی داڕێژراویش لە تەکیاندا دابنرێن.

پێناسەی وشەی سادە و لێکدراو بەوردی کراوون، بەلام بۆ وشەی داڕێژراو کە وتراوە: ((ئەو ناوە ناسادەیە کە تەنیا وشەیەکی واتاداری تێدابێت)) (بڕوانە:ل١٦)، ئەوە باشتر وابوو ئەوەشی لەگەڵ یادداشت بکرایە، کە پێشگرو پاشگر لە ڕۆنانیدا دەورێکی گەورە دەبینن.

کەم و کورتی هەرە بەرچاوی باسی وشەی سادە و ناسادە لەوەدایە کە لە چۆنیەتی و جۆری ڕۆنانی وشەی ناسادە نەدواوە — واتە باسی ئەو پێشگرو پاشگرانەی نەکردووە کە یاریدەی دروستکردنی ناو دەدەن، یاخود باسی شێوازی پێکهاتن و جۆرەکانی ناوی لێکدراوی نەکردووە. بە وێنە لەزمانی کوردیدا ژمارەیەکی زۆر پاشگر"[٤٥]" هەن، دەچنە سەر (ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکردار)ی سادە و دەیانکەنە ناوی داڕێژراو"[٤٦]".

لیژنە نەك هەر باسی ئەو پاشگرانەی نەکردووە و دەربارەی ناوی داڕێژراو شتێکی ئەو تۆی نەنووسیوە، بەڵکو سەبارەت بە ناوی لێکدراویش هەر بەو

[٤٥]- لە زمانی کوردیدا پاشگر لە هاریکاریکردنی ڕۆنانی ناوی داڕێژراودا زۆر چالاکە و دەچێتە سەر هەزاران وشەی سادە و دەیانکاتە داڕێژراو.هەرچی پێشگرە لەڕۆنانی ناودا زۆر سستەو تەنیا لە چەند حاڵە تێکی کەمدا دەبینرێ... بەلام بە پێچەوانەوە پێشگر لە ڕۆنانی کرداردا تەواو چالاکە، کەچی پاشگر مەیانەی خۆش نییە... بێگومان ئەم دیاردەیەش یەکێکە لە تایبەتیەکانی زمانی کوردی و زمانناسان پەنجەیان بۆ ڕانەکێشاوە.

[٤٦]- بڕوانە: ئەو باسەی لەم کتێبەدا دەربارەی ناوی داڕێژراو کراوە.

چەشنە بە چەند وشەیەك باسەکەی کۆتایی پێهێناوە و جۆرەکانی ناوی لێکدراوی دەستنیشان نەکردووە"[٤٧].

وەڵامی ئەندامانی لیژنە بۆ ئەو ڕەخنەیەی لەکاتی گفتوگۆکردندا لێم گرتن، سەبارەت بەوەی بۆچی باسی ئەو پێشگر و پاشگرانەیان نەکردووە کە یارمەتی ڕۆنانی ناوی داڕێژراو دەدەن، ئەوە بوو کە گوایە پێشگر و پاشگر بە باسێکی سەربەخۆ پێشکەش دەکەن... هەرچەندە گومان لەوەدا نییە کە پێشگرو پاشگر مۆرفێمی (بەستراو)ن، بەڵام ئەگەر لە هەر بەشێکی ئاخاوتنیشدا دەستنیشانی دەوریان لە ڕۆنانی ئەو بەشە ئاخاوتنە بکرایە، ئەوە باسەکە تەواوتر دەبوو، بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەو ڕایەم تەنیا ئەوە بەسە کە دواتر لیژنە خۆی لە بەشی کرداری داڕێژراودا لە پێشگرو پاشگری کردار دواوە"[٤٨] (بڕوانە: ل ٢٣٦ – ٢٤٣) و بە پێویستیشی داناوە و دەڵێ: ((لەبەر ئەوەی کە بەشێ لە کاری ناسادە بە یاریدەی پێشگر و پاشگر پێك دێن، لیژنە وای بەباش زانی لەو پێشگر و پاشگرانە بدوێت کە پێوەندییان بە کارەوە هەیە)) (بڕوانە: ل ٢٣٦).

ئەوەی پتر ئەو کەم و کوڕییە پیشان بدا، ئەوەیە لیژنە نەك هەر لە بەشی ناودا، بەڵکو لە هەموو بەشەکانی دیکەی ئاخاوتندا لە شێوازی پێکهاتن و جۆرەکانی وشەی لێکدراویش نەدواوە. دەبێ لیژنە ئەمەیان بخاتە نێو کام

---

[٤٧] - بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە، بڕوانە: ئەو باسەی لەم کتێبەدا دەربارەی ناوی لێکدارو کراوە.

[٤٨] - هەرچەندە لە بەشی کرداردا باسی ئەو پێشگر و پاشگرانەیان کردوە کە کرداری داڕێژراو سازدەکەن، بەڵام لەمیشدا کەم و کورتی و ناتەواوی بەدی دەکرێت. بەداخەوە لێرەدا جێگەی لێکۆڵینەوەی ئەو کێشەیە نییە.

باسەوە؟ ڕاستە ئەوانە کەم و کورتی لیژنەن، بەلام لام وایە زرووف و ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە بوونەتە هۆی ئەو ناتەواویانە...

پاش ئەوەی لیژنە بەو ناتەواوییە لە ناوی سادە و ناسادە دواوە، ئنجا هاتۆتە سەر تۆژینەوەی ((ناو لە ڕووی واتاوە)) (ل ١٦ — ٢٤). لە باسی ناودا ئەم بەشە لەوانی دیکە سەرکەوتووترە و کەمێك کەرەستەی نوێی تێدایە، کە زووتر زمانەوانی کورد باسیان نەکردوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمیش لە ناتەواوی بەدوور نییە.

لیژنە کاتێ لە ڕووی پەراوێز (مفهوم، مضمون)ەوە ناوی بەسەر: (ناوی گشتی و ناوی تایبەتی و ناوی کۆمەڵ)دا دابەش کردوە، نموونەی تەواوی نەهێناوەتەوە و شەرحی نەکردوون و لێکی نەداونەتەوە و پێناسەی بۆ دانەناون (بڕوانە: ل ١٩). کەچی ئەگەر ئاوڕ لە هەژدە ساڵێك لەمەوبەر بدەینەوە چاوێك بە کتێبی ((ڕێزمانی کوردی)) — نوری عەلی ئەمیندا (کە خۆی ئەندامێکی چالاکی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕە) بخشێنین"[٤٩]"، بە ئاشکرا دەردەکەوێ کە ئەو باسانە لە کتێبی ناوبراودا گەلێك فراوانتر باس کراون. بەڕاستی لیژنە دەبوو ئەم باسە و زۆر باسی دیکە لە نووسەرانی پێشووی کورد تێپەڕێنێ. ئەگەر وا نەبێ دەبێ نرخی ئەو ئەرکەی چی بێ.

لە لاپەڕە(١٩ — ٢٠)دا لە ڕووی زایەند(جنس)ەوە لە ناو دواوە و بەپێی هەڵکەوتی زمانی کوردی چوار جنسی دەست نیشان کردوە: (١— ناوی نێرینە، ٢— ناوی مێینە، ٣— ناوی دوولایەن، ٤— ناوی بێ لایەن) و نموونەی جوان و لەباری بۆ هێناونەتەوە. لە کۆتایشدا کەمێك ئاوڕی لە دیالیکتی

---

[٤٩]- نوری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ل ٦٥ — ٦٦.

کرمانجی ژووروو داوەتەوە. بەڵام بەداخەوە، ئەو ئاوڕدانەوەیەی چمکێکی ساکاری باسەکەی گرتۆتەوە و بە چوار پێنج دێڕێك تەنیا ئەوەی دەربڕیوە کە لە شێوەی کرمانجی ژووروودا، هەموو ناو بە ئیزافەکردنی ئامرازی نێرو مێ لە یەکتر جیادەکرێنەوە (بڕوانە: ل ٢٠). بێگومان ئەم باسە زۆری بە بەرەوەیە و دەمێکە هەندێ لە کوردناسان بەتایبەتی کوردناسانی سۆڤیەت، وەك قەناتی کوردۆ"[٥٠]"، چەرکەزی بەکۆ"[٥١]"...سەبارەت بە تایبەتێتی زایەند لە کرمانجی ژووروودا ئەنجامی باشیان بەدەست هێناوە. دەبوو لیژنە لەو بارەیەوە کار و ئەنجامی زانایانی ناوبراو فەرامۆش نەکا و کاری خۆشی وا بە ساکاری کۆتایی پێ نەهێنێ.

باسی ئاوڕدانەوەی لیژنە لە جنسەکانی ناو لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا، باسێکی گشتی دێنێتە کایەوە، کە ئەویش جۆری ئاوڕدانەوەی لیژنەیە لە تێکڕای باسی ناو و بەشەکانی دیکەی ئاخاوتن.

وەك لە پێشەکی بەرهەمی لیژنەدا دەردەکەوێ، لە سەرەتای دامەزراندنی لیژنەوە، ئەندامی تێدا بووە کە هەڵگری دیالێکتی کرمانجی ژووروو بووە (بڕوانە: ل ٣ — ٤). سەرەڕای ئەوە، وەك نووسیویانە ((لە هەڵبژاردنی ئەم لیژنەیە لایەنی گرتنەوەی زۆربەی شێوەکانی ئاخاوتنی کوردی ڕەچاو کراوە

---

[٥٠] - أ— قەناتی کوردۆ(کوردۆییێف)، دەستووری زمانی کوردی، موسکۆ — لێنینگراد، ١٩٥٧،ل ٤٤ — ٥٣، (بە زمانی ڕووسی)

ب— قەناتی کوردۆ(کوردییێف)، زمانی کوردی، چاپی چوارەم، یەریڤان، ١٩٧٠، ل ٣١ — ٣٦(بە زمانی کوردی)...و هەندێکی تر.

[٥١] - چەرکەزی بەکۆ (بەکاییێف)، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل: ٩٣ — ١٠٤...و هەندێکی تر.

تاکو ڕێزمانێك کە لە ئەنجامی تۆژینەوەی لیژنەییێکی ئەوتۆوە بەرهەم بێت سەرلەبەری شێوەکانی کوردی تێدا خوێنرابێتەوە بەو نیازە کەوا لە بەراوردکردنی زۆرینەی شێوەکانەوە هەل پتر چنگ کەوێ بۆ دۆزینەوەی دەستووره ڕەسەنەکانی ڕێزمانی کوردی...))(بڕوانە: ل٣).

بەو پێیە دەبوو لیژنە لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەیەوە و لەسەر پاکی نووسینەکەیدا پەنجەی بۆ ئەو تایبەتییانە ڕابکێشایە کە دیالێکتی کرمانجی ژووروو لە دیالێکتی کرمانجی خواروو جیا دەکەنەوە، یاخود وێکچوون و یەك گرتنەوەی ئەو دەستوورانەی هەردوو شێوە بە یەکەوە دەبەستن، لەگەڵ ئەو پردانەی لە یەکتریان نێزیك دەخەنەوە دەبوو باس بکا و دیاری بخا، کەچی ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لیژنە ئەو پێویستییەی ڕەچاو نەکردوە و ئەمە بووە بە کەلەبەرێکی گەورەی لێکۆڵینەوەکەی. بەڵگەمان بۆ سەلماندنی ئەو وتانەمان ئەوەیە کە لە سەرتاپای باسی (ناو)دا تەنیا لە لاپەڕە(٢٠)دا، کە لە جنسەکانی ناو دواوە بە چوار پێنج دێڕێك ئاوڕێکی کورتی لە شێوەی کرمانجی ژووروو داوەتەوە. بێگومان لەم ڕووەوە لیژنە نەك هەر یەکێ لە ئەرکە سەرەکیەکانی خۆی بەجێ نەهێناوە، بەڵکو بەمە بەرهەمەکەی خۆی تووشی کەم و کورتییەکی گەورە کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەو ڕاستییە پشتگوێ نەخەین، کە لیژنە دواتر – واتە لە بەشەکانی دیکەی ئاخاوتندا – بەتایبەتی لە بەشی کردارەوە، پتر ئاوڕی لە دیالێکتەکان و بەشە دیالێکتەکان داوەتەوە"[52] و کەرەستەیەکی زۆری

[52] - هەروەها لە تێکڕای لێکۆڵینەوەکەدا ئەوە بەدی دەکرێ، کە لە هەموو ڕوویەکەوە، هەتا دێ باسەکە فراوانتر و پوختەتر دەبێت.

خستۆتە بەرچاو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەداخەوە لەزۆر شوێندا بە شێوەیەکی ساکار نیشانی داوە و نەیخستۆتە قاڵبێکی عیلمییەوە. بە وێنە لە سەرەتای باسی کرداری تێنەپەڕ و تێپەڕدا، ڕای مامۆستا قەناتی کوردۆی لەو ڕووەوە نیشان داوە (بڕوانە: ل ٩٧)، کەچی کاتێك گەیشتۆتە ناوجەرگەی باسەکە و ئەنجام نەك هیچ سوودێکی لەوەی مامۆستا کوردۆ وەرنەگرتووە و بەلایدا نەچووە، بەڵکو تایبەتێتی ئەو دیالێکتەشی هەر ناو نەهێناوە. ئەوەی شایەنی باسە، ئەوەیە کە لە هەندێ شوێندا دیالێکتی کرمانجی ژووروو بەباشی خوێنراوەتەوە، بە تایبەتی بەشی ((کار لە ڕووی زمانەوە (کاتەکانی کار))) (بڕوانە: ل ١٥٦...). لە سەرەتای ئەم باسەوە بەدوور و درێژی ڕای مامۆستا صادق بەهائەدین پیشان دراوە و ئەوەی دەربارەی دەمەکانی کردار لە کرمانجی ژووروودا وتوویەتی تۆمارکراوە، ئینجا کاتێ لیژنە هاتۆتە سەر لێکدانەوەو ڕای کۆتایی، ئەوەی سەبارەت بە دیالێکتی ژووروو ڕاست و پێویستە ئاخنیویەتە باسەکەوە... بێگومان، ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ، کە لیژنە دواتر پتر گرنگی بە لێکۆڵینەوەکەی داوە و بەمە توانیوێتی فراوانتر و پوختەتری بکات.

هەرچەندە کێشەی چۆنیەتی ئاوڕدانەوە و سوودوەرگرتنی لیژنە لە دیالێکتە کوردییەکان باسێکی دوور و درێژە، بەڵام ئێمە لێرەدا زۆر بە کورتی لێی دواوین، چونکە یەکێك لە ڕەخنەکانی بەشی ناو، ئەوەی هێنایە گۆڕێ. جا لە دەمێکی تردا دەگەڕێینەوە سەر ئەو باسە گرنگە و ئێستا دێینەوە سەر بەشی ناو.

لە لاپەڕە (٢١ — ٢٤)دا دەربارەی ((ناو لە ڕووی سەربەخۆیی هەبوونەوە)) دواوە. لەلاپەڕە (٢٥ — ٢٦)یشدا پوختەیەکی باسی ناوی پێشکەش کردوە و بەمە کۆتایی بە لێکۆڵینەوە لە ناو هێناوە.

جگە لەو هەموو کەم و کورتی و هەڵانەی لە بارەی بەشی ناوەوە لە سەرەوە نیشانمان دان ناتەواوییەکی زۆر گەورەتر لەو بەشەدا بەدی دەکرێت، کە ئەویش باس نەکردنی هەندێ کێشەی گرنگە، کە پێوەندییان بە ناوەوە هەیە. بە وێنە بەهیچ جۆرێك دەربارەی نیشانەی ناسیاوی و نە ناسیاوی نەداوەو، لە کاتێکدا دەبوایە بە وردی ئەو مەسەلەیە شی بکاتەوە، چونکە پێوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ ناودا هەیە. ئەم مەسەلەیە — واتە باسی نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی — پێوەندی لەگەڵ ئاوەڵناویشدا هەیە، بەلاّم لیژنە لەو بەشەشدا ناوی نەهێناوە، بەلای منەوە ئەمە یەکێکە لە ناتەواوییەکانی ئەو کارەی لیژنەی ناوبراو.

لیژنە کاتێکیش لە کۆتایی بەرهەمەکەیدا هاتۆتە سەرباسی ئامرازەکان، تەنیا بەچەند دێرێك لە (ەکە) و (ە) دواوە.. لە سەرەتای باسی (ەکە)دا دەڵێ: ((لە ناو نووسەرانی کورددا تەنها مامۆستا تۆفیق وەهبی لە دەستورەکەیدا لێی دواوە...)) (بڕوانە: ل ٤٣٥). بەڵێ مامۆستا وەهبی لە (ەکە) دواوە، بەلاّم ئاشکرایە نووسەری دیکەش هەن لەو باسەیان کۆڵیوەتەوە، وەك: نوری عەلی ئەمین"[٥٣]" (کە خۆی ئەندامی لیژنەی ناوبراوە)

---

[٥٣]- ا- نوری عەلی ئەمین، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٥٨.

ب- نوری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠.

و کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا"[٥٤].. هتد. ئیتر نازانم چۆن لیژنە وا بەئاسانی بەسەر ئەوەدا تێپەڕیوە.

لیژنە کەمێك لەدەوری (ەکە) دواوە و ئەوەی دەست نیشان کردووە کە بۆ تەعریف و نیدا بەکاردێت، بەڵام بە هیچ چەشنێك لە چۆنیەتی خۆنواندن و لکاندنی نەکۆڵیوەتەوە.

لە لاپەڕە (٤٣٠ — ٤٣١)دا لە بارەی (ە)وە دواوەو ئەوەی دەربڕیوە کەوا بۆ بانگکردن بەکاردێت و هەندێ ڕستەی بۆ نموونە هێناوەتەوە، وەك: ((شوانە، ئەو بەرخانە بۆکوێ دەبەیت))... ڕاستە(ە) دەکەوێتە دوای وشەی بانگ لێ کراوەوە، بەڵام لیژنە بۆ ئەوە نەچووە کە دەوری ناساندنیش دەبینێ، وەك: ((شوانە(شوانەکە)،ئیستا لە چیایە بەرخ دەلەوەڕێنێ))... هتد"[٥٥].

وەك وتمان، لە بەشی ناودا دەربارەی نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی هیچ شتێك نەنووسراوە و تەنیا لە بەشی ئامرازەکاندا بەچەند دێڕێك دەربارەی (ەکە)ی ناسیاوی وتراوەو(ە)ش وەك نیشانەی ناسیاوی هەستی پێ نەکراوە. هەرچی نیشانەی نەناسیاویشە لە هیچ شوێنێکی لێکۆڵینەوەدا ناوی نەهاتووە.

لە زمانی کوردیدا (ەکە) و (ە) نیشانەی ناسیاوین. نیشانەی (ەکە) هەرچەندە بەدوای ناو و ئاوەڵناوەوە دەلکێنرێ، بەڵام لەگەڵ ناودا چالاکترە،

---

[٥٤] - کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا، دیالێکتی کوردی موکری، لێنینگراد، ١٩٦٨.

[٥٥] - ئامرازی (ە) هەندێ دەوری دیکەش دەبینێ، کە بەداخەوە لیژنە لێی نەدواوە. بۆ ئەوەی لێرەدا لە باسەکە دوورنەکەوینەوە، دەیخەینە دواوە و لە شوێنی پێویستدا لێی دەدوێین.

بەتایبەتی لەگەڵ ناوی گشتیدا. هەرچی لەگەڵ ناوی تایبەتیشدایە ناتوانێ خۆی بنوێنێ.

نیشانەی ناسیاوی (ەکە) کاتێک دەچێتە سەر وشە، دەتوانێ مانا مەبەستی شتێك ئاشکرا بکا کە زوتر ناوی هاتبێ. یاخود دەتوانێ ناسراوی بەدیار بخا... لە لکاندنیدا بە وشەوە، بە گوێرەی باری فۆنەتیکی زمانەکەمان گۆڕانی بەسەردا دێ... هتد.

(ە)ش هەروەك (ەکە)، نیشانەی ناسیاوییە و بە ناو و ئاوەڵناوەوە دەلکێنرێ، بەڵام لە واتا و بەکارهێناندا جیاوازیان هەیە... هتد.

نیشانەی نەناسیاوی لە زمانی کوردیدا زۆر ئاڵۆزە، لەبەرئەوە لێکۆڵینەوەی دو رو درێژ و تەواوی دەوێ. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا لە لێکۆڵینەوەماندا ئەوەمان بۆ ئاشکرا بووە، کە لە ناوچەی سلێمانی و موکریان... (ێك) و (ێ) نیشانەی نەناسیاوین. هەرچی (ێ)یە گومانی لێ ناکرێ کە کورت کراوە و تەخفیفی (ێك)ە. لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو و گەلێك ناوچەی سۆراندا (ەك) نیشانەی نەناسیاوییە. لە هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجی ژوورووی (نە)ش هەر بۆ نەناسراوی بەکاردێنن... نیشانەی نەناسیاوی لە زمانی کوردیدا جگە لە نەناسراوی (مجهولیە)، هەروەها تاکایەتی (افرادیە)یش نیشان دەدا و، بەگوێرەی باری فۆنەتیکی زمانەکەمان گۆڕانی بەسەردا دێت... هتد"[٥٦]".

---

[٥٦]- لێرەدا زۆر بە کورتی چەند زانیاریەکی کەمم دەربارەی نیشانەی ناسیاوی و نە ناسیاوی خستۆتە پێش چاو. بۆ زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: ئەو باسەی لە فەسڵی دووەمی ئەم کتێبەدا لە بارەی نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوییەوە کراوە.

نموونەیەکی دیکە لەو باسانەی کە دەبوو لە بەشی ناودا لێی بدوێن مەسەلەی (تاك و کۆ)یە، کە پێوەندییەکی بەهێز و زۆری لەگەڵ ناودا هەیە، بەلاَم لیژنە نەك هەر لە باسی ناودا لێی نەدواوە، بەڵکو لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی بەلای ئەو کێشەیەدا نەچووە. ئەگەر وەلاَمی لیژنە ئەوەبێ کەباسی (ان)ی کۆ دەخاتە باسی نیشانەکەوە، ئەوە چارەسەرکردنی ئەو کەم و کورتییە بەوە ناکرێ، چونکە مەسەلەی (تاك و کۆ) تەنیا نیشانەی (ان) نییە، بەڵکو زۆر شتی دیکەی لەگەڵە... جا هەرچەندە مەسەلەی کۆ پێوەندی لەگەڵ هەندێ بەشی تری ئاخاوتن هەیە، دەبوو بەتایبەتی لە بەشی ناودا باس بکرێ.

ئەو جۆرە پرۆگرامە بەلای منەوە تەواو نییە، کە لە بەشی ناودا باسی ئەو پێشگر و پاشگرانە نەکرێن کە ناو دادەڕێژن، چونکە نیازیان وایە بە باسێکی سەربەخۆ لێی بدوێن، یاخود باسی تاك و کۆ نەکرێت، چونکە (ان)ی کۆ لەگەڵ باسی نیشانەکاندا دەبێ... بۆ ئەو وەلاَم و نیازەی لیژنە لە باسی وشەی داڕێژراودا هەندێ ڕاستیم دەربڕی. لێرەدا هەندێ بەڵگەی دیکە خۆیان دێننە پێشەوە:

بۆ زیادە سەلماندنی ئەمە هەندێ نموونە لە بەشەکانی دیکەی ئاخاوتنی لێکۆڵینەوەکەی لیژنەوە دەهێنینەوە:

لە باسی (کردار)دا، گومان نییە کە گەلێك کێشەی گرنگ شی کراوەتەوە و باس کراوە، وەك: کرداری تێنەپەڕ و تێپەڕ (ل ٩٥ — ١٢٩)، کرداری کارا دیار و کارا بزر (ل ١٢٩ — ١٤٦)، کرداری یاریدەر (ل ١٤٦ — ١٥٦)...هتد.، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کێشەی گرنگ هەن کە لەژێر سەرباسی

تایبەتیدا باسیان لێوە نەکراوە. بەوێنە دەربارەی ڕەگی کردار و قەدی کردار کە باسێکی سەرەکی کردارە لە ژێر سەرباسێکی سەربەخۆدا بەرچاو ناکەوێ، کەچی ئەگەر تەماشای هەندێ لەو کتێبانە بکەینکە بۆ قوتابخانەکان دانراون"[٥٧]"و سەرچاوەی کارەکەی لیژنەن، ئەوە بەباشی ئەو باسە دەبینین. ڕاستە لە هەندێ شوێندا لیژنە ناو ناوە باسی ڕەگ و قەدی کرداری کردوە، وەك لە لاپەڕە(١٣٠و ١٤٥و...)دا کە باسی کرداری کارا دیار و کرداری کارا بزرە، وا پێویست بووە کە ئاوڕ لە ڕەگ و قەدی کردار بدرێتەوە، بەلاّم ناتوانرێ ئەو جۆرە ئاوڕدانەوەیە بە باسی سەربەخۆ و تێر و تەسەلی ڕەگ و قەدی کردار دابنرێ. سەرەڕای ئەوەش کورد وتەنی ((بەرد لە شوێنی خۆی سەنگینە))...

هەروەها لە باسی ((کار لەڕووی زمانەوە(کاتەکانی کار))دا (ل ١٥٦ — ٢٣٢) لە سەرەتادا کە ڕای نووسەرانی کورد خراوەتە ڕوو، کاتی ڕابردوو (ماضی) و ئێستا (حال) و ئایندە (مستقبل) دیاری کراون. لە دواییدا بە دور و درێژی و زانستییانە لە کاتی ڕابردوو و ئیستای کۆڵیوەتەوە. کەچی ئەوەی سەرنج ڕابکێشێ، ئەوەیە لەکاتی ئایندە"[٥٨]" نەدواوە. بۆ؟ هەرچەندە کاتی

---

[٥٧] - بەوێنە، بڕوانە: کتێبی ((زمان و ئەدەبی کوردی)) بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٥٦ — ٦٦.

[٥٨] - ڕەنگە خوێنەر وا تێ بگات کە لیژنە لە لاپەڕە(١٩٩ — ٢١٨)دا لەکاتی ئایندە دواوە. ئەویش هۆی ئەوەیە کە لیژنە زاراوەی (ئایندە)ی بۆ (مضارع) داناوە. کەچی لە سەرەتای باسی (کردار)دا ئەوە دەردەکەوێ، کە زۆربەی نووسەرانی کورد زاراوەی (ئیستا)یان بەرانبەر (مضارع) بەکارهێناوە (بڕوانە: ل ١٥٦). مامۆستا صادق بەهائەدین و د. نەسرین فەخری کە دوو ئەندامی لیژنەن، لەکاتی دەربڕینی بیروباوەڕیاندا هەر زاراوەی (ئیستا)یان وتوە (بڕوانە: ل ١٥٨ — ١٦١). ئەنجومەنی کۆڕیش لە بەشی زاراوەکانی زماندا، دیسان زاراوەی (ئیستا)ی

ئاینده لە كرمانجی خوارووداِ سستە و ئەم ڕێژەیە هەر لە كرمانجی ژووروودا هەیە، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا، بەلایەنی كەمەوە دەبوو پوختەی ئەو خستنەڕووەی لە سەرەتای باسی كرداردا كراوە و ئەو دوو لاپەڕەیەی مامۆستا صادق بەهائەدین و ئەو بیروڕایەی ئەندامان دواتر تۆمار كراون، لە ژێر سەرباسی كرداری ئاییندەدا كۆبكرانایەوە.

تاكو ئەم شوێنە بەكورتی لەو كەم و كورتی ناتەواوییانە دواین، كە لە بەشی (ناو)دا — واتە لەو باسەی لە لاپەڕە ١٠وە تا ٢٦ی كتێبی ناوبراودا چاپ بووە.

هەرچەندە ناو ناوەش سەرەتاتكێ لەگەڵ بەشەكانی دیكەی ئاخاوتن كراوە، بەلاَم پێویست ئەوەی هێناوەتە كایەوە، دەنا وەنەبێ ئەوە باسی تەواوی بەشەكانی دیكەی ئاخاوتن بن"[٥٩].

دەربارەی ئەو كارەی لیژنە، مامۆستا صەباح غالب لە چەند ژمارەیەكی ساڵی ١٩٧٧ی ڕۆژنامەی((هاوكاری))دا زنجیرەیەك وتاری بەناوی ((كتێبی (ڕێزمانی ئاخاوتنی كوردی) لە بەر تیشكی لێكۆڵینەوەدا)) بلاَو

پەسەند كردووە (بڕوانە: لیستەی چوارەمی زاراوەكانی كۆڕ)... جا لەبەر هەر هۆیەك بێت، بەكارهێنانی (ئاینده) بەرامبەر بە(مضارع) بەڕاست نازانم.

[٥٩] - چۆن ڕای خۆمان لەبارەی (ناو)ەوە دەربڕی، هەربەو جۆرەش لە هلێكی تردا بەرانبەر تێكڕای ئەو بەشانەی دیكەی ئاخاوتن، كە لە كتێبی((ڕێزمانی ئاخاوتنی كوردی بەپێی لێكۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەكانی))دا باس كراون، دەردەبڕین. جگە لەوەش هەندێ سەرنجیش كە پێوەندیان بە هەڵەی چاپ و ئیملا و شێواز و زاراوە و ڕێكخستنی پێرست...ەوە هەیە باس دەكەین.

کردۆتەوە"[٦٠]. نووسەری ئەم وتارە لەگەڵ ئەوەدا کە گەلێك ڕووی چاك و سەرکەوتووی نووسراوی ناوبراوی نیشان داوە و نرخی زانستی داوەتێ، هەروەها چەندین کەم و کورتی و ناتەواویشی خستۆتە پێش چاو و بەپێی توانست هەوڵی داوە چارەسەریان بکا و جێیان پڕبکاتەوە... لە ڕاستیدا مامۆستا صەباح کارێکی گرنگی کردووە و پێوەی ماندوو بووە و ئەنجامی باشی وەدەست هێناوە... بەڵام بەداخەوە لە هەندێ شوێن و باسدا بە هەڵە چووە. ئێمەش لێرەدا بەشێك لەو تێبینی و سەرنجانەی دەربارەی بەشی (ناو)ی"[٦١] ڕەخنەی ناوبراو هەمانە دەخەینە ڕوو.

مامۆستا صەباح ڕەخنەی لەو پێناسەیە گرتووە کە لیژنە بۆ ناوی داناوە: ((ناو ئەو وشەیەیە سەربەخۆ واتایەك دەگەیەنێت کە بە کاتەوە نەبەستراوە))..

ڕەخنەگر لەوەدا زۆر ڕاستە کەدەڵێ: ئەگەر لەو پێناسەیە بیر بکەینەوە هەموو چاوگەکانی زمانی کوردیش دەگرێتەوە، چونکە چاوگیش وشەی سەربەخۆیە و مانایەکیش دەگەیەنێت...(ل٤). بەڵام دەبوو ئەوەش لەیاد نەکات کە هەندێ بەشی دیکەی ئاخاوتنیش، وەك(ئاوەڵناو، جێ ناو، ژمارە) هەر وشەی سەربەخۆن و ماناش دەگەیەنن.

---

[٦٠] - بڕوانە: ڕۆژنامەی ((هاوکاری))، بەغدا، ١٩٧٧، بەشی یەکەم، ژ٣٦٥، ل٤، بەشی دووەم، ژ ٣٦٦، ل ٤و ١١، بەشی سێیەم (ئەم بەشەی وتار چاپ نەبووە... ئێمە دەستنووسەکەیمان بینیوە)، بەشی چوارەم، ژ٣٦٨، ل ٤و ١١، بەشی پێنجەم، ژ٣٦٩، ل ٤و ١١، بەشی شەشەم، ژ٣٧٠، ل ٤، بەشی حەوتەم، ژ٣٧١، ل ٤و ١١، بەشی هەشتەم، ژ٣٧٢، ل ٤و١١.

[٦١] - بەشی دووەم و سێیەمی وتارەکەی مامۆستا صەباح باسی ناوی گرتۆتەوە — واتە ئەوەی لەژمارە ٣٦٦دا چاپ بووەو ئەوەی بەرچاپ نەکەوتووە.

مامۆستا صباح لە بەردەوامی ڕەخنەی پێناسەی ناودا نووسیویێتی: کۆڕکە دەڵێ ((ناو ئەو وشەیەیە مانای یەك وشە دەگەیەنێ))، کەچی ئێمە ناومان هەیە لە وشەیەك زیاتر پێك هاتووە. جا ئەو زیادیەش هەرچییەك بێ کە پێناسەش بۆ شتێك دادەنێن دەبێ وەك شتێکی گشتی هەموو لایەنەکانی بگرێتەوە. ئەو پێناسەیەی کۆڕ تەنها ناوی سادە دەگرێتەوە و ناوی ناسادەش بە هەردوو بەشەکەیەوە — داڕێژراو و لێکداراو — وەبەر ناکەوێ، ئەمەش ناتەواوییەکی گەورەیە و چاوپۆشی لێ ناکرێ... (ل٤). بەداخەوە ڕەخنەگر لەسەر پاکی ئەو چەند دێڕەی سەرەوەدا بەهەڵە چووە. بەر لە هەموو شتێك لیژنە لە پێناسەی ناودا نەیوتووە: (ناو ئەو وشەیەیە مانای یەك وشە دەگەیەنێ)). ئیتر نازانم مامۆستا صەباح چۆن لە نێو دوو کەوانی گچکەدا ئەو وتەیەی کردووە بە موڵکی لیژنە...

هەروەها هەڵەی بەرچاویش ئەوەیە ڕەخنەگر وا تێگەیشتووە، لەبەر ئەوەی وشەی ناسادە لە وشەیەك زیاتر پێك هاتووە، بۆیە بەڕاستی نازانێ کە لە پێناسەی ناودا بوترێ ((ناو وشەیەکە...)). وای بۆ چووە، ئەگەر وا بوترێ، ئەو سا تەنیا (ناوی سادە) دەگرێتەوە. وشەی (وشە) مانایەکی گشتی هەیە و هەموو جۆرە وشەیەك — سادەو داڕێژراو لێکدراو — دەگرێتەوە. کە دەوترێ (وشەیەك)، ئەوە مەرج نییە ئەو وشەیە هەر سادەبێ. دەمێ دەبێ بیر بۆ ئەوە بچێ، کە دیاری بکرێ. هەرچەندە وشەی داڕێژراو و لێکدراو لە وشەیەك زیاتر پێك دێن، بەڵام لە ئەنجامدا هەر دەبنە یەك وشە، بەڵام وشەیەکی سادە نا، بەڵکو ناسادە.

ئەو چەند هەڵەیە، ڕەخنەگریان بەرەو ئەوە بردووە کە ئەو پێناسە نەگونجاو و نالەبارەی خوارەوە بۆ ناو دابنێ: ((ناو وشەیەکە یا لە وشەیەك زیاترە (ئەو زیادیەش وشەیەکی سەربەخۆ یا هەرشتێکی دی بێ) واتایەکی سەربەخۆ دەگەیەنێ و مانای کاری تێدا نییە)) (ل٤). وەك وتمان کە دەوترێ (وشەیەکە) ئەوە چۆن سادە، هەروەها داڕێژراو و لێکدراویش دەگرێتەوە... بەڵام کە دەوترێ (لە وشەیەك زیاتر)، ئەوە لێرەدا زەین بۆ دەستەواژەیەك یاخود ڕستۆکێك دەچێ... سەرەڕای ئەوە، ئەو پێناسەیە (ئاوەڵناو، جێناو، ژمارە، چاوگ)یش دەگرێتەوە. کەچی لە سەرەتادا ڕەخنەیەکی لە پێناسەی لیژنە ئەوە بوو، کە چاوگەکانی زمانی کوردیش دەگرێتەوە. ڕەخنەگر لەو ڕووەوە باش هەستی بە ناتەواوی کردووە، بەڵام دەرسی لێ وەرنەگرتووە.

ڕەخنەگر کە دەڵێ: ((لیژنەی زمان لە لاپەڕە ١٣دا کە زاراوەی ناسادە لای حەوت زانای کورد دەڵێتەوە باس دەکا، ئەوەیان لەیاد کردووە کە، سەعید صدقی و تۆفیق وەهبی و...بەهیچ جۆرێك هەر لە بنەڕەتدا — مەسەلە ناوی ناسادە لای ئەوان هەر نەبووە —...وە هەردوو بەشەکە لێکدراو و داڕێژراویان هەر بە لێکدراو زانیوە، بۆ ئەمە تکایە سەرلەنوێ بە کتێبەکانی ئەو نووسەرانەدا بچنەوە)) (ل٤)، ئەوە باش هەستی بە ناتەواوی لیژنە کردووە کە ئەویش مامۆستا تۆفیق وەهبیە و لە کتێبی ((دەستووری زمانی کوردی))دا بەڕێك و پێکی جیاوازی لە نێوان ناوی داڕێژراو و لێکدراودا (کە ناوی دروستکراو و ناوی لێکدراوی پێ وتوون) داناوە (بڕوانە: ل ٥٠ — ٥٨)و گەلێك ڕووی ئەو کێشەیەی خاو کردۆتەوە. جا منیش تکام لە ڕەخنەگر ئەوەیە، ئەویش سەرلەنوێ بە کتێبی ناوبراوی مامۆستا وەهبیدا بچێتەوە.

لەگەڵ ڕای ڕەخنەگردام، کە لیژنە دەبوو چۆنیەتی ناوی داڕێژراو و لێکدراو بە دوورو درێژی شی بکاتەوە... ئنجا دەڵێ: ((ئێمە وا ئەوەندەی لە مەودای زانیاری و ماوەماندا هەبێ لە چۆنیەتی دروست بوونی ناوی لێکدراو و ناوی داڕێژراو دەدوێین، بەو هیوایەی بە هاوکاری کوردی زانەکان دەستێکی پاکی و پوختەکردنی پێدا بێ و کەلێنێکی گچکە پڕبکاتەوە))...

دواتر لە شێوەی دروست بوونی ناوی لێکدراو لە زمانی کوردیدا دواوە. لێرەدا ناچارم کەمێك لەو قوتابییە خۆشەویستەم و ئەو هاوڕێ بەڕێزەم زویر ببم لەسەر ئەوە کە دەربارەی شێوەی دروست بوونی ناوی لێکدراو موحازەرەکانی منی بە هەندێ دەستکارییەوە بڵاو کردۆتەوە و کردوویەتی بە موڵکی خۆی و منیش ناوم لە کوولەکەی تەڕیشدا نەهاتووە... هەروەها لەو وتارەدا ئاشکرا ئەوەش بەدی دەکەم کە هەندێ شت لە موحازەرەکانی مامۆستا موحەمەد مەعرووفەوە وەرگیراوە و ئەوانیش لە خاوەنی ڕاستەقینەیان سەنراون... بێگومان، ئەمە نەك هەر لە زانستدا، بەڵکو لە هیچ مەودایەکدا ڕەوا نییە.

وەك وتم هەندێ دەستکاری کەرەستەکەی منی کردووە، ئەویش بەتایبەتی لە لابردنی چەند نموونەیەك و دانانی هی دیکە لە جێگەیان. جا هەر ئەمەشە بووەتە هۆی ئەوەی جارجارە لە نووسراوەکەیدا نموونەی نەگونجاو دەبینرێ. وەك: وشەی ((پەڕۆ کۆن)) کە بە نموونە هێناویەتەوە و گوایە لە دوو ناوی سادە پێك هاتووە، بەڵام لە ڕاستیدا لە (ناو+ ئاوەڵناو) دروست بووە. واشی داناوە کە وشەی ((ترش و شیرین)) لە ئاوەڵناو + و + ناو) ساز بووە. واتە ((شیرین)) بە ناو تێگەیشتووە... لێرەدا وشەی

((شـیرین)) ئاوەڵنـاوە نـەك نـاو. وشـەی ((دۆڵاو دۆڵ))، ((شـیواو شـیو)) ((بەرانبەر))یش کە ئاوەڵکردارن، بە ناوی داناون... ئەمانە و هەندێکی تر.

بەشی سێیەمی وتاری ناوبراو دەربارەی (وشەی داڕێژراو)ە. لە سـەرەتادا هەندێ زیادی خستۆتە سەر پێناسـەی لیژنـە و ئنجا لـە چۆنیەتی دروست بوونی ناوی داڕێـژراو دواوە... لیژنـە بـۆ نـاوی داڕێـژراو وتوویـە: ((ئـەو نـاوە ناسادەیەیە کە تەنیا وشـەیەکی واتـاداری تێـدابێت)). زیادییەکـەی مامۆسـتا صەباحیش ئەوەیە کە دەڵـێ: ((وە هەنـدێ جار هەیـە لـە دوو ڕەگـی فرمـان وەك (هات و چۆ) یا وەك (پچڕپچڕ) دروست دەبێ)) (دەستنووس))..

لە ڕاستیدا کەم و کورتی پێناسەکەی لیژنە لەوەدایە، کە دەبوو ئەوەشـی لەگەڵ یادداشت بکردایە، کە پێشـگر و پاشـگر لـە ڕۆنانیـدا دەورێکـی گـەورە دەبینن — واتە ڕاسـتتر وایـە لـە پێناسـەی نـاوی داڕێـژراودا بڵـێین: ((وشـەی داڕێژراو — ئەو وشە ناسادەیەیە کـە لـە وشـەیەکی سـادە و زیـادی پێـك دێ. ئەوجا زیادییەکە پێشـگر یـا پاشـگر یـا هـەردوو (پێشـگر و پاشـگر) پێکـەوە دەبن))..

هەرچـی مامۆسـتا صـەباح غالبـە بـەهۆی بینینـی هەنـدێ وشـەی سەرنجڕاکێش و بێ ئاگایی لە هەندێ مەسەلەی زانستی زمـان، بـە ئـارەزووی خۆی پێناسەیەکی وای هێناوەتە ناوانـەوە، کـە نـە لەگـەڵ هەڵکـەوتی زمـانی کوردیـدا و نـە لەگـەڵ بـاری زانسـتی زمانـدا دەگـونجێ... بـەڵێ هـەر زمانێـك خـاوەنی ڕێزمـانی خۆیـەتی و ڕێزمـانیش وەك زانسـتێك لـە سـەر کەرەستەی چەسپاوی ئەو زەمانە هەڵدەچنرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، وەك ماددەیـەکی زانسـت ڕێزمـانی گشـتی هەیـە، ئـەویش کـە مەبەسـتی ڕێکخسـتنی شـێوازی

گشتییە لە لێکۆڵینەوەی پێکهاتنی ڕێزمانیدا. هەرچەندە هەر زمانە خاوەنی کەرەستەی تایبەتی و شێوەی جیاواز و بەکارهێنانی سەربەخۆیە و ئەو تایبەتییانە لە زمانانی جیاوازدا دەبینین، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بنەما هەن کە پێویستە بخرێنە نێو بناغەی لێکۆڵینەوەی پێکهاتنی ڕێزمانی هەموو زمانێکەوە. جا لە سەرێکەوە دەمەوێ مامۆستا صەباح غالب ئاگادار بکەم، ئەگەر وشەیەك پێشگر یا پاشگری پێوە نەبێ لە ڕیزی داڕێژراودا دانانرێ... لە سەرێکی تریشەوە ئەو ناوە لێکدراوانەی ئەو داڕێژراوی دانەتە قەڵەم، وەك (دارتاش، هات و چۆ، گفت و گۆ...) بێگومان لێکدراون، چونکە ڕەگ و قەدی کردار هەڵگری مانای کردارن.

دواتر ڕەخنەگر لە جۆری پێکهاتنی ناوی داڕێژراو دواوە. لە سەرەتادا هەندێ حاڵەتی ناوی لێکدراوی بە داڕێژراو داناوە و ئنجا دەڵێ: ((کۆمەڵێ پاشگر هەن ناوی داڕێژراو دروست دەکەن کە ئەمانەن:)) (دەستنووس) و حەڤدە جۆری دیاری کردووە. باسی ئەو پاشگرانەی کە هاریکاری ناوی داڕێژراو دەدەن، پڕ ناتەواوی و کەم و کورییە. ئەمە کە کاکڵی وشەی داڕێژراوە، دەبوو لێکۆڵینەوەیەکی ڕاست و فراوان بێت، بەلام بەداخەوە لە هەموو بەشەکانی دیکە زیاتر هەڵەی تێدایە و لە سنورێکی تەسك دەرنەچووە...

مامۆستا صەباح غالب ژمارەیەك نیشانەی، وەك: (ان) — ((پیاوان...))، (ات) — ((مالات))، (گەل) — ((کوڕگەل...))، (ەکان) — ((کچەکان...))، (ەها) — ((هەزارەها...))، (ەکە) — ((کتێبەکە...))، (ێك) — ((پیاوێك...))، (ە) — ((کوڕە...))ی وەك پاشگری وشەداڕێژ تەماشاکردووە. ئاشکرایە کە

هیچ یەکێك لەو نیشانانە کەرەستەی ڕۆنانی وشەی داڕێژراو نین. ئەوانە مۆرفیمی وشەگۆڕن و هەڵەیە ئەگەر لەگەڵ مۆرفیمی وشە داڕێژدا تێکەڵ بکرێن"[٦٢]..

هەرچی پاشگری وەك: (گەر)، (سان)، (چی)، (بەند)...و گەلێکی تر هەن کە دەچنە سەر وشەیەك، ئەوە لە ڕێگەی ئەوانەوە وشەیەکی نوێ دێتە کایەوە، بەڵام نیشانە تەنیا مانای نیسبی دەگەیەنێ. ئێمە لە فەرهەنگی زماندا ((ئاسنگەر، دانسان، چایچی، ناڵبەند...)) وەك وشەیەکی فەرهەنگی تۆمار دەکەین، بەڵام ((پیاوان، پیاوەکە، پیاوێك، پیاوە...)) وەك کۆمەڵی یەکەم موعامەلەیان لەگەڵ ناکەین. دەربارەی ئەم بەشەیان دەتوانرێ لە سەرەتادا یاخود لە بەشی ڕێزماندا هەندێ زانیاری بدرێ... بەڵام کۆمەڵی یەکەم نە سەرەتا و نە بەشی ڕێزمان پێیان ناکرێ بیان گرنە خۆیان.

بەم چەشنە دەبینین لەو حەڤدە جۆرە ناوی داڕێژراوەی ڕەخنەگر دیاری کردوون، هەشتیان ڕاست نین، ئەویش وەك لەسەرەوە ڕونمان کردەوە، چونکە نیشانەن و نیشانەش هاوبەشی لە وشەی داڕێژراودا ناکات... هەرچی نۆ جۆرەکەی دیکەن: (گەر، دار، ساز، بەند، چی، وان/ ەوان، باز، کەر، ی) نموونەی ڕاست و گونجاون، بەڵام لە زمانی کوردیدا نەك تەنیا ئەو نۆ پاشگرەی مامۆستا صەباح ناوی بردوون، بەڵکو دەیان پاشگری دیکەش هەن کە کەرەستەی ناوی داڕێژراون، وەك: (مەند، ەتی، ێتی، ایەتی، ێنی، گا، گە، ستان، خانە، دان، ەن، جاڕ، ەوار، لان/ ەلان، زار، ێن، ێنە، ینە، وانە،

---

[٦٢] - دەربارەی جیاکردنەوەی (نیشانە و پێشگر و پاشگر)، بڕوانە: د. ئەورحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٣٦ — ٤٠.

ك – ik، کە، گار، وەر/ ەوەر، ین، وور، ەوا، انە، ەمەنی، اك، ندە، ار، یار، مان، ۆکە، ەك... و گەلێکی تر). جا ئەو چەند حاڵەتە کەمەی ڕەخنەگر ناوی هێناون نابنە باسی تێرو تەسەلی ئەو کێشەیە و کەلێن پڕ ناکەنەوە. هەروەها ڕەخنەگر تەنیا بۆ ئەوە چووە کە هەندێ پاشگر دەچنە سەرناوی سادەو دەیانکەنە داڕێژراو، بەڵام ئەوەی بەبیرا نەهاتووە، کە دەچنە سەر (ئاوەڵناو و کردار و ئاوەڵکردار)ی سادەش لە ئەنجامدا ناوی داڕپژراویان لێ ساز دەکەن. مامۆستا صەباح بۆ ئەوەش نەچووە کە جگە لە پاشگر، چەند پێشگرێکیش هەن، یاریدەی ڕۆنانی ناوی داڕێژراو دەدەن وەك: (پێ، ڕا، بەر، هاو...).

بەم چەشنە مامۆستا صباح غالب لە کتێبی ((ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی))دا، نەك هەر هەستی بە زۆرەبەی ناتەواویەکانی بەشی ناو نەکردووە، هەستی بە ناتەواوییەکانی بەشەکانی دیکەشی"[٦٣]" نەکردووە و گەلێك کێشە و باسی گرنگ هەن، بەلایانا نەچووە و"[٦٤]" لە لێکدانەوە و لێدوانی گەلێ کێشە و باسدا بە هەڵە چووە.

لە کتێبی ((زمانی یەکگرتووی کوردی))ی د. جەمال نەبەزدا"[٦٥]" چەند کورتە باسێکی وا بەرچاو دەکەوون کە پێوەندییان بە (ناو)ەوە هەیە، وەك: (نیرومێ (ل ٢٧ – ٢٨)، ئامرازی ناسینەوە (کە) (ل ٢٨)، ئامرازی کردنە گەل(ل ٣٠)، پاشگری نێوی تاك (ل٣٢).

---

[٦٣] - بەداخەوە لێرەدا ڕێگەی ئەوەمان نی یە تێکڕای وتارەکەی هەڵسەنگێنین.

[٦٤] - بە وێنە زۆربەی زۆری ئەو تێبنی یانەی ئێمە لە لاپەڕە (٤١ – ٥٦)ی ئەم کتێبە دەربارەی بەشی ناوی ئەوکارەی لیژنە نیشانمان داوە، مامۆستا صباح ناوی نەبردوون.

[٦٥] - جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ، ١٩٧٦.

د. نەبەز لە سەرەتای باسی (نێرو مێ)دا نووسیویێتی، دەڵێ: (مەبەستی کرمانجی خواروووە – ئەوڕەحمان)ە، وە وەك زمانە ئێرانیە کۆنەکان، ڕەسەنی نێرو مێ لە یەك جیا دەکاتەوە))"[٦٦]". هەرچەندە ئەوەی مامۆستا نەبەز وتوویە ڕاستە، بەڵام بۆ سەلماندنی ئەو ڕایەی دەبوو لەو بارەیەوە کورتە گەشتێك بە زمانە ئێرانییە کۆنەکاندا بکات و هەندێ نموونە بهێنێتەوە و هەروەها نیشانی بدات کە چ گۆڕانێك ڕووی داوە"[٦٧]".

نووسەر پاش دوو دێڕ و نیو باسی (نێرو مێ)، هاتۆتە سەر لێکۆڵینەوەی کێشەی نێر و مێ لە دۆخی ئیزافەدا. لێرەدا ئەوەی دەستنیشان کردووە، کە لە دۆخی ئیزافەدا ئەگەر (مضاف) مێ بێ نیشانەی (ا) وەردەگرێ، وە ئەگەر نێر بێ نیشانەی (ێ)ی پێوە دەلکێ. دواتریش دەڵێ: ((ئەگەر دوا تیپی"[٦٨]"(مضاف) تیپێکی دەنگدار (حرف علة) بوو، وەك (دا) و (برا)، ئەوا ئامرازی خستنە پاڵ دەبێتە (یا Ya) ئەگەر (مضاف) مێ بێ و دەبێتە (یێ Yê) ئەگەر (مضاف) نێربێ...)). "[٦٩]"

---

[٦٦] – هەمان سەرچاوە ل٢٧.

[٦٧] – سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٧.

[٦٨] – لە باسی (جنسەکانی ناو)دا بەدوورو درێژی لەو کێشەیە دواوین.

[٦٩] – د. نەبەز لە زۆربەی نووسینەکەیدا(دەنگ)ی بە (پیت)(کەئەو تیپی پێ وتووە) ناو بردووە. ئەم هەڵەیەی لەسەر پاکی کتێبەکەیدا کوتاوەتەوە. بێگومان، جێگەی ڕەخنەیە کەوا لەو بەدیهییە بێ خەبەرە و مەفهوومی (دەنگ) و (پیت)ی واتێکەڵ کردووە و لە یەکتری جیا نەکردوونەتەوە. وەك ئاشکرایە (دەنگ) لە ڕێگەی ئەندامەکانی ئاخاوتنەوە دەردەبڕدرێت و بەهۆی بیستنەوە هەستی پێ دەکرێ. (پیت) وێنەی دەنگەکە بە نیشانە لە نوسیندا دیارکراوە و بەهۆی بینینەوە وەردەگیرێ. بەم جۆرە نووسەر کەرەستەی ئاخاوتنی تێکەڵ بە کەرەستەی نووسین کردووە. واتە دەنگەکانی ئاخاوتن کە لە زارەوە دەردێن لەگەڵ کەرەستەی نووسین بە یەك شت تێ گەیشتووە.

ڕاستە، نووسەر بۆ ئەوە چووە کە لە دیالێکتی ژووروودا لە حاڵەتی ئیزافەدا نیشانەی (ا) بۆ مێ نیشانەی (ێ) بۆ نێر دەخرێتە پاڵ (مضاف)، بەڵام هیچ چەشنێك ناوی دوو نیشانەی (ە)و (ی)ی نەهێناوە، کە ئەمانیش لە دیالێکتی ناوبراودا ئیزافە ساز دەکەن"[٧٠]".

سەرەڕای ئەوە لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا هەڵەیەکی گەورە دەبینرێ، ئەویش ئەوەیە کە نووسەر وا تێگەیشتووە ئەگەر دوا دەنگی (مضاف) بزوێن بێ، ئەوا نیشانەکانی ئیزافەی (ا) و (ێ) دەبنە(یا) و (یێ). ڕاستی ئەوەیە کە لە زمانی کوردیدا دوو بزوێن بە یەکەوە نایەن — واتە بزوێن بەدوای بزوێندا نایەت. جا بۆ تێپەڕاندنی ئەو قۆرتە یا بزوێنێك تێ دەچێ یاخود یەکێك لەو دوو نیمچە بزوێنە (ی — Y، و — W) دێنە گۆڕێ. بێتو لە دۆخی ئیزافەدا (مضاف) کۆتایی بە دەنگی بزوێن هاتبێ، ئەوە لەنێوان وشە و نیشانەکەدا نیمچەبزوێنی (ی — Y) پەیدا دەبێ، بۆیە د. نەبەز لەو حاڵەتەدا نیشانەکان بە (یا) و (یێ) تێگەیشتووە، هەڵەیەکی زانستی گەورەی بەسەردا تێپەڕیوە.

پاش ئەوەی بە دە دێڕی پڕ کەم و کورتی و پڕ هەڵە لە باسی نێر و مێ لە دۆخی ئیزافەدا بووەتەوە، ئینجا بە چەند دێڕێك باسی نێر و مێی لە

بەوێنە لە لاپەڕە (٦٥)دا لە یەکەم دێڕی ژێر سەرباسی ((دەنگی (ك) و (گ)...))ەوە دەڵێ: ((کاتێك تیپی بێدەنگی (ك) و (گ) لە وشەیەکدا پێش هێندی تیپی دەنگدار بکەوێ، بە تایبەتی(ئی — Î) و (ئێ — ê) ئەو کاتە دەنگەکانیان نەختێك نازك دەبێتەوە)). لە سەر باسدا دیارە کە دەیەوێ لە (دەنگ) بدوێ، کەچی لە یەکەم دێڕی باسەکەدا دوو جار (تیپی) لە جێی (دەنگ) بەکار هێناوە. دوای ئەو هەڵەیە ئینجا لە دێڕی دووەمدا (ك) و (گ) بە دەنگ ناو دەبا. لێرەدا سەرنجڕاکێش ئەوەشە کە (ی، ێ، وێ)ی بە (ئی، ئێ، ئۆی) ناوبردووە، واتە بە ناوی پیتەکانەوە، دەنگەکانی ناو ناوە.

[٧٠] - بڕوانە ئەو باسەی لەم کتێبەدا دەربارەی نیشانەکانی ئیزافە کراوە.

(دۆخی کەسی سێیەم) و (لە دۆخی بانگهێشتن)دا کردووە. لەم شوێنەشدا گەلێ ناتەواوی بەرچاو دەکەوون.

تێکڕای باسی (نێرومێ) کە لە کتێبی ناوبراودا کەمێ پتر لە لاپەڕەیەکی گرتۆتەوە، نەك کەم و کورتی و هەڵەی زۆر تێدایە، بەڵکو نووسەر بەلای گەلێ کێشەی گرنگ و پێویستی ئەو باسەدا هەر نەچووە. کێشەی جنس لە زمانی کوردیدا کە باسێکی ئێجگار فراوان و بەرینە، پێویستی بە چەندین لێکۆڵینەوەی تەواو زانستیانەیە... لە ئەنجامدا پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشم، کە ئەو چەند دێڕە پڕ هەڵە و ناتەواوییەی مامۆستا نەبەز لەبارەی (نێرو مێ)وە نووسیوێتی، نەك هەر شتێکی ئەوتۆ نییە، بەڵکو نیشانیشی نەپێکاوە.

بە تەواوبوونی باسی (نێرو مێ) لە باسی (نیشانەی ناسیاوی — ەکە —)دواوە، کە لەژێر سەرباسی ((ئامرازی ناسینەوە (کە)))دا جێی کردۆتەوە"[71] "... ئەم بەشەش، هەروەك باسی (نێرو مێ) پڕ هەڵە و ناتەواوییە. تێکڕای ئەو چەند دێڕەی لەو بارەیەوە نووسیوێتی پێویستی بە پێداچوونەوەیە. ئێستاش بۆ زێدە ڕوونکردنەوە، با تەماشای ئەو چەند دێڕە بکەین کە د. نەبەز نووسیوێتی:

((ئامرازی ناسینەوە (کە) — اداة التعریف (کە) ئەگەر بمانەوێت لە شێوەی کرمانجیی نێوەڕاستدا نێوێکی نەناسراو (اسم نکرە) بکەین بە نێوێکی ناسراو (اسم معرفە)، ئەوا تەماشای دوا تیپی وشەکە دەکەین، ئەگەر هاتوو بە تیپێکی بێدەنگ کۆتایی هاتبوو، ئەوا پاشگری (ەکە eke)ی دەخرێتە پاڵ

[71] - سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٨.

وەك بەرد — بەردەکە (= بەرد + ەکە). خۆ ئەگەر دوا تیپی وشەکە دەنگدار بوو ئەوا یا پاشگری (کە ke)یا (یەکە yeke)ی دەخەینە پاڵ))"[72].

هەرچەندە بەرانبەر ئەو وتانەی نووسەر هەندێ تێبینی لاوەکیم هەیە، بەڵام لێرەدا تەنیا لەوانە دەدوێم کە پێوەندیان بە باسەکەوە هەیە:

١– لە سەر باسدا نووسەر بە (ەکە)ی وتووە ئامراز و دواتر بە پاشگری داناوە. پێویستە ئەو ڕاستییە لە بیرنەکەین کە (ەکە) لە ڕووی ڕێزمانەوە نیشانەیە.

٢– نووسەر لە سەرەتاوە بە هەڵە چووە کە نیشانەی ناسیاوی بە (کە) ناوبردووە... هەڵەی گەورەتریشی ئەوەیە کە دواتر (کە)و (ەکە)و (یەکە)ی بە سێ پاشگر داناوە. گومان لەوەدا نییە کە نیشانەکە (ەکە)یە نەك (کە) یاخود (یەکە). (ەکە) و (کە) و (یەکە) سێ نیشانەی سەربەخۆ و جیاواز نین، بەڵکو تەنیا (ەکە)یە و بەپێی دوا دەنگی وشە گۆڕانی بەسەردا دێت، کە ئەمەش دیاردەیەکی ئاشکرای فۆنەتیکی زمانی کوردییە. سەرەڕای ئەوە نووسەر لەوە نەدواوە کە ئەگەر وشەیەك کۆتایی بە بزوێنی (وو) بێت چ گۆڕانێك دێتە گۆڕێ.

٣– لێرەدا باس لە (دەنگ) دەکرێ، نەك لە (پیت). لەم شوێنەشدا د. نەبەز خراپ ئەو دوو مەفهوومەی تێکەڵ کردووە.

٤– لە زمانی کوردیدا جگە لە (ەکە)، هەروەها (ە)ش نیشانەی ناسیاوییە، بەڵام د. نەبەز لە هیچ شوێنێکدا ناوی نەبردووە و دیارە دەرکی بە بوونی نەکردووە.

---

[72] - سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٨.

لە لاپەڕە (٣٠)دا زۆر کورت بە ناوی ((ئامرازی کردنەگەل))ەوە دەربارەی کۆ دواوە. نووسەر ڕاست بۆ ئەوە چووە کە (ان)ی لە هەردوو دیالێکتە سەرەکییەکەی کوردیدا بە نیشانەی کۆ داناوە... بەڵام بە داخەوە ئەم بەشەش بێ هەڵە و کەم و کورتی نییە:

جگە لە (ان)ی نیشانەی سەرەکیی کۆ، لە زمانی کوردیدا چەند نیشانەیەکی دیکەش وەك: (ات)، (ەها)... هەن و نووسەر ناوی نەهێناون. هەرچەندە لە پەراوێزی ژمارە(٤٢)دا ناوی (گەل)ی بردووە، بەڵام هەڵەی ئەوەیە، وای داناوە کە ئەو نیشانەیە تەنیا لە بەشە دیالێکتی ئەردەڵاندا بەکاردێ و بۆ نموونەش وشەی ((کوڕگەل))ی هێناوەتەوە. ڕاستە مۆرفیمی (گەل)، لە بەشە دیالێکتی ئەردەڵاندا نیشانەی کۆیە، بەڵام نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە تاڕادەیەك لە هەندێ بەشە دیالێکتی تردا دەبینرێ، بە تایبەتی لە زمانی ئەدەبیدا. بەوێنە ئەو وشەی ((کوڕگەل))ەی د. نەبەز بەنموونە هێناویەتیەوە، بەم جۆرەی خوارەوە لە شیعرێکی گۆراندا دەبینرێ:

**کوڕگەل : هەمیشە گیان و دڵ شادبن**

**دەست لە ملانی بووکی مراد بن**

**(گۆران، ب، ل ١٧٣)**

لە باسی نیشانەکانی (ێن) و (ێد/ێت)ی کۆی ئیزافەدا جگە لەوەی کە (ێد) و (ێت)ی وەك دوو نیشانە تەماشا کردووە، هەروەها بێ هیچ ئەساس و بەڵگەیەکیش وای داوەتە قەڵەم کە (ێد) تەنیا لە بەشە دیالێکتی کوردی سۆڤیەتدا بەکاردێ. بەڵام تەماشاکردنێکی سەرپێی (مەم و زین)ی ئەحمەدی

خانی یەکسەر ئەو ڕایەی د. نەبەز ڕەت دەکاتەوە، ئەویش چونکە دەیان نموونە دەبینرێن کە (ێد)ی نیشانەی ئیزافەی کۆیان پێوە لکاوە، وەك:

**مەحبووبە لیباس و گۆشوارە**

**ملکێد من نە مستەعارە**

**(خانی، ل ٧٦)**

**ئابایێ عیظام و جەدد و والد**

**مەنسووب و مسەلسەلێد خالد**

**(خانی، ل ٨٠)**

سەرەڕای ئەوانەش، هەروەها لەهەندێ بەشە دیالێکتی ژووروودا هەندێ نیشانەی دی هەن نووسەر ناوی نەهێناون. لەژێر سەرباسی ((پاشگری نێوی تاك))دا (ل٣٢) دەربارەی نیشانەی (ێك) دواوە. بە داخەوە ئەم بەشەش بێ کەم و کورتی و ناتەواوی نییە.

١– نووسەر وا تێگەیشتووە کە نیشانەی ناوبراو تەنیا تاکایەتی نیشان دەدا و بۆ ئەوە نەچووە کە نەناسیاویش دەگەیەنێ.

٢– د. نەبەز لێرەشدا ئەو نیشانەیەی هەر بە پاشگر داوەتە قەڵەم، هەروەها مۆرفێمی (یەك) کە شێوەی مۆرفیم (Allomorph)ی (ێك)ە بە پاشگرێکی سەربەخۆی داناوە.

٣– سەرەڕای ئەوانە نووسەر ناوی نیشانەی (یٚ) و (نە)شی نەبردووە"[٧٣].

[٧٣] - بڕوانە: باسی ((نیشانەی نەناسیاوی)).

ئەوەی لە سەرەوە لێی دواین، هەندی سەرنج و تێبینی بوون دەربارەی ئەو باسانەی لە کتێبی ((زمانی یەکگرتووی کوردی))دا پێوەندیان بە بەشە ئاخاوتنی (ناو)ەوە، واتە بە باسی ئەم کتێبەمانەوە — هەیە، هەرچەندە کتێبی ناوبراو کەرەستە و زانیاری باشی تێدایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پڕ هەڵە و ناتەواوی و کەم و کورتییە و زۆر شوێنی جێگای ڕەخنەیە... ئومێد دەکەم لە دەرفەتێکدا تێکڕای ئەو بەرهەمەی د. جەمال نەبەز هەڵسەنگێنم.

مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لەو کتێبەیدا کە دوو ساڵ لەمەو بەر بڵاوی کردۆتەوە"[٧٤]"، وەك زانایانی عەرەب؟، وشەی بەسەر (اسم) و (فعل) و (حرف)دا دابەش کردووە، کەچی پێناسەیەکی وای بۆ ناو پەسەند کردووە کە تەنیا ناوی ڕووت دەگرێتەوە. نووسەر لە پێناسەی ناودا دەڵێ: ((ناو: وتەیەکە، کەسێك، گیانلەبەرێك، بێ گیان یان هەر شتێکی پێ دەناسین)) (بڕوانە: ل ٨٧)، بەڵام ئەو نموونانەی لە بەشی ناوی لێکدراودا هێناونیەتەوە ((سارداو، دووربین، چواردە، دڵخۆش، لێدان، دەست پێ کردن)) (بڕوانە: ل ٩١) بریتین لە (ناو) و (ژمارە) و (ئاوەڵناو) و (چاوگ). بەم جۆرە دەبینین مامۆستا ئەحمەد حەسەن باسەکەی لە سەرەتاوە لە سەر بناغەیەکی چەوت دامەزراندووە.

دوای ئەو پێناسەیە سێ جۆر ناو: ((ناوی تایبەتی (العلم)، ٢ — ناوی بەرناس (المعرفة)، ٣— ناوی گشتی (النکرة))) (بڕوانە: ل ٨٧)ی جیاکردۆتەوە و بە شێوەیەکی ساکار و کورت و کۆڵ لێیان دواوە و سەرەڕای ئەوەش هەڵەی زۆری کردووە. سەر باسی ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە و ناوی

---

[٧٤] - ئەحمەد حەسەن ئەحمەد، ڕێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٦.

سادە و لێکدراوی دیاری کردووە. بەداخەوە تێکەڵ کردنێکی زۆر لەم کارەی مامۆستای ناوبراودا بەرچاو دەکەوێ. نووسەر بەر لە هەموو شتێك ناوی داڕێژراو لێکدراوی بە یەك شت داناوە و لە یەك جیای نەکردوونەتەوە، ئەمەش هەڵەیەکی بنەڕەتی باسەکەیەتی کە کەم و کورتیەکی گەورەیە... سەرەڕای ئەوە کە مامۆستا ناوی داڕێژراو و لێکدراوی بە ناوی لێکدراو داناوە، لە چۆنیەتی و جۆری ڕۆنانیشیان نەدواوە. واتە باسی ئەو پێشگر و پاشگرانەی نەکردووە کە یاریدەی دروست کردنی ناو دەدەن، یاخود باسی شێوازی پێکهاتن و جۆرەکانی ناوی لێکدراوی نەکردووە. نموونەی ئەو باسە پێویست بوو دوور و درێژ و پڕ کەرستەیەی تەنیا شەش نموونەیە. بەڕاستی جێگەی ڕەخنە و داخە، باسێك کە پەنجا ساڵێك لەمەوبەر بە ڕێك و پێکی و زانستیانە و پڕ زانیاری کرابێ "[٧٥]"، کەچی ئەمڕۆ یەکێك کتێبی ڕێزمان بنووسێ و نەك هیچی لێ زیاد نەکردبێ، بەڵکو کلك و گوێی کردبێ و بەو دەردەی بردبێ. نووسەر لە باسی تاك و کۆدا دەڵێ: ((ناو لە کوردیدا یان بە پیتی کۆمەڵ (ان، یان) وە یا بە ئامرازی بەرناس کردن (کان) ئەکرێ بە کۆمەڵ...))... ((ئەگەر ناوەکە بەپیتی بێ دەنگ یان پیتی (و) دوایی هاتبوو (ان) ئەخەینە پشتیەوە...)) (بڕوانە: ل ٩١).

ڕاستە (ان) نیشانەی کۆیە، بەڵام (یان) نیشانەیەکی سەربەخۆ نییە، وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە، ئەو (ی — Y)یە نیمچە بزوێنێکە لە نێوان دوو بزوێندا پەیدا بووە. (کان)یش، وەك دواتر لێی دواوین"[٧٦]" نیشانەیەکی سەر

---

[٧٥] - بڕوانە: تەوفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جیزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩، ل ٥٠ — ٥٨.

[٧٦] - بڕوانە : ل ٧٢ — ٧٣.

بەخۆ نییە، بەڵکو لە (ەکە)ی ناسیاوی و (ان)ی کۆ پێکهاتووە... ڕاستە کاتێ نیشانەی (ان)ی کۆ بە ناوێکەوە بلکێ کە کۆتایی بە(و)ی کۆنسۆنانت هاتبێ، ئەوە هیچ گۆڕانێکی فۆنەتیکی نایەتەگۆڕێ. بەلام بەداخەوە مامۆستا جیاوازی لە نێوان (و)ی کۆنستانت و بزوێنی (وو)دا نەکردووە، ئەویش بەتایبەتی لە وشەی ((خانوو))دا (بڕوانە: ل ٩٢) بەدەردەکەوێ کە وەك نموونە بۆ (و)ی کۆنستانتی هێناوەتەوە. ئەمە، واتە جیاکردنەوەی (و)ی کۆنستانت و بزوێنی (وو) — و تێکەڵ کردنی پیت و دەنگ، بێ گومان نەك هەر هەڵەیەکی گەورەیە، بەڵکو نیشانەی نە شارەزایی و لاوازیشە لە ڕێزمان و زماندا.

جگە لەو هەڵە زەقانە، هەروەها لەم بەشەدا هەندێ کەم و کورتیش بەرچاو دەکەوێ، وەك باس نەکردنی ناوی بە بزوێن کۆتایی هاتووە، هەست نەکردن بە هەندێ حاڵەتی دیکەی وا کە کۆ سازدەکەن... هتد.

لە لاپەڕە (٩٤ — ١٠٨)دا لە ژێر سەرباسی ((١- ناوی تایبەتی — العلم، ٢- ناوی بەرناس کراو — الاسم المعرف بال، ٣- ناوی وەپاڵ نراو و وەپاڵخستن — الاسم المظاف والآضافة))دا دواوە. لە ڕاستیدا تێکەڵ و پێکەڵی و ئاڵۆزیی ئەو باسانە خوێنەر والێ دەکا بیەوێ لەو گۆمە شڵەقاوە خۆی دەرهاوێ. لەو باسانەدا مەسەلەی نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی پتر لە هەر کێشەیەکی دیکە بەدەرکەوتووە، ئێمەش هەوڵ دەدەین تەنیا لەو ڕووەی بدوێین. وەك وتمان ئەم باسە زۆر تێکەڵ و ناڕێکە، سەرەڕای ئەوە باسی نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی، سەربەخۆ لە شوێنێکی دیکەی ئەم کتێبەدا

(ل ٨٠ — ٨٥)کراوە، بۆیە وا بەباش دەزانین، کە نووکی قەڵەممان بخەینە سەر ئەم چەند لاپەڕەیە.

نووسەر لەلاپەڕە (٨٠ —٨٥)دا لە نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی دواوە. لە باسی نیشانەی نەناسیاویدا تا ڕادەیەك سەرکەوتووە و هەندێ شتی بەکەڵکی نووسیوە، بەڵام لە باسی نیشانەی ناسیاویدا هەڵەی گەورەی کردووە، بە تایبەتی لەوەدا کە (کە)ی بە نیشانەی ناسیاوی تاك داوەتە قەڵەم و (کان)یشی بە نیشانەی ناسیاویی کۆ داناوە.

وەك چەند جارێك گوتمان، نیشانەی ناسیاوی (کە) نییە و (ەکە)یە... هێنانە ئارای تاك و کۆ لێرەدا شتێکی بێ جێیە، چونکە ئەم نیشانەی تاك یا کۆیە لە هەر شوێنێکدا بێ دەوری خۆی بۆ گەیاندنی مەعنای خۆی دەبینێ و پێوەندییەکی تایبەتی بە ناسیاوی و نە ناسیاویەوە نییە. جگە لەوە، بۆ ڕوونکردنەوەش دەڵێین، نیشانەکە (کان) نییە و (ەکە + ان)ە، کە لە (ەکە)ی ناسیاوی و نیشانەی (ان)ی کۆ پێکهاتووە. کە دەوترێ ((کوڕەکان)) ئەوە ئاشکرایە کە لە ((کوڕ +ەکە + ان)) درووست بووە. هەرچی (ە)ی دووەمی (ەکە)یە کەوتۆتە پاڵ (ا)ی (ان) و تێچووە. دەزانین ((گوارەکان)) لە ((گوارە + ەکە + ان)) پەیدا بووە. (ە)ی کۆتاییی ((گوارە)) و (ە)ی سەرتای (ەکە) دوو بزوێنن و یەکێکیان تێدەچێ، وە (ە)ی کۆتاییی (ەکە) و (ا)ی دوو بزوێنن و (ە) تێچووە و (ا) ماوەتەوە، چونکە (ا) لە (ە) بەهێزترە. وشەی ((ڕێوی یەکان)) لە ((ڕێوی + ی — y + ەکە + ان)) سازبووە. لەم حاڵەتەدا لە نێوان دوو دەنگی (ی)ی کۆتاییی وشەی ((ڕێوی))و (ە)ی سەرەتای (ەکە)دا کە دوو بزوێنن، نیمچە بزوێنی (ی — y) پەیدا بووە، وە

(ە)ی کۆتاییی (ەکە)، کەوتۆتە پاڵ (ا)، نەماوە. بێگومان، ئەو دیاردەیە — واتە تێچوونی بزوێنێک یاخود پەیدابوونی نیمچە بزوێنێک — دەستوورێکی ئاشکرای فۆنەتیکی زمانی کوردییە"[٧٧]" و لەو بارەیەوە لە زمانی کوردیدا نموونە ئێجگار زۆرە... بەداخەوە، گەلێك لە نووسەرانی کورد بەهەڵەدا چوون و لە ڕواڵەتدا چییان بەدی کردووە، ئەوەیان تۆمار کردووە و نەچوونەتە نێو واقیعی زمانەکەوە.

سەرنج ڕاکێش، ئەوەیە مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لەگەڵ ئەوەشدا کە (کان)ی بە نیشانەی ناسیاوی و کۆ داناوە، بەشێك لەو وشانەی کە بۆ نموونە و پێ سەلماندنی ڕاکەی هێناونیەتەوە کۆتاییان بە (ەکەن) و (یەکان) دێت، وەك: ((درەختەکان، زەوییەکان...)) نازانم ئەمە چۆن سەرنجی نووسەری ڕانەکێشاوە.

تێکڕا لە کتێبی ((ڕێزمانی کوردی))ی مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەدا کەم و کورتی و ناتەواوی و هەڵە زۆرە و بەداخەوە لێرەدا مەودای ئەوەمان نییە لە هەمووی بدوێین.

ساڵی ١٩٧٦ لەلایەن ئەو لیژنەیەوە، کە بەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردی پێکی هێنابوو بۆ دانانی کتێبی خوێندنی زمان و ئەدەبی کوردی، شەش کتێب بڵاوکرایەوە"[٧٨]". ئەو کتێبانە لە پۆلی یەکەمی ناوەندییەوە تاکو

---

[٧٧] - بڕوانە : د. ئەورحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٥٤ — ٥٥.

[٧٨] - عەبدوڵلا شاڵی، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، د. ئەمین عەلی، نووری عەلی ئەمین، فەرەیدوون عەلی ئەمین، عەلائەددین سەجادی، کەمال محمود فەرەج، ئەبووزەید مستەفا سندی، زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی، بەغدا، ١٩٧٦، بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی، بەغدا، ١٩٧٦، بۆپۆلی سێیەمی ناوەندی، بەغدا، ١٩٧٦،بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی،

شەشەمی ئامادەیی دەگرنەوە. لە بەشی ڕێزمانی هەر بەرگێکدا هەندێ کێشەی ناو باس کراوە.

لەلاپەڕە (٣٦ — ٥٠)ی کتێبی پۆلی یەکەمی ناوەندیدا لە ژێر سەرباسی (ناو)و (جۆرەکانی ناو — ناوی تایبەتی، ناوی گشتی) و (ناوی بەرجەستە، ناوی گوزارە)و (ئەرکی ناو لە ڕستەدا)دا دواون. لە کتێبی پۆلی دووەمی ناوەندیدا (ل ٤٤ — ٥٣) بە ناوی (ناوی تاك و ناوی کۆ)، (ناوی ناسراو و نەناسراو)ەوە کۆڵراوەتەوە.

لە کتێبی پۆلی سێیەمی ناوەندیدا باسی (ناو بەپێی جنس، ل ٢٠ — ٢٤)، (داڕشتنی ناو، ل ٢٥ — ٢٩)، (تەواوکردنی ناو بە ناو، ل ٣٠ — ٣٣)بەرچاو دەکەوێ. لاپەڕە(١٥ — ١٨)ی کتێبی پۆلی چوارەمی ئامادەیی باسی (دروستکردنی ناوی گوزارە)ی تێدا کراوە. باسی (ناوی بچووك کراوە)، لە کتێبی پۆلی پێنجەمی ئامادەیدا (ل ١٨ — ٢٠) بەدی دەکرێ. هەندێ کێشەی ناو لە ڕووی سینتاکسەوە: (تەواوکردنی ناوبەناو)، (تەواوکردنی ناو بە ڕاناو)، (تەواوکردنی ناو بە ئاوەڵناو) کەوتوونەتە کتێبی پۆلی شەشەمی ئامادەی یەوە (بڕوانە: ل ٤٠ — ٥٢).

بەڕای من لیژنەی ناوبراو لەو چەند کتێبەدا باسی ناوی ڕاست و ڕەوان و زانستانە کردووە و لە کارەکەیدا سەرکەوتووە، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا کتێبەکان هەندێ کەم و کورتی ناتەواوییان تێدایە و ئێمەش لێرەدا لە بەشێکیان دەدوێین.

---

بەغدا، ١٩٧٦، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، بەغدا، ١٩٧٦، بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی، بەغدا، ١٩٧٦.

یەکێ لەم کەم و کورتییانە ئەوەیە کە هەندێ کێشەی گرنگ و پێویستی سەر بە ناو باس نەکراون، بە وێنە (ناوی کۆمەڵ...)، کەچی هەندێ کێشە لە بریتیی جارێك، دووجار باس کراون، بە نموونە لە کتێبی پۆلی سێیەمی ناوندیدا باسی (تەواوکردنی ناو بە ناو) کراوە، کەچی هەمان سەرباس لە کتێبی پۆلی شەشەمی ئامادەییدا دووپات کراوەتەوە...

لە باسی (ناوی تاك و ناوی کۆ)دا لیژنە بۆ نیشانە و دەربڕینی کۆ تەنیا باسی (ان)ی کردووە. ئەگەرچی ئەمانە کتێبی قوتابخانەن، بەڵام دەبوو ئەو حاڵەتانەی تریش، کە لە زمانی کوردییدا کۆ ساز دەکەن باس بکرێن...

خۆ لیژنە گەلێ باسی وای کردووەکە لە ڕادەی قوتابییان بەرزترن...

هەرچەندە لیژنە ڕاست بۆ ئەوە چووە، کە ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (وو) بێت، ئەوە لەکاتی لکاندنی (ان)ی کۆدا نیمچەبزوێنی (و — W) لە نێوانیاندا پەیدا دەبێ... بەڵام بۆ ئەوە نەچووە کە لەو بارەدا بزوێنی (وو) هەندێك کورتتر تەلەفوز دەکرێت...

کاتێ لە (ناوی ناسراو ناوی نەناسراو) دەدوێن، دەڵێن: ((ئەگەر ناوەکە بە پیتی بزوێنی (ا، ە، ێ، ۆ) دوایی هاتبێت، بەهۆی (کە)وە دەکرێت بە ناسراو)) (بڕوانە: کتێبی پۆلی دووەمی ناوەندی، ل ٥٢). لە پەراوێزی ژمارە (١)ی لاپەڕە(٤٩)شدا نووسیویانە: لەو وشانەدا کە تەنیا بڕگەیەکن دەتوانین بڵێین (باکە) یان (بایەکە).

وەك چەند جارێك وتمان، ڕاست نییە (کە) بە نیشانەی ناسیاوی دابنرێ و ئەو بارەی کە گۆڕانی فۆنەتیکی بەسەر (ەکە)یدا هێناوە، بەو شێوەیە تەماشا بکرێ... هەروەها لە باسی کتێبی ((دەستووری زمانی کوردی))ی

مامۆستا تۆفیق وەهبیدا ڕوونمان کردەوە، کە لە هەڵکەوتی زمانی کوردیدا بڕگە دەوری نەبوون یاخود پەیدابوونی نیمچە بزوێن نابینێ. کەم و کورتی بەرچاوی باسی (ناو بەپێی جنس) لەوەدایە کە وتوویانە: ((هەندێ گیاندار هەیە دەتوانرێت مێیان بە پێشگری (ما)، وە نێریان بە پێشگری (نێر) دەست نیشان بکرێت، وەك: ماکەو، نێرەکەو)) (کتێبی پۆلی سێیەمی ناوەندی، ل ٢١). بەر لە هەموو شتێك دانانی (ما) و (نێر) بە پێشگر شتێکی ڕاست نییە، چونکە هەردوکیان وەك وشەی سەربەخۆ تەواو لەکاردان... سەرەڕای ئەوە لە زمانی کوردیدا هەندێ وشەی دیکەش هەن، کە هەمان دەور دەبینن و هەمان مەبەست دەگەیەنن، وەك: (دێڵ، گۆڵ، مێ، نێرە...) کەچی لیژنە ناوی نەبردوون.

لیژنە باش بۆ جیاکردنەوەی ناوی داڕێژراو و ناوی لێکدراو چووە و لە هیچ شوێنێکدا تێکەڵی نەکردوون، بەڵام کەم و کورتییەکی ئەم بەشەش ئەوەیە، لە پێناسەی ناوی داڕێژراودا دەڵێت ((ئەو ناوەیە کە لە تەنها ناوێکی سادەی واتادار و زیادییەك پێك دێت)) (بڕوانە: کتێبی پۆلی سێ یەمی ناوەندی، ل ٢٧). بەمەدا وا دەردەکەوێ، لیژنە وای داناوە کە ئەو وشە واتادارەی نێو وشەی داڕێژراو دەبێ ناو بێ. بێگومان ئەمە ڕاست نییە و لەزمانی کوردیدا نموونەی وشەی داڕێژراو زۆرە کە وشە واتادارەکانی ناو نەبن، وەك: ((بەرزی)) کە لە (ئاوەڵناو + پاشگر) پێکهاتووە، ((سووتەمەنی)) کە لە (ڕەگی کردار + پاشگر) دروست بووە، ((بنار)) کە لە (ئاوەڵکردار + پاشگر) ڕۆنراوە...و گەلێکی تر. جا ڕاستتر وابوو لەو پێناسەدا (وشەیەکی) لە جێگەی (ناوێکی) دابنرایە... بۆ پتر پێ سەلماندنی ئەم ڕایەم، دەبینین کە

دواتر لیژنە خۆی لە باسی پێكهێنانی ناوی داڕێژراودا، ئەوەی دەست نیشان كردووە كە (ئاوەڵكردار)یش دەتوانێ لە پێكهێنانی وشەی داڕێژراودا هاریكاری بكات.

لیژنە وای بۆ چووە كەتەنیا (ە) – ئامرازی پێوەندی ناوی لێكدراوە (بڕوانە: كتێبی پۆلی سێیەمی ناوەندی، ل ٢٧). وە لە پەراوێزی ژمارە دووی هەمان لاپەڕەدا وای داناوە كە ناوی لێكدراو نابێت لە دوو ((ناوی سادە))ی واتاداری كەمتر تێدا بێت.

ئاشكرایە ئەو مۆرفیمە یاریدەدەرانەی لە زمانی كوردیدا لە ڕۆنانی ناودا هاریكاری دەكەن بریتین لە: (ە)،(و)،(ەو)،(او)،(ان)،(بە)..." "[٧٩]، نەك تەنیا (ە).

هەروەها لەوەشدا لیژنە هەر بە هەڵە چووە، كە گوایا پارچەكانی وشەی ناوی لێكدراو دەبێ هەر ناو بن. ئەگەر هەندێ ناوی لێكدراو بێنینە پێش چاو، ئەوە دەبینین نەك هەر ناو، بەڵكو هەندێ لە بەشەكانی دیكەی ئاخاوتن، لە ڕۆنانیدا هاریكاری دەكەن. بە وێنە، وشەی ((كێلە سپی)) لە (ناو + ئینتەر فیكس + ئاوەڵناو) پێكهاتووە، ((ڕەشماڵ)) لە (ئاوەڵناو + ناو) ساز بووە، ((دارتاش)) – لە (ناو + ڕەگی كردار) دروست بووە، ((هات و چۆ)) لە (ڕەگی كردار + ئینتەر فیكس + ڕەگی كردار) ڕۆنراوە...و گەلێكی تر.

هەرچەندە ئەو چەند كەم و كورتییە و هەندێكی دیكە لە نووسراوی ناوبراودا بەدی دەكرێت، بەڵام لە ڕاستیدا بەرهەمێكی پوخت و بەسەر و بەرە و لەگەڵ ئەوەشدا كە بۆ خوێندنی قوتابخانەكانە، ئینجا لە زۆربەی ئەو

---

[٧٩]- بڕوانە: د. ئەورحمانی حاجی مارف، وشە ڕۆنان لە زمانی كوردیدا، بەغدا،١٩٧٧، ل ٤٣.

کارانەی لەم بارەیەوە لە کوردستان بلاّوکراونەتەوە، قوڵتر و ڕەسەنتر و زانستییانەترە.

مامۆستا صادق بەهائەدین لەو نوسراوەیدا کە بەناوی ((ڕێ زماناکرمانجی))یەوە نووسیویێتی و بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوە"[٨٠]" لە لاپەڕە (٦٨ – ٨٢)دا لە ناو دواوە. هەرچەندە ئەو پێناسەیەی ئەم نووسەرە بۆ ناوی داناوە، هەندێ کەم و کورتی تێدایە، بەلاّم لە زۆر ڕووەوە لە بەشێك لەو پێناسانەی تاکو ئێستا ناومان بردوون باشترە.

مامۆستا صادق بەهائەدین لە ڕووی فۆڕمەوە ناوی بەسەر سادە و لێکدراودا دابەش کردووە (بڕوانە: ل ٦٨). نووسەر نەك هەر بە چەند دێڕێك کۆتاییی بەم باسە گرنگە هێناوە و بەلای هیچ کێشەیەکدا نەچووە، تەنانەت ناوی وشەی داڕێژراویشی نەهێناوە و وەك ئەو جۆرە وشانە لە زمانی کوردیدا هەر نەبن...

لە هەمان لاپەڕەدا نووسەر هاتۆتە سەر باسی ناوی مادی و مەعنەوی. لە لاپەڕە (٥٩)شدا کەوتۆتە لێکۆڵینەوەی ناوی تاك و ناوی کۆ. (ئەك) و (یەك)ی بە نیشانەی تاك، وە(یان) و (ئن) و (ین)یشی بە نیشانەی کۆ داناوە. ئاشکرایە کە ئەو نیشانانە (ەك) و (ان) و (ن – in)ن، نەك وەك ئەوەی مامۆستا صادق نیشانی داوە. ڕاستە، ئەگەر نیشانەیەك سەرەتای بە بزوێن دەست پێ بکات، ئاسان بە دەمدا نایەت و هەمزە لە پێشیەوە بەدەردەکەوێ، بەلاّم ئەمە لە جەوهەری نیشانەکە ناگۆڕێ و لەبەرئەوە هەڵەیە ئەگەر لە نوسیندا هەمزەی لەگەڵ دابنێین. سەرەڕای ئەوە، نووسەر

---

[٨٠]–صادق بەهائەدین ئامێدی، ڕێزمانا کرمانجی، بەغدا، ١٩٧٦.

ئەوەی لەیاد کردووە کە (ەك) جگە لە تاکایەتی، مانای ناسیاویش دەگەیەنێ لە بەردەوامی باسی ناوی تاك و کۆی ناودا، نووسەر تەواو چووەتە سەر کێشەی کۆکردنەوەی جۆرەکانی کردار لە دەمی جیاوازدا و بەمە زۆر لە باسە بنەڕەتییەکەی دوورکەوتۆتەوە و گەلێك شتی هەمەچەشنەی تێکەڵ یەکتر کردووە.

دوا بەشی باسی ناو دەربارەی جنسەکانی ناوە(بڕوانە: ل ٧٦ — ٨٢). هەرچەندە لێرەشدا کەم و کورتی دەبینرێ، بەڵام ئەم بەشە لەوانی دیکەی سەرکەوتووتر و تێر و تەسەلترە.

تێکڕا نووسراوی ناوبراوی مامۆستا صادق بەهائەدین نەك هەر کەم و کورتی و ناتەواویی زۆری تێدایە، بەڵکو گەلێك کێشەی گرنگ و پێویستیش کە پێوەندیان بە ناوەوە هەیە ناویان نەهێنراوە تێدا و باسیان نەکراوە.

لە هەندی لەو کارە زمانەوانییانەدا کە کوردناسانی سۆڤێت: د.قەناتی کوردۆ، د.چەرکەزی بەکۆ، د.کەریمی ئەییوبی، د.ئی.ئا.سمیر نۆڤا... نووسیویانە چاومان بە باسی بەشە ئاخاوتنی ناو دەکەوێ.

لە مەیدانی گەورەی کوردناسیدا بەگشتی و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا و بە تایبەتی، د. قەناتی کوردۆ خزمەتێکی گەورە و شایانی کردووە و گەلێك وتار و نامیلکە و کتێبی دەربارەی زمانی کوردی — واتە نووسینی ڕێزمانی کوردی (تیۆری و پراکتیك)، لێکۆڵینەوە لە زمانی گفتوگۆ و لە زمانی ئەدەبی، بەراوردکردنی دیالیکتی کرمانجی ژوورو و خواروو و ئەو بابەتانە نووسیوە.

ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر پێویستە سەرنجی بۆ ڕابکێشرێت ئەوەیە کەوا مامۆستا قەناتی کوردۆ ساڵی ١٩٤٩ کتێبێکی ڕێزمانی کوردیی بە زمانی کوردی لە چاپ دا"[٨١]" و ساڵی ١٩٥٧یش بە زمانی ڕووسی کتێبێکی تری هەر لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بلاوکردەوە"[٨٢]". گرنگی ئەم دوو کتێبی ڕێزمانە تەنیا لەوەدا نییە کە بۆ یەکەم جار لە سۆڤیەت و لە مێژووی کوردناسیدا لە سەر شێوەیەکی زانستییانە کتێب دەربارەی زمانی کوردی بلاوکراوەتەوە، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش توانراوە لەم دوو کتێبەدا گەلێك کاری ئاڵۆز و نائاشکرا لە ڕێگایەکی زانستییانەوە خاو بکرێتەوە و ئاشکرێ بکرێ، وەك: دۆزینەوەی نێرومێ و دابەشکردنی ناو بەسەریاندا، خاوکردنەوەی هەندێ ئاڵۆزی لە ڕەگی کردار و لە پێشگر و پاشگردا، شێوەی کرداری تێپەڕ لەکاتی ڕابردوودا، هەروەها گەلێك مەسەلەی گرنگی تر کە تا دەرچوونی ئەم دوو بەرهەمەی مامۆستا کوردۆ باش لێیان نەکۆڵرابووەوە.

هەرچەندە ئەو دوو کتێبی ڕێزمانە، لەسەر شێوەیەکی زانستییانە و کەرەستەیەکی فراوان نووسراون و کەم و کورتییان زۆر کەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر جارێك کە لە چاپ دەدرێنەوە دانەرەکەیان گەلێك فراوانتریان دەکات و بە شێوەیەکی جوانتر و ڕاستتر دایان دەڕێژێتەوە، لە بەر ئەوە چاپی یەکەمی ((ڕێزمانی کوردی))، کە لە ساڵی ١٩٤٩ دا دەرچووە، گەلێك

---

[٨١]- قەناتی کوردۆ، زمانێ کوردی، چاپی یەکەم، یەریڤان، ١٩٤٩.

[٨٢]- قەناتی کوردۆ (کوردۆییێڤ)، دەستووری زمانی کوردی، مۆسکۆ — لێنینگراد، ١٩٥٧.

جیاوازی لەگەڵ چاپی چوارەمیدا هەیە"[٨٣]". ئەو چوار چاپەی ئەو کتێبە کە بە زمانی کوردی دەرچوون دەورێکی گەورەیان لە ناو قوتابخانە کوردییەکانی ئەرمەنستانی سۆڤیەتدا بینیوە. مامۆستایانی زمانی کوردیی ئەو قوتابخانانە زۆر بایەخیان بە کتێبەکانی ق. کوردۆ داوە، بەتایبەتی چونکە بە شێوەیەکی زانستییانە و ئاسان و ڕەوان نووسراوون."[٨٤]"

هەرچەندە لەو دوو کتێبەو هەندێ کاری زانستی یانەی دیکەی مامۆستا کوردۆدا باسی بەشە ئاخاوتنی ناو بەرچاو دەکەوێ، بەڵام لەبەر ئەوەی کاری هەرە گەورە و دیار و زانستییانە، ئەو کتێبەیەتی کە ماوە چەند مانگێک لەمەوبەر لە ژێر ناوی ((دەستووری زمانی کوردی)) (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خواروو)دا بلاوی کردۆتەوە"[٨٥]" و لە بەشە ئاخاوتنی ناو (بڕوانە: ل ٤٣ — ٧٨) دواوە تیایدا، دەیکەینە کەرەستە و سەرچاوەی ئەم باسەمان.

لە باسی (ناو)ی ئەم کتێبەدا نووسەر لە سەرەتادا ناوی ئەو کێشانەی هێناوە کە پێوەندیان بە ناوەوە هەیە و، دواتریش لە هەر یەکێکیان دواوە.

---

[٨٣] - کتێبی ((زمانێ کوردی))، کە بە زمانی کوردی نووسراوەو لەساڵی ١٩٤٩دا لە یەریڤان لە چاپ دراوە، تاکو ئێستا چوار جار — واتە لە ساڵانی ١٩٤٩و ١٩٥٦ و ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا لەچاپ دراوەتەوە.

[٨٤] - بۆ وەرگرتنی زانیاری پتر دەربارەی کارە زمانەوانی یەکانی مامۆستا ق.کوردۆ، بڕوانە: د.ئەورەحمانی حاجی مارف، چی لەبارەی زمانی کوردی یەوە نووسراوە، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٥٠ — ٥٥.

[٨٥] - قەناتی کوردۆ (کوردۆ یێڤ)، دەستووری زمانی کوردی، (بەکەرستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو خواروو)، مۆسکۆ، ١٩٧٨.

لە یەکەم هەنگاودا باسی نیشانەی نەناسیاوی کردووە و نیشانەی (ەك)ی بۆ کرمانجی ژووروو و (ێك/ێ)ی بۆ کرمانجیی خواروو دیاری کردووە و نیشانی داوە کە واتای نەناسیاوی و تاکایەتی دەگەیەنن. ئنجا نیشانەی (ن – in )و شێوەکانی تری وەك نیشانەی نەناسیاویی کۆی داناوە. نموونەی بۆ تێکڕای نیشانەکانی نەناسیاوی هێناوەتەوە. نووسەر هەرچەندە لە شێوەی لکاندنی ئەو نیشانانە بە ناوی جۆراو جۆرەوە نەدواوە، بەڵام شایەنی باسە وەك نووسەرانی دیکە باری جیاوازی وشە سەری لێ تێك نەداوە. کەم و کورتی بەرچاوی ئەم بەشە، ئەوەیە کە نووسەر هەستی بەوە نەکردووە کە نیشانەی (ەك) لە هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا بەکاردەهێنرێ.

بەدوا باسی نیشانەکانی نە ناسیاویدا، لە نیشانەکانی ناسیاوی دواوە (ل ٤٦ – ٤٩). بەداخەوە لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا، وەك هەندێ نووسەری دیکە، بە هەڵە چووە کە ئەو (ا)یەی لە کرمانجیی ژووروودا و ئەو (ە)یەی کە لە کرمانجیی خوارووا بە یاریدەی جێناوی نیشاندانی (ئەڤ – ئەم)، (ڤان/ ئەڤان – ئەمان)، (ئەو – ئەو)، (وان/ ئەوان – ئەوان) پەیدا دەبن، بە نیشانەی ناسیاوی داناوە، وەك ((ئەڤاژنا – ئەم ژنە...)).

هەرچەندە ئەو جێناوانە لە ناساندنی ناودا کاریگەرن و ئەمەش حاڵەتێکی تایبەتی و ناسیاوییە، بەڵام ڕاست نییە کۆ تایبی ناو لەم حاڵەتەدا بە نیشانەی ناسیاوی دابنرێ. نیشانەی ناسیاوی ئەوەیە کە بێ یاریدە بەدەر بکەوێ.

ئەگەر هەندێ لە زمانەکەمان وردبینەوە، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە (ە) بێ یاریدەی جێناوی نیشاندان، وەك نیشانەی ناسیاوی کار دەکا، وەك:

**شێرکۆ کوڕێکی چاکە**

**زۆر بەرەحم و دڵپاکە**

**ڕۆژێ لە چلەی زستان**

**مارێکی دی لە کۆڵان**

..............

..............

**دەس بەجێ مارەی هەڵگرت**

**خێرا بۆ ماڵەوەی برد**

**(بێکەس، ل ١٤٥)**

لێرەدا کە نیشانەی (ە) چووەتە سەر وشەی ((مار))، ئەو مانا و مەبەستی شتێکی ئاشکرا کردووە، کە زووتر ناوی هاتووە (بڕوانە دێڕی چوارەم). جا ئەو جۆرە نموونانە و ئەو چەشنە بەکارهێنانە لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا زۆرە کەچی، بەداخەوە هیچ نووسەرێکی ڕێزمانی کوردی لێی نەدواوە.

لە بەشی دووەمی باسی نیشانەکانی ناسیاویدا ئەوەی خستۆتە پێش چاو کە لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا (ەکە)ش نیشانەی ناسیاوییە و دەربارەی ئەمە هەندێ زانیاری ڕاست و باشی نیشان داوە.

بە تەواوبوونی باسی نیشانەکانی نەناسیاوی و ناسیاوی لە (ژمارەی ناو) دواوە (ل ٥٠). لێرەدا تەنیا نیشانەی (ان)ی کۆ دواوە و ئەویش بەچەند

دێڕێك. نووسەر نەك تەنیا باسی نیشانەکانی تر و حالاًتی جۆراو جۆری پێکهاتنی کۆی نەکردووە، بەڵکو شتێکی ئەوتۆشی دەربارەی نیشانەی (ان) نەوتووە.

لە باسی (جنسەکانی ناودا)، سێ جنس (١- نێر، ٢- مێ، ٣- دوولایەن)ی دیاری کردووە و نیشانی داوە کە هەر جۆرە ناوێك بەر کام جنس دەکەوێ (بڕوانە: ل ٥٠ - ٥٣).

لە لاپەڕە (٥٣ - ٥٩)دا بە دوور و درێژی لە دۆخەکانی ناو (حلات الاسم، اعراب الاسماء - Cas) دواوە و تێکڕای ئەو دۆخانەی ناویان تێدا دەبینرێ دەست نیشان کردووە. شایەنی باسە، کە بەر لە قەناتی کوردۆ هیچ زمانەوانێکی تر بەو شێوە زانستییانە و بەو فراوانییە لەم کێشەیە نەدواوە.

دوا باسی بەشە ئاخاوتنی (ناو)ی ئەم کتێبەی مامۆستا کوردۆ بەناوی (نیشانەکانی ئیزافە)وەیە، لەم بەشەدا، وەك نیشانەی ئیزافە بۆ دیالێکتی کرمانجیی خواروو(ی، ێ، ە) و، بۆ دیالێکتی کرمانجیی ژووروو (ا، ێ، ی، ێد/ ێت، ێن)ی دەست نیشان کردووە و بە نموونە و بەڵگەی زانستییەوە لێیان دواوە.

سەرەڕای ئەو چەند کەم و کورتییە، بەداخەوە هەندێ ناتەواویش بەدی دەکرێ، ئەویش باس نەکردنی چەند کێشەیەکی گرنگی سەر بە ناوە، وەك: ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە، ناو لە ڕووی هەبوونەوە، ناو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە...

تێکڕا دەتوانرێ ئەم کتێبە بە یەکەمین لێکۆڵینەوە لە مەسەلەی بەراوردکردنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی دابنرێت، ئەویش نەك تەنیا لەبەر

ئەوەی لەم ڕووەوە لێکۆڵینەوە کەمە، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە تاکو ئێستا هیچ زمانناسێکی تر نەیتوانیوە بەو شێوە زانستییانە لەو باسە گرنگە بکۆڵێتەوە و ئەوەندە کەرەستە بە شێوەیەکی وا ڕاست و گونجاو بەکار بهێنێ.

مەبەستی هەرە گرنگی ئەم بەرهەمە زانستییانەی کوردۆ بریتییە لە دەرخستنی یەکێتی و وێکچوونی دیالێکتەکانی زمانی کوردی و دیاری کردنی هۆ مێژووییەکانی ئەو جیاوازییە کە مانەی لە نێوانیاندا هەن لەگەڵ نیشاندانی ڕادەی دەوڵەمەندی و پێشکەوتنی ئەم زەمانە.

لە بەرهەمە زانستییانەکانی د. چەرکەزی بەکۆشدا، بە وێنە لە کتێبی ((زمانی کوردەکانی ئازەربایجان))"[٨٦]" و کتێبی ((بەشەدیالێکتی کوردی تورکمەنستان))"[٨٧]" و کتێبی ((زمانی کوردەکانی سۆڤیەت))"[٨٨]"...دا گرنگی بە باسی ناو دراوە. شایانی باسە کە مامۆستا بەکۆ زانایانە و شارەزایانە لەو کێشەیە دواوە و کەرەستەی زۆر و لێکۆڵینەوەی نایابی پێشکەش کردووە.

لە نێو ئەو کتێبانەدا کتێبی سێیەمیان — واتە کتێبی ((زمانی کوردەکانی سۆڤیەت)) — کاری هەرە گەورە و زانستییانەی مامۆستا بەکۆیە، بۆیە ئێمە ئەمەیان دەکەینە سەرچاوەی لێدوانمان:

نووسەر لەلاپەڕە (٦٠ — ١١٥)ی ئەم کتێبەدا لە ناو دواوە و بە باسی (ژمارەی ناو) دەستی بە لێکۆڵینەوەکەی کردووە. بە نموونەو بەڵگەوە ڕوونی کردۆتەوە کە لە تێکڕای بەشە دیالێکتەکانی کوردی سۆڤێتدا نیشانەی (ان)ی

---

[٨٦] - چەرکەزی بەکۆ (باکاییڤ)، زمانی کوردەکانی ئازربایجان، مۆسکۆ، ١٩٦٥.
[٨٧] - چەرکەزی بەکۆ (باکاییڤ)، بەشە دیالێکتی کوردی تورکمە نستان، مۆسکۆ، ١٩٦٢.
[٨٨] - چەرکەزی بەکۆ (باکاییڤ)، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣.

کۆ بەکاردێ و هەروەها ناوە ناوە ئەو نیشانەیە لە شێوەی (ا)دا — واتە بە کورت کراوەییش — دەبینرێ. دواتریش ئەوەی دیاری کردووە کە هەندێ جار لە بەشە دیالێکتی کوردی ئازەربایجاندا، هەروەها نیشانەی (یدە، ەدە، نە، ونە)ش دەوری کۆ دەبینن. شایەنی باسە کە دەربارەی کۆ زانیاری باش و ڕاستی تۆمار کردووە پاش باسی ژمارەی ناو، دەربارەی نیشانەکانی نەناسیاوی و ناسیاوی دواوە(بڕوانە ل ٦٥ — ٧٣). بە دوورو درێژی باسی (ەك)ی نیشانەی نە ناسیاوی کردووە و نیشانی داوە کە لە هەر بەشە دیالێکتێکی کوردەکانی سۆڤیەتدا چۆن خۆی دەنوێنێ و چ گۆڕانێکی بەسەردا دێت. هەرچەندە باری زانستی ئەم باسە سەرکەوتووە، بەلاّم بەداخەوە کاتێك هاتۆتە سەر باسی نیشانەی ناسیاوی، وەك کوردناسانی تری سۆڤێت تووشی هەمان هەڵە و سەر لێ تێك چوون بووە کە ئەوانیش تووشی بوون، ئەویش ئەوەیە، وا تێگەیشتووە نیشانەی (ە)ی ناسیاوی ئەوەیە کە بە یاریدەی هەندێ جێناو پەیدا دەبێ. پێشتر تا ڕادەیەك ڕای خۆمان بەرانبەر ئەو جۆرە بۆچوونە دەربڕی، دواتریش هەندێ سەرنجی تر دەخەینە ڕوو.

مامۆستا باکێیڤ بە شێوەیەکی فراوان لە دۆخەکانی ناوی کۆڵیوەتەوە (بڕوانە: ل ٧٣ — ٩٣) و هەموو ئەو دۆخانەی ناویان تێدا بەدی دەکرێ دەست نیشان کردووە و ئنجا ئەرکی ناو لە هەردۆخێکدا چییە لێی دواوە.

زۆر بەکورتی دەربارەی جنسەکانی ناو دواوە، ئەوەش لەبەر ئەوەی لە باسی دۆخەکانی ناو و باسی ئیزافەدا گرنگی بە مەسەلەی جنس داوە.

ناتەواوی دیاری ئەم باسە، ئەوەیە کە نووسەر تەنیا جنسی نێر و مێی جیا کردۆتەوە.

دوا لێکۆڵینەوەی بەشە ئاخاوتنی ناو باسی (ئیزافە)یە (ل ٩٤ — ١١٥) نووسەر نیشانەکانی ئیزافەی بەسەر نیشانەی ئیزافەی تاك و نیشانەی ئیزافەی کۆدا دابەش کردووە و لە خۆنواندن و دەوریان داوە. سەرەڕای نیشانەکانی (ا، ە، ێ، ی)ی ئیزافەی تاك و نیشانەکانی (ێد/ ێت، ێن)ی ئیزافەی کۆ، کە لە زۆربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی ژووروودا بەکاردێن، هەروەها ئەو وردە تایبەتییانەی لەم ڕووەوە لە بەشە دیالێکتەکانی کوردی سۆڤیەتدا دەبینرێن، خستۆتە پێش چاو، وەك نیشانەی (ا) کە لە بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان و ئازەربایجاندا دەبینرێ، یاخود نیشانەکانی (ێدە، ەدە، ێنە، ەنە، یدە) کە لە بەشە دیالێکتی کوردی ئازربایجاندا هەن.

بەداخەوە هەندێ کێشە هەن پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە باسی ناوەوە هەیە و مامۆستا بەکۆ لێیان نەدواوە، بەوێنە، وەك باسی (ناوی لە ڕووی پێکهاتنەوە — سادە و ناسادە)، (ناو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە — تایبەتی و گشتی و کۆمەڵ)، (ناو لە ڕووی هەبوونەوە — مادی و مەعنەوی)...هتد.

نووسەری ئەم کتێبە لەڕێی لێکۆڵینەوەی قووڵ و تێر و تەسەل و ئەنجامی بەراوردکردنی بەشە دیالێکتەکانی کوردەکانی سۆڤیەتدا هەندێ شتی نوێی نەك هەر لەبارەی (ناو)ەوە دۆزیوەتەوە، بەڵکو دەربارەی گەلێ کێشەی تری ڕێزمانی کوردی ئەنجامی باشی وەدەست هێناوە.

لە بەشی مۆرفۆلۆژیی کتێبی ((دیالێکتی کوردی موکری))دا کە د. کەریمی ئەیوبی و د. ئی.ئا. سمیر نۆڤا دایاننـاوە"[٨٩]"، باسی (ناو) بەرچاو دەکەوێ (ل ١٩ — ٣٨).

نووسەرانی ناوبراو لە سەرەتادا لە (ژمارەی ناو) دواون. لێرەدا باسی نیشانەکانی (ان) و (گەل) و هەروەها ئەو واتایانەیان کردووە کە کۆ دەیانگەیەنێ (ل ١٩ — ٢٠). ناتەواوی ئەم باسە، ئەوەیە کە بەلای هەندێ نیشانە و هەندێ حاڵەتدا نەچووە. سەرەڕای ئەوەی (یان)یان بە نیشانەیەکی سەربەخۆ داناوە، کەچی هاتنی (ان)یشیان دوای هەندێ بزوێن باس نەکردووە.

ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە کە کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا بە شێوەیەکی زانستییانە لە (نیشانەکانی ناسیاوی و نەناسیاوی)یان کۆڵیوەتەوە و گەلێك ڕووی ئەو مەسەلەیەیان ڕوون کردۆتەوە (ل ٢١ — ٢٣). من لەو ڕایەدام کە لە هەمووان چاکتر و تەواوتر چوونەتە بنج و بناوانی ئەو باسەوە. هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کتێبی ناوبراوم کردۆتە سەرچاوەی سەرەکیی ئەو باسەی دەربارەی (نیشانەکانی ناسیاوی و نەناسیاوی) نووسیومە.

بەلام پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە ئەم باسەش بێ کەم و کورتی نییە. بۆ نموونە، هەرچەندە (ەکە)یان بە نیشانەی ناسیاوی داناوە، بەلام دەڵێن، دوای بزوێنی(ە) دەبێتە (کە)، وە دوای (ێ، ی) دەبێتە (یەکە)... (بڕوانە: ل ٢١). شێوەی دەربڕینی ئەوان بەو جۆرە تا ڕادەیەك

---

[٨٩]- کەریمی ئەیوبی و د. ئی.ئا. سمیر نۆڤا، بەشەدیالێکتی کوردی موکری، لێنینگراد، ١٩٦٨.

ڕاست نییە، بەڵکو ڕاستتر وابوو بوترایە: ئەگەر وشەیەك کۆتایی بە بزوێنی (ە) هات، ئەوە دوو (ە) — واتە (ە)ی کۆتاییی وشەکە و (ە)ی سەرەتای (ەکە) — کە دەکەونە پاڵ یەك، یەکێکیان تێدەچێ. یاخود ئەگەر وشەیەك کۆتاییی بە (ێ، ی) هات، ئەوە نیمچەبزوێنی (ی — Y) دێتە کایەوە.. سەرەڕای ئەوە لەو حاڵەتە نەدواون، ئەگەر وشەیە کۆتاییی بە بزوێنی (وو) بێت چ گۆڕانێکی تێدا ڕوودەدات. هەمان کەم و کورتی لە باسی نیشانەی نەناسیاویشدا بەرچاو دەکەوێ. هەرچەندە نووسەران بۆ ئەوە چوون کە (ە)ش هەر نیشانەی ناسیاوییە، بەلاّم بەداخەوە ناوەرۆکی باسەکەیان شتێکی ترە و وایان داوەتە قەڵەم، کە گوایا (ە)ی ناسیاوی، ئەوەیە کە بە یاریدەی جێناوی نیشاندانی (ئەو، هەو) بەدیار دەکەوێ. بەر لە هەرچی؛ دەبێ بزانین، ئەگەر وا بوایە، دەبوو ئەوە لەبیر نەکەن کە (ئەم)یش وەك (ئەو، هەو) دانێن، بەلاّم لە ڕاستیدا ئەو (ە)یەی لە کۆتایی ناوێك یا ئاوەڵناوێکەوە بە یاریدەی جێناوی نیشاندان پەیدا دەبێ، وەك ((ئەو پیاوە...)) نیشانەی ناسیاوی نییە — واتە (ە)ی ناسیاوی ئەوە نییە کە ئەوان تێی گەیشتوون، چونکە ئەو حاڵەتەی ئەوان لێی دواون شتێکی دیکەیە و مەرج نییە لە هەر شوێنێکدا (ە) بەدەردەکەوێ، نیشانەی ناسیاوی بێت...

بەکورتی لە (جنسەکانی ناو) دواون (بڕوانە: ل ٢٤) و دوو جنس — نێرو مێ — یان جیاکردۆتەوە و وتوویانە کە لە دۆخی تیاندا جنسی نێر نیشانەی (ی — Î) یاخود (ی — Y) وەردەگرێ و جنسی مێ نیشانەی (ێ — ê) یاخود (یە — ye)ی پێوە دەلکێ. لە حاڵەتی بانگهێشتندا نیشانەی (ە) بۆ جنسی نێر و (ێ) بۆ جنسی مێ بەکار دەهێنرێ. ئەو بۆچوونەی نووسەرانی ناوبراو لە جیاکردنەوەی جنسی نێر و مێ لە دۆخی تیان و بانگهێشتندا کارێکی

زانستییە و بە تەواوی لەگەڵ هەڵکەوتی بەشە دیالێکتی موکریدا دەگونجێ.

لێرەدا دوو تێبینیم لە بارەی ئەو باسەوە هەیە:

١- نووسەرانی ناوبراو لەوەدا بە هەڵەچوون کە (ی — î)و (ی — Y)یان بە دوو نیشانە داناوە، چونکە هەر یەك نیشانەن و نیشانەکەش (ی — î)یە، بەڵام کاتێ بەدوای هەندێ دەنگی بزوێندا دێ گۆڕانی بەسەردا دێ و وەك (ی — y) دەردەبڕڕێت. جا بەو پێیە ڕاست نییە وەك دوو نیشانە تەماشا بکرێن. هەر بەو چەشنە (ێ — ê) و (یە — ye)شیان بە هەڵە بە دوو نیشانە داوەتە قەڵەم.

٢- کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا بۆ پێ سەلماندنی بوونی نیشانەی جیاوازی جنسی نێر و مێ هیچ نموونە و بەڵگەیەکیان نەهێناوەتەوە. بێگومان، ئەمەش لە لێکۆڵینەوەی ڕێزماندا ناتەواوییەکی گەورەیە و دەبوو ئەو ڕووە گرنگەی باسەکەیان پشتگوێ نەخەن، بە تایبەتی بۆ بەشە دیالێکتی موکری کە گەنجینەیەکی وەك ((تحفەء مظفریة)) هەیە و دەتوانرێ بۆ ئەو مەبەستە سەدان نموونەی لە بار و گونجاوی لێ وەربگیرێ.

بە دواباسی (جنسەکانی ناو)دا زۆر بەکورتی و بەچەند دێڕێکی ساکار لە (ئیزافە) دواون و (ی — î)و (ی — y)یان بە نیشانەی ئیزافە داناوە (بڕوانە: ل ٢٥). لە بەشی سینتاکسیشدا کاتێ لە دەوری دیارخەر دواون (بڕوانە: ل ١٣٣ — ١٣٤) کەمێ لە نیشانەی (ی) و (ە)ی ئیزافە دواون. سەرەڕای کورتی و ساکاری ئەم باسە، هەروەها دیسان بە هەڵە چوون، کە (ی — y)یان بە نیشانەیەکی سەربەخۆ داناوە.

پاش ئەو دووباسە کورتە — واتە (جنسەکانی ناو) و (ئیزافە)، نووسەران لە(دۆخەکانی ناو) دواون و بەپێی هەڵکەوتی بەشە دیالێکتی ناوبراو سێ

دۆخ: (١- دۆخی ڕاستەوخۆ، ٢- دۆخی تیان، ٣- دۆخی بانگهێشتن)ی ناویان دەست نیشان کردووە و بە نموونەوە لێیان دواون.

لە کۆتاییی باسی بەشە ئاخاوتنی (ناو)دا لە چۆنیەتی ڕۆنانی ناویان کۆڵیوەتەوە (بڕوانە: ل ٢٨ - ٣٨). نووسەران لەو ڕووەوە هەندێ زانیاری نوێ و بەکەڵکیان پێشکەش کردووە و لە گەلێك شوێنی ئەو باسەدا سەرکەوتوون و ژمارەیەك نموونەی جوان و لەباریان دەربارەی ناوی داڕێژراو و لێکدراو هێناوەتەوە. بەداخەوە ئەم باسەش لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر پوختە، هێشتا بێ کەم و کورتی نییە:

یەکێ لەو ناتەواویانە، ئەوەیە کە هەندێ پێشگر و پاشگر یادداشت نەکراون. بە وێنە، لە باسی ئەو پاشگرانەدا، کە بۆ بچووك کردنەوەی ناو بەکاردەهێنرێن، تەنیا ناوی (لە، ێلە، وولە، ۆلە، چکە) هێنراوە (بڕوانە: ل ٣٣). بەڵام دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین، کە لە زمانی کوردیدا جگە لەوانەی نووسەرانی کتێبی ناوبراو باسیان کردوون، ژمارەیەك پاشگری تریش هەن بۆ بچووك کردنەوە بەکاردەهێنرێن، وەك: (ڵە) - ((گۆزەڵە))...)،(ۆکە) - ((بزنۆکە...))، (وولکە) - ((جاشوولکە...))،(ۆچکە) - ((منداڵۆچکە...))، (چە) - ((باخچە...))، (ۆلە) - ((بەرخۆلە...))، (ۆڵ) - ((ئاسکۆڵ...))... وە گەلێکی تر. لەو پاشگرانەی بە ڕەگی کردارەوە یاخود بە ناوی چاوگ (اسم المصدر)ەوە دەلکێن، تەنیا (ار، یار، ەر، مان)یان باس کردووە (بڕوانە: ل ٣٨ - ٣٩). کەچی ئەم پاشگرانەیان: (ە) - ((بارە...))، (گە) - ((لەوەرگە...))، (اك) - ((خۆراك...))، (کە) - ((فڕکە...))... هتد لەیاد کردووە. هەر بەو جۆرەش هەندێ شێوەی وشەی لێکدراو لەبیر کراون.

لە دیاری کردنی دەوری هەندێ پێشگر و پاشگر و لە تێکەڵ کردنی هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتنیشدا هەڵە بەدی دەکرێ. بە وێنە وایان داناوە

کە پاشگری (دار) و (بان) دەچنە سەر ناوی سادە و دەیانکەنە ناوی داڕێژراو. ڕاستە ئەو دوو پاشگرە بە ناوەوە دەلکێن، بەڵام ئەوان ئەوەیان لەیادکردووە، کە هەندێ جار پاشگری (دار) ناوە سادەکە دەکاتە ئاوەڵناوی داڕێژراو، وەك: ((ناودار، نازدار...)). پاشگری (بان)یش بە زۆری ناوی سادە دەکاتە ئاوەڵناوی داڕێژراو، نەك ناو، وەك: ((فیڵباز، کۆتربان، مێ باز...))، جگە لە چەند وشەیەکی کەم کە دەبنە ناو، وەك: ((سەرباز...)).

هەرچەندە، هەندێ کەم و کورتی لە کتێبی ناوبراودا دەبینرێ، بەڵام تێکڕا کارێکی سەرکەوتووە.

جگە لەو چەند باسەی لە سەرەوە لێیان دواین، هەندێ کتێب و نامیلکە و وتاری دیکەش هەن کە باسی بەشە ئاخاوتنی (ناو)یان تێدا کراوە، بەڵام بەداخەوە، لێرەدا مەودای ئەوە نییە کە لە تێکڕایان بدوێین"[٩٠]".

بەم چەشنە — واتە دوای کەمێ نیشاندانی ئەوەی چی لەبارەی بەشە ئاخاوتنی (ناو)ەوە لە زمانی کوردیدا نووسراوە — ئەوەمان بۆ دەرکەوت، کە زۆربەی ئەو کارانەی دەربارەی ئەم کێشەیە نووسراون هەڵە و ناتەواوی و کەم و کورتییان تێدایە و بەلای زۆر لایەنی باسەکەدا نەچوون و تیشکی ڕووناکییان ئاڕاستەی گەلێك ڕووی نەکردووە..

---

٩٠- هەرچەندە کتێبی (D.N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961) وکتێبی (Ernest N. Mccarus, A. Kurdish Grammar, New – York, 1958) دوو سەرچاوەی گرنگن و دەبوو باسیان لێوە بکەین، بەڵام بەداخەوە هەندێ هۆ بوونە بەرهەڵست.

## _ ٢ _

# لێکۆڵینەوەکانی خۆم لە بارەی (ناو)ەوە

## _ ناو _

ناو ئەو وشەیەیە کە ناوی گیاندارێك یان بێ گیانێك یان بیرێك یان کارێك دیاری دەکات"[٩١]". وەك: ژن، ئازاد، ئەسپ، کۆتر، ماسی... بەرد، چیا، گوڵ، زەوی، تری... خەم، بڕوا، منداڵی، جوانی، تاریکی... دروومان، کۆکە، سوتەمەنی، خۆراك، کوتەك...

---

[٩١] - ئەم پێناسەیە تارادەیەك پوختەکردن و فراوان کردنی ئەو پێناسەیەیە کە دەڵێ: ناو ئەو وشەیەیە کە بۆ ناونانی کەسێك یان شتێك بەکاردەهێنرێ. هەرچی ئەو پێناسەیەشە کە دەڵێ: ناو ئەو وشەیەیە کە سەربەخۆ واتایەك دەگەیەنێت کە بە کاتەوە نەبەستراوە، بەلای ئێمەوە پەسەند نییە. وەك لە فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەدا هۆیەکانیمان دەست نیشان کردووە. سەرەڕای ئەوە لێرەدا ئەو ڕاستییەش دەخەمە پێش چاو، کە کەسێك منداڵی خۆی ناودەنێ (نەسرین، شنە، کاوە، دارا...)، یاخود کە بەرزایی بە (گرد، چیا، شاخ، کێو...) ناو دەبا... بیر لە کات هەر ناکاتەوە. جا هەر لەبەر ئەوەی کردار بە کاتەوە بەندە، پێناسەی ناو لەسەر بنچینەی بەراورد لەگەڵ کرداردا هەڵهێنجراوە. نەك ئەو چەشنە ڕێبازە بۆ دانانی پێناسەی ناو هەر باش نییە، بەڵکو لە پێناسەکەشدا تەنیا چمکێکی ئەو بەراوردە گیراوە. وەك ئاشکرایە سەرەڕای بەستران و نەبەستران بە کاتەوە، هەروەها هەندێ جیاوازی دی لە نێوان ئەو دوو بەشە ئاخاوتنەدا هەیە.

# ناو لە ڕووی ناوەرۆکەوە

لە زمانی کوردیدا ناو لە ڕووی ناوەرۆکەوە سێ جۆرە:

**١- ناوی تایبەتی (الاسم الخاص، اسم علم – Proper noun)**

ناوی تایبەتی ئەو ناوە دەوترێ کە بەسەر گیاندارێك یان بێ گیانێك دیاری کراودا دابڕابێ.

چۆن لە گشت زمانێکدا، هەروەها لەزمانی کوردیشدا، بەشێکی زۆری ناوی تایبەتی، ناوی مرۆڤە. وەك: نەسرین، شیرین، پەروین، گولاڵە، پرشنگ، چنار، هاژە، شنە، هێرۆ... شێرکۆ، هیوا، ئامانج، شێرزاد، خەبات، دلێر، سەردار...

**نەسرین دەمێکە داخت لە دڵمە**

**گیرۆدەی بەندی، ژیانت زوڵمە**

**(بێکەس، ل ٥٣)**

**ڕۆڵە لای لایە... (شێرکۆ) لای لایە**

**شەوگار درەنگە، بۆچ خەوت نایە؟**

**(بێکەس، ل ١٠٥)**

لەو دوو نموونەیەی سەرەوەدا، وشەکانی (نەسرین) و (شێرکۆ) دوو وشەی تایبەتین، چونکە ناوی دووکەسی دیاری کراو نیشان دەدەن. کە وترا (نەسرین) یاخود (شێرکۆ)، ئەوە یەك (نەسرین)و یەك (شێرکۆ) مەبەستە.

**هەروەها ناوی تایبەتی دەلۆی چیا و ڕووبار و شارو دێ و ولات و میللەت و... هتد بێت، وەك:**

نموونە بۆ ناوی چیا:

**گەردنی کوردی لە کێوی بێستون مەحکەمترە**

**چونکە صەد ساڵە لەژێر باری غەمایە و نانەوێ**

**(کوردی، ل ٣٧)**

نموونە بۆ ناوی ڕووبار:

**سیراوانی ئەو چەم تانجەرۆی ئەم چەم**

**بدەن وەهەمدا ئەم چەم تا ئەو چەم**

**(پیرەمێرد، ل ١٣٤)**

نموونە بۆ ناوی شارو دێ:

**داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی (خاك و خۆڵ)**

**هەتا نەکەی بە خاکی (سولەیمانی) یا عوبوور**

**(نالی، ل ١٨١)**

نموونە بۆ ناوی میللەت:

**دڵم خوێن ڕێژو سەرگێژە، دوو چاوم پڕ لە ئەسرینە**

**عیلاجی دەردی ((بێکەس)) هەر ژیانی میللەتی کوردە**

**(بێکەس، ل ٢٣)**

**... هتد.**

بەم جۆرە وشەکانی (بێستوون، سیروان، تانجەرۆ، سولەیمانی، خاك و خۆڵ، کورد...)، کە ناوی شتی ناسراوو دیاری کراو نیشان دەدەن، بە ناوی تایبەتی دادەنرێن.

## ٢- ناوی گشتی (الاسم العام – Common nouns)

ناوی گشتی بەو ناوە دەوترێ کەبەسەر ئەو هەموو گیان دار و بێ گیان و بیر و کارانەدا دابڕاوە، کە خاوەنی یەك ڕەگەز و یەك جنسن. وەك: ناوی کەسان(دایك، کچ، ژن، باوك، کوڕ، مامۆستا...)، ناوی گیاندار و باڵندە (شێر، ئەسپ، کۆتر، کەو...)، ناوی شت (دار، بەرد، خانوو، ڕووبار، چیا...)، ناوی بیر و مەفهووم و کار (بڕوا، هێز، شەرم، جوانی، پاکی، منداڵی، خۆراك، دروومان...)...هتد.

نموونە لەسەر ناوی کەسان:

**بەختی دایك جیازیی کچە**

**(پەندی پێشینان، ل ١٠٥)**

لەم نموونەیەدا دوو وشەی (دایك)و(کچ) دوو ناوی گشتین، چونکە بەگشت دایکێ دەوترێ (دایك) و بە گشت کچێ دەوترێ (کچ).

نموونە بۆ ناوی گیاندار:

**ئەسپ پێ یەکی ڕەنجە، پێ یەکی گەنجە**

**(پەندی پێشینان، ل ٢٧)**

وشەی (ئەسپ) ناوێکی گشتییە، چونکە بە هەموو ئەسپێك دەوترێ (ئەسپ).

نموونە بۆ ناوی شت:

**بوومە خاکی سەری ڕێی پێ یەکی تا پێمانا**

**وتی: صەد دەفعە بخۆ ئەی حەریکەی بێ مانا**

**(مەحوی، ل ٣٣)**

وشەکانی (خاک) و (ڕێ) و (پێ) هەموو ناوی گشتین، چونکە بەهەموو خاکێك دەوترێ (خاک) و بە هەموو ڕێیەك دەوترێ (ڕێ) و بە هەموو پێیەك دەوترێ (پێ).

نموونە بۆ ناوی بیر و مەفهووم:

**ئەمڕۆ ڕۆڕۆیە شین و ماتەمە**

**چەرخی نیلگوون خومخانەی خەمە**

**(پیرەمێرد، ل ٣١٧)**

**مەثلی عەهد و وەفا وەك مثثلی عەنقایە**

**پیاوەتی باسی لەکن کەس مەکە، ئادەم بوە قات**

**(مەحوی، ل٦٢)**

وشەکانی (شین) و (ماتەم) و(خەم) و (پیاوەتی) کە مانای تەجرید دەدەن، ناوی گشتین.

... هتد.

لە واقیعدا دەبینین ((خانوو)) جۆری ئێجگار زۆرە: خانووی بەرد، خانووی خشت، خانووی قوڕ... خانووی یەك نهۆم، خانووی فرەنهۆم... ڕەنگی جیاواز و شێوە و فۆڕمی جۆراوجۆر... کەچی بە هەموویان دەتوانین بڵێین ((خانوو)). ئێمە دەتوانین دوو ((خانوو))ی سەرتاپا وەك یەك بێنینە

بەرچاو، بەڵام بە هیچ جۆرێك دوو ((مرۆڤ))ی وەك یەك نابینین. هەر مرۆڤێك جیاوازییەکی لەگەڵ مرۆڤانی تردا هەیە، کەچی وشەی ((مرۆڤ)) بۆ هەموو ((مرۆڤێك)) بەکار دەهێنرێ. ئەمەش تەجریدی واتای وشەیە — واتە واتای گشتیی وشەیە.

لە زمانی کوردیدا ناوی گشتی دەتوانێ ببێتە ناوی تایبەتی — واتە وای لێ بێ کە مەبەست ناوی کەسێك بگەیەنێ. بە وێنە وشەی (ڕووبار، تاڤگە، هەڵۆ، قومری، شەپۆل، شەماڵ، شنە، هاژە، ئاهەنگ...) کە لە بنەڕەتدا ناوی گشتین، ئێستا وەك ناوی تایبەتیش دەبینرێن، ئەویش ئەوەیە کە بوونەتە ناوی کچ و کوڕ و بە مەبەستی ناوی کەسێك دەگەیەنن.

بە پێچەوانەشەوە، ناوی تایبەتی دەتوانێ ببێ بە ناوی گشتی، ئەگەر وای لێ بێ کە مەبەست کۆمەڵێ کەس یاخود کۆمەڵێ شتی هاوڕەگەز و هاوخاسیەت بگەیەنێ. ئەمیش پتر واتای مەجاز و ئیدیۆم وەردەگرێ. بەوێنە((بەکر مەرگەوەڕ)) ناوی قارەمانێکی داستانی ((مەم و زین))ەو ناوێکی تایبەتییە، بەڵام ماناکەی وای لێ هاتووە کە هەموو کەسێکی فیتنە و پیاو خراپ بگرێتەوە و بەو جۆرە وەك ناوێکی گشتی کار دەکات.

**٣- ناوی کۆمەڵ (الاسم الجمعي – Collective noun)**

ناوی کۆمەڵ ئەو ناوەیە کە لە ڕواڵەتدا تاك و لە ناوەرۆکدا کۆ نیشان دەدات، وەك: گەل، میللەت، هۆز، کۆمەڵ، پۆل، لەشکر، چین، دەستە...و گەلێکی تر.

**ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد**
**مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوور و نزیك ئەبرد**

**(پیرەمێرد، ل ١١٩)**

**تا ئێستە ڕووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا**

**قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا**

**(پیرەمێرد، ل١٢٠)**

... هتد.

لەم نموونانەدا دەبینین وشەکانی (گەل، میللەت...) لە ڕواڵەتدا تاکن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا کۆن – واتە کە وترا (گەل، میللەت...)، ئەوە تێکڕا ئەو کەسانە و ئەو شتانە مەبەستن کە لە واتای (گەل)و (میللەت)دا هەن.

# ناو لەڕووی هەبوونەوە

ناو لەڕووی هەبوونەوە دوو جۆرە:

**١- ناوی مادی (الاسم المادي – Material noun)**

ناوی مادی ناوی ئەو شتانە دەگرێتەوە کە بەر یەکێك یاخود پتر لە پێنج هەستی مرۆڤ بکەوێ" [٩٢] ". وەك: کەو، دار، گوڵ، ئاسمان، زەوی، گەنم، پەنیر، شەونم، گیا، ئاسۆ، دەنگ، کۆکە، با، شنە، هەور، تریشقە، گۆشت، خوێن...

**٢- ناوی مەعنەوی (الاسم المعنوي – Abstract noun)**

ناوی مەعنەوی ناوی شتێکە کە بوونی سەربەخۆی نییە، بەڵکو لە شتی بەر هەست وە یا لە شتی بیر و خەیاڵدا پەیدا دەبێ. وەك: هۆش، بڕوا، خەم، شەرم، هێز، جوانی، پیاوەتی، شەرم...

لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ دوو جۆر ناوی مەعنەوی دەست نیشان بکرێ:

**ا- ناوی مەعنەوی بنجی:**

ناوی مەعنەوی بنجی ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە هەر لە بنچینەدا بۆ واتا دانراون، وەك: خەم، بڕوا، شەرم، هێز، هۆش...

---

[٩٢] - هەندێ لە نووسەرانی کورد و بێگانە وایان داوەتە قەڵەم کە ناوی مادی دەبێ ئەو شتانە بێ کە دەبینرێن و دەگیرێن. جا بەو پێیە وشەکانی وەك: (کۆکە، با، شنە، دەنگ...) بەر ئەو پێناسەیەی ئەوان ناکەوێ، بەڵام لە ڕاستیدا هەر شتێك کە بوونی هەبێ و بەر هەر یەکێك لە پێنج هەستەکانی مرۆڤ بکەوێ ناوی مادییە.

**ب- ناوی مەعنەی ڕونراو:**

ناوی مەعنەوی ڕۆنراو ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە لە وشەیەکی مادی یان مەعنەوییەوە وەرگیراون و بە یاریدەی پاشگر ساز بوون"[93].

ناوی مەعنەوی ڕۆنراویش بەزۆری لە ناو و ئاوەڵناوەوە وەردەگیرێ:

أ- ناو + پاشگری (ی، ەتی/ێتی، ایەتی، ێنی).

منداڵ + ی = منداڵی

پیاو + ەتی = پیاوەتی

دز + ێتی = دزێتی

دۆست + ایەتی = دۆستایەتی

کچ + ێنی = کچێنی

ب- ئاوەڵناو + پاشگری (ی، ەتی/ێتی، ایەتی، ایی).

جوان + ی = جوانی

گەورە + ەتی = گەورەیەتی

بەرز + ێتی = بەرزێتی

بڵند + ایەتی = بڵندایەتی

قووڵ + ایی = قووڵایی

---

[93] - پێناسەی (ناوی مەعنەوی) و (ناوی مەعنەوی بنجی) و (ناوی مەعنەوی ڕۆنراو)م لە بەرهەمی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ وەرگرتووە (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٢، ٢٤) و دەستکاریم کردووە.

## ناو لە ڕووی ڕۆنانەوە

وەك لە بەشی یەكەمی ئەم كتێبەدا نیشانمان داوە، بەشێك لەو كارانەی دەربارەی ڕێزمانی كوردی نووسراون، باسی ڕۆنانی ناویان كردووە. بەلاَم بەداخەوە نەك هەر كەم و كورتی و ناتەواوی و هەڵەیان تێدایە، بەڵكو بەلای زۆر كێشەشیدا نەچوون.

سەرەڕای ئەو كتێب و نامیلكە و وتارانەی لە باسی بەشە ئاخاوتنی (ناو)دا لە (ڕۆنانی ناو) دواون و ئێمە لە فەسڵی یەكەمی ئەم كتێبەدا لێیان كۆڵیوینەتەوە، هەروەها چەند كارێكی دیش هەن كە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە ڕۆنانی وشەوە هەیە. لێرەدا بەكورتی لەبارەی ئەوانەوە دەدوێین كە زیاتر بەرچاون و پێوەندیان بە ڕۆنانی بەشە ئاخاوتنی (ناو)ەوە هەیە:

یەكێك لەو كارە بەرچاوانە ئەو نامیلكە ٥٩ لاپەڕەییەیە كە مامۆستا نوری عەلی ئەمین لەژێر ناوی ((گرتنی كەلێنێكی تر لە ڕێزمانی كوردی))دا لەبارەی (پێشگرو پاشگر)ەوە نووسیوێتی"[٩٤]". هەرچەندە نووسەر لە باسەكەیدا پەنجەی بۆ ئەوە ڕانەكێشاوە و لەوە نەدواوە كە پێشگر و پاشگر كەرەستەی گرنگی ڕۆنانی وشەن، بەلاَم بەرهەمەكەی كارێكی گەورە و بەنرخە. ئەو هەموو پێشگر و پاشگرانەی مامۆستا نووری عەلی ئەمین ماوە بیست ساڵێك لەمەوبەر دەركی پێ كردوون و تۆماری كردوون و لێیان دواوە،

---

[٩٤] - ئەگەر ((بەرین)) بە مانای ((پێشین)) بەكار بهێنرێ، هەرچەندە كەمتر بەو مانایە بەكاردەهێنرێ، ئەودەم دەبێتە ناو.

ئەمڕۆ لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی وشەڕۆنانی زمانی کوردیدا کەرەستەیەکی کەم هاوتان و هیشتا زمانناسانی کورد شتێکی ئەوتۆیان لێ زیاد نەکردووە.

بێگومان، ئەو کارە وەك تاقی کردنەوەیەکی یەکەم لەبارەی پێشگر و پاشگرەوە ناکرێ لەم کەم و کورتی بێ بەش بێ.

ناتەواوی هەرەگەورەی نووسراوی ناوبراو لەوەدایە کە نیشانەی لەگەڵ پێشگر و پاشگر تێدا تێکەڵ کراوە — واتە بەشێوەی مانای ڕێزمانی لە یەك جیا نەکراونەتەوە. نووسەر گەلێك نیشانە، وەك: (تر)ی پلەی بەراورد و (ترین)ی پلەی بالاو (ان)ی کۆ و (ەکە)ی ناسیاوی و (ێك، ێ)ی نەناسیاوی و کۆتاییی هەندێ کردار (را — لە ((کێڵرا، ڕووخێنرا...))دا و (رێ — لە ((ئەخوێنرێ، بنووسرێ...))دا بە پاشگر داناوە. (ئە)ی نیشانەی موزارەعەت و (ب)ی نیشانەی فەرمانی بە پێشگر داوەتە قەڵەم. ئەو نموونانەی سەرەوە کە پاشگر و پێشگری ڕێزمانین، لەگەڵ پێشگر و پاشگری ڕاستەقینەی وشەداڕێژدا جیانەکراونەتەوە، وەك پێشگری (ڕا) لە وشەی ((ڕاهاتن، ڕاگرتن...))، (پێ) لە وشەی ((پێویست، پێخەف...))دا، (هەڵ) لە وشەی ((هەڵچوون، هەڵهێنان...))دا، پاشگری: (ۆڵ) لە وشەی ((ئاسکۆڵ، کرمۆڵ...))دا، (کەر) لە وشەی ((نانکەر، سواڵکەر...))دا، (انە) لە وشەی ((جەژنانە، پووشانە...))دا... کە پێشگر و پاشگرن و یاریدەی ڕۆنانی وشەی داڕێژراو دەدەن.

وەك من بەدیی دەکەم و بۆی دەچم هۆی ئەم تێکەڵ کردن و جیانەکردنەوەیە، ئەوەیە نووسەر بە تەواوی بۆ ئەوە نەچووە کە پێشگر و

پاشگر چین و جیاوازیان لەگەڵ نیشانەدا چییە. ئەمەش لە پێناسەکانی نووسەردا و لە لێکدانەوە و باس کردنی هەندێ کەرەستەدا بەدی دەکرێ.

کەم و کورتییەکی دیکەی ئەو نامیلکەیە، ئەوەیە لە دیاری کردنی بار و دەوری هەندێ پێشگر و پاشگر و لە تێکەڵکردنی هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتندا هەڵە دەبینرێ. بۆ وێنە، دەربارەی پاشگری(ین)، مامۆستا نووسیوێتی: ئەم پاشگرە دەچێتە سەر (ناو) و (ئاوەڵناو)، وە دەیانکاتە ئاوەڵناو (بڕوانە: ل ٢٧). نووسەر بۆ پێ سەلماندنی ئەو ڕایەی هەندێ نموونەی هێناوەتەوە، وەك: ((ئاگرین، بەفرین، نەرمین...)). ڕاستە وشەی ((ئاگر، بەفر)) ناون و بە یاریدەی پاشگری (ین) دەبنە ئاوەڵناو، بەلام وشەی ((نەرم)) ئاوەڵناوە و کاتێك پاشگری (ین)ی دەچێتە سەر دەبێتە ناو — واتە دەبوو بیوتایە دەچنە سەر (ناو) و دەیکەن بە (ئاوەڵناو) و بە پێچەوانەشەوە.

لە بەشی دووەمی پاشگری ناوبراودا، نووسەر دەڵێ: دەچێتە سەر (ئاوەڵکردار) و دەیکاتە (ناو). نموونەکانیشی ئەمانەن: ((سەرین، پێشین، بەرین...)). بێگومان وشەی (پێش) ئاوەڵکردارە و کاتێ پاشگری (ین)ی پێوە دەلکێ دەبێتە ناو. وشەی ((بەر))یش ڕاستە هەر ئاوەڵکردارە، بەلام (ین) نایکاتە ناو، بەڵکو دەیکاتە ئاوەڵناو. هەرچی وشەی ((سەر))یشە لێرەدا ناوە، نەك ئاوەڵکردار. (ین)یش هەر بە ناوی هێشتوویەتیەوە.

یاخود لە بەشی سێیەمی پاشگری (ە)دا نووسیوێتی: ناو لە ئاوەڵکردار دروست دەکات، وەك: ((هاوینە، پشتە، زستانە، پایزە، بەهارە، شەوە)) (بڕوانە: ل ٨). لە تێکڕای ئەو نموونانەدا تەنیا وشەی ((پشت)) ئاوەڵکردارە

و بە یاریدەی پاشگری (ە) بووەتە ناو. دەنا ئەوانی دیکە ناوی کات (اسم الزمان)ن و کە پاشگری (ە)شیان پێوە دەلکێ دەبنە ئاوەڵناو (جگە لە وشەی ((شەوە))کە دەبێتە ناو)، نەك ناو. بەداخەوە ئەم جۆرە نموونانە لە نووسراوی ناوبراودا کەم نین.

هەروەها ژمارەیەك پیشگرو پاشگر هەن، وەك: (بێ) — ((بێ هۆش...))، (بە) — ((بەهێز...))، (نە) — ((نەخۆش...))، (دا) — ((دابەزین...))، (ڕا) — ((ڕاهاتن...))، (هەڵ) — ((هەڵچوون...))، (ڕۆ) — ((ڕۆچوون))، (وەر) — ((وەرگێڕان...))، (پێ) — ((پێگەیشتن...))، (تێ) — ((تێ کردن...))، (لێ) — ((لێنان...))، (وە/ەوە) — ((کردنەوە...))، (اندن) — ((سووتاندن...))...و گەلێکی تر کە تۆماری نەکردوون و لێیان نەدواوە.

ئەمەش بەو بەر هەمانەدا کە مامۆستا دواتر بلاوی کردوونەتەوە، وا دەردەکەوێ بەشێکیان بە پێشگر و پاشگر دانانێ و بەشێکی دیکەشیانی لا ئاشکرا نەبووە.

هەرچەندە هەندێ کەم و کورتیی دی لە کتێبی ((گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی))ی مامۆستا نووری عەلی ئەمیندا بەرچاو دەکەون، ئێمە لێرەدا نووکی قەڵەممان بەزۆری لەسەر ئەو بەشە داناوە، کە پێوەندی بە ڕۆنانی بەشە ئاخاوتنی ناوەوە هەیە.

مامۆستا فارووق عومەر صدیق بە ناونیشانی ((وشەسازی لە زمانی کوردیدا)) وتارێکی بلاوکردۆتەوە"[95]" لە پاشگری (ی)ی ناوی مەعنا و (ی)ی

---

[95] - فارووق عومەر صدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد))، ب٣، ژ١، بەغدا، ١٩٧٥، ل ١٩٨ — ٢٤٢.

سیفەی نیسبی دواوە و بە دوورو درێژی لە پەیدابوون و گەشەکردنیانی کۆڵیوەتەوە — واتە باسی ئەو پاشگرانەی لە زمانی فارسیی ناوەڕاست و تازەدا کردووە و لەگەڵ کوردیدا بەراوردی کردوون. دەوریانی لە گەیاندنی مانا و مەبەست، لە داڕشتنی وشەدا... نیشان داوە. هەرچەندە نووسەر لە چەند شوێنێکی وتارەکەیدا بە هەڵە چووە (کە نرخێنەر مامۆستا مەسعوود محەمەد بەشێکی زۆریانی لەگەڵ وتارەکەدا ڕاست کردۆتەوە)"[٩٦]"، بەڵام بەگشتی هەندێ زانیاری نوێی لەبارەی ئەو دوو پاشگرەوە تۆمار کردووە.

د. فارووق عومەر صدیق لە کورتەی نامەی دوکتۆرییەکەشیداکە بەناوی ((ڕۆنانی ناو"[٩٧]" لە زمانی ئەدەبیی کوردی عێراقدا))وەیە"[٩٨]" دەربارەی ئەو پێشگر و پاشگرانەی ناوی داڕێژراو (بڕوانە: ل ١٤ — ٢٠) و ئەو حاڵەتانەی ناوی لێکدراویان لێ پەیدا دەبێ (بڕوانە: ل ٩ — ١٤) دواوە. ئەوەی شایانی باس بێ، ئەوەیە کە نووسەر لەم کارەدا لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی بۆ ئەو پێشگر و پاشگرانەی لە زمانی کوردیدا لە ڕۆنانی ناودا هاوبەشی دەکەن، سازکردووە. لە ڕێگەی کەڵك وەرگرتنیشەوە لە چەند سەرچاوەیەکی زانستی (لەناو هەمووشیاندا بەتایبەتی کتێبەکەی ڤ.س. ڕاستەرگویڤا) توانیویێتی ڕەسەن و دەوری پێشگر و پاشگرە کوردییەکان دیاری بکا و لەگەڵ زمانی

---

[٩٦] - لەبەر ئەوەی ڕام لەگەڵ زۆربەی تێبینی و سەرنجەکانی مامۆستا مەسعوود محەمەددا یەك دەگرنەوە، بۆیە بە پێویستی نازانم درێژە بە باسی ئەو وتارە بە دەم.

[٩٧] - مەبەستی (باب الاسماو)ە.

[٩٨] - لێرەدا واز لە باسی کەم و کورتی ئەو بەرهەمە دێنم، چونکە بەدەستمەوەیە بە وتارێکی سەربەخۆ لێی بدوێم. سەرەڕای ئەوە لەچەند پەراوێزێکی لێرە بەدواشەوە هەندێ سەرنج و تێبینیم لەبارەیەوە دەربڕیوە.

فارسی ناوەڕاست و نوێدا بەراوردیان بکا... بێگومان وەك هەموو سەرەتایەك ئەم بەرهەمەش بێ کەم و کورتی نییە"[99].

ناو لە زمانی کوردیدا لە ڕووی ڕۆنانەوە دەبێ بە دوو بەش:

١- ئەو ناوانەی بەسەر مۆرفیێمدا دابەش دەبن. وەك: کۆگا، سەرۆك، پاوانە، لوتکە، بەردەلآن، بەردەنوێژ، خاکەناز، شەکراو، ڕەشمار، گوڵەبەڕۆژە... هتد.

٢- ئەو ناوانەی بەسەر مۆرفیێمدا دابەش نابن. وەك: سەر، شەڕ، جۆ، لووت، دار، بەرد، هێز، ژن، کچ، کوڕ... هتد.

کەرتکردنی ناو لە ڕووی مۆرفۆلۆژییەوە لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا کارێکی گرنگە. ئەمە نەك تەنیا چۆنیەتیی ڕۆنان و پێکهاتن و دروست بوونی ناو ئاشکرا دەکا، بەڵکو یارمەتیی ڕوونکردنەوەی تەواو قوڵتری ماناو ناوەڕۆکیشی دەدات و پێوەندی لەگەڵ وشەی تردا دیاری دەکا.

لە زمانی کوردیدا بۆ ڕۆنانی ناو چەند ڕێگایەك هەیە. ئەوەی لە ناویاندا سەرەکی بێ (دارِشتن) و (لێکدان)ە. واتە ئەو دوو ڕێگەیە هۆیەکی گرنگن لە دروستکردنی ناوی داڕێژراو و لێکدراودا.

ناوی داڕێژراو - ئەو ناوە ناسادەیەیە کە لە وشەیەکی سادە و زیادی پێکهاتبێت. ئەوجا زیادییەکە پێشگر یا پاشگر یا هەردوو (پێشگر و پاشگر) پێکەوە بن، وەك: کارگە، کەمەرە، ئاگردان، تاریکایی، دەسرۆکە، بێ کاری، نەخۆشی... هتد.

[99]- د. فارووق عومەر صدیق، ڕۆنانی ناو لە زمانی ئەدەبیی کوردی عێراقدا (کورتەی نامەی دوکتۆری)، مۆسکۆ، ١٩٧٧.

ناوی لێکدراو — ئەو ناوە ناسادەیەیە کەوا بەلای کەمەوە دوو وشەی واتاداری تێدابێ، وەك: گوڵەگەنم، ڕەشەبا، زەرداو، لێفەدروو، هێلکەوڕۆن، شاهەنگ، مارماسی... هتد"[100].

## ناوی داڕێژراو

وەك لە سەرەوە باسمان کرد ئەو زیادییەی دەچێتە سەر وشەیەکی سادە و دەبێتە هۆی دروستکردنی ناوی داڕێژراو بریتییە لە: پێشگر و پاشگر یا هەردوو (پێشگرو پاشگر) پێکەوە. ناوی داڕێژراو لە زمانی کوردیدا بەزۆری بەیارمەتیی پاشگر پێك دێ "[101]. بۆ ڕۆنانی ناوی داڕێژراو هەندێ پاشگر هەن

---

[100] - بۆ تەعریفی ناوی داڕێژراو و لێکدراو بەتایبەتی سوودم لەو پێناسە وەرگرتووە، کە لیژنەی ((زمان و زانستەکانی))کۆڕ بۆ ناوی داڕێژراو و لێکدراو پەسەندی کردووە (بڕوانە: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ب ٣، ژ١، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٤٠٤ — ٤٠٥).

لیژنەی ناوبراو سنووری تەواوی لە نێوان ناوی داڕێژراو و لێکدراودا کێشاوە و لە هیچ شوێنێکی باسەکەیدا تێکەڵی نەکردوون.

مامۆستا تۆفیق وەهبی هەرچەندە لە بەشی جۆری وشەی کتێبی ((قواعد اللغە الکردیە))، الجزو الاول، الباب الپانی، بیروت، ١٩٦٥، ل ٨١ — ٨٢ دا باسی وشەی داڕێژراوی نەکردووە، بەڵام وشەی لێکدراوی لەگەڵ وشەی داڕێژراو تێکەڵ نەکردووە و ئەو نموونانەی بۆ نیشاندانی وشەی لێکدراو هێناونیەوە جوان و لەبارن... لە کتێبی (دەستووری زمانی کوردی، جزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩، ل ٥٠ — ٥٨)یشدا بە ناوی (وشەی دروست کراو) و (وشەی لێکدراو)ەوە جیاوازی لە نێوان جۆرەکانی وشەی ناسادەی کوردیدا کردووە و زانایانە لەو کێشەیەی کۆڵیوەتەوە.

کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا بە ڕێکوپێکی جیاوازییان لە نێوان وشەی داڕێژراو و لێکدراودا داناوە... بەداخەوە بەشێکی زۆر لە زمانناسانی کورد ئەو دوو جۆرە وشەیەیان تێکەڵ کردووە (بڕوانە فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبە).

[101] - جگە لە چەند حاڵەتێکی کەم، کە هەندێ پێشگر بە ڕەگی کردارەوە دەلکێنن و ناوی داڕێژرا و دروست دەکەن. ئەویش لە (لاپەڕە ١٣٣)ی ئەم نووسراوەدا باسیان لێوە کراوە،

دەچنەسەر (ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکردار...)ی سادە و دەیکەنە ناوی داڕێژراو:

أ-ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ناوی سادە و دەیانکەنە ناوی داڕێژراو"[102]":

١- – گەر"[103]". وەك:

ئاسنگەر، مزگەر...

٢- دار"[104]". وەك:

---

بەڵام بە پێچەوانەوە لە کاری ڕۆنانی کرداری داڕێژراودا پێشگر دەوری گرنگ دەبینێ. ئەمەش تایبەتێتییەکی وشە ڕۆنانی زمانی کوردییە.

[102] - لەبەرئەوەی لێرەدا لە باسی داڕشتن دەدوێین، وای بەباش دەزانین دابەشکردنەکەمان بەو جۆرەبێت – واتە پێشگر و پاشگرەکان دابەش بکەین بەسەر ئەوانەدا کە ناوی داڕێژراو لە ناو و ئاوەڵناو و کردار و ئاوەڵکرداری سادە پێك دێنن. دەنا دەتوانرێ لێکۆڵینەوەکە بە شێوەیەکی دیش بکرێ – واتە هەرپێشگر و پاشگرێك بەجیا باس بکرێت. جا بۆ باش نیشانە پێکان ڕێگەی یەکەممان گرتووە.بۆیە کجاری پشتگوێ نەخستنی ڕێگەی دووەمیش، تاڕادەیەك دەربارەی ئەو پێشگر و پاشگرانەی یاریدەی ڕۆنانی ناوی داڕێژراو دەدەن، لە پەراوێزدا هەندێ زانیاریمان تۆمار کردووە.

[103] - پاشگری (گەر) کەم بەکاردێ و سەرەڕای ئەوەش تەنیا دەچێتە سەر ناو. لە کرمانجی ژووروودا لە شێوەی (گار)یشدا بەرچاودەکەوێ. مامۆستا چەرکەزی بەکۆ لە ڕایەدایە کەپاشگری (گەر) لە ڕەگی کرداری (گەریان)ەوە وەرگیراوە (بڕوانە: چ. خ. بەکۆ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ٢٤٧). ئەوەی جێی گومان بێ، ئەوەیە کە مامۆستا بەکۆ بۆ پێ سەلماندنی ئەو ڕایەی هیچ بەڵگەیەکی نەهێناوەتەوە. هەروەها ئەوەش ئاشکرایە کە لە کرمانجی خوارووودا کردارەکە کە (گەڕان)ە، ڕەگەکەی (گەڕ)ە. جا دەنگی (ڕ)ی ڕەگی ئەو کردارە قەڵەوە و هیی پاشگرەکە لاوازە.

[104] - (دار) پاشگرێکی چالاکەو تەنیا دەچێتە سەرناو. هەرچەندە ناوی سادە دەکاتە ناوی داڕێژراو، بەڵام هەندێ جار ناوە سادەکە دەکاتە ئاوەڵناویش، وەك: نازدار، ناودار... ئەم پاشگرە لە کرمانجیی ژووروشدا هەر وەك کرمانجیی خواروو دەبینرێ، وەك: گوهدار، دەرسدار (بڕوانە: چەرکەزی بەکۆ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، ل ٢٤٦). کەریمی ئەیووبی و ئی.ئا. سمیر نۆڤا لەوڕایەدان کە ئەم پاشگرە لە ڕەگی کرداری ئێستا (الفعل المضارع)ی کرداری ((داشتن))

گیاندار، دوکاندار...

٣- ساز"[١٠٥]". وەك:

دانساز، چەخماخساز...

٤- بەند"[١٠٦]". وەك :

نالبەند، کەمەربەند...

٥- وان/ ەوان"[١٠٧]". وەك:

گاوان، باخەوان...

٦- چی"[١٠٨]". وەك:

---

(بوون، هەبوون)ی فارسی یەوە پەیدابووە. (بڕوانە: کتێبی ((دیالێکتی کوردی موکری))، ل ٢٨).

١٠٥ - پاشگری (ساز) دەچێتە سەر ناو. کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا دەڵێن: پاشگری (ساز) لەڕەگی کرداری ئیستای ((ساختن)) (کردن، دروست کردن)ی فارسی یەوە پەیدابووە (بڕوانە: کتێبی ناوبراو، ل ٢٩).

١٠٦ - پاشگری (بەند) لەکرمانجیی ژووروشدا بەهەمان شێوە دەبینرێ (بڕوانە: قەناتی کوردۆ، دەستووری زمانی کوردی، مۆسکۆ – لێنینگراد، ١٩٥٧، ل ٢٩٩). کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤاش وا ڕادەگەیەنن کە پاشگری (بەند) لە ڕەگی کرداری ئێستای ((بستن)) (بەستن، گرێ دان، داخستن)ی فارسی یەوە هاتووە (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٩).

١٠٧ - هێشتا بە تەواوی ڕوون نەکراوەتەوە ئاخۆ ئەو بزوێنی (ە)یەی لە پێش هەندێ پاشگرەوە دێ، ڕەسەنە یاخود پێوەندە، وەك: وان/ەوان، وە/ەوە... لەبەر ئەوە هەردوو شێوەکەیان دەنووسین.

پاشگری (وان/ەوان) چالاکەو بەناوە دەلکێ. لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە شێوەی (ڤان) دەبینرێ، وە: گاڤان، ئاشڤان،.. لە فارسیی ناوڕاستدا پاشگری (پان) بۆ هەمان مەبەست بەکاردەهێنرا (بڕوانە: ڤ.س.ڕاستۆرگویڤا، زمانی فارسی ناوەڕاست، مۆسکۆ، ١٩٦٦، ل ٣٤).

١٠٨ - پاشگری (چی) دەچێتە سەر ناو و لە هەردوو دیالێکتی سەرەکی کوردیدا بە شێوەیەکی چالاك دەبینرێ.

چایچی، خانچی...

٧- باز"[١٠٩]". وەك:

سەرباز، کۆتر باز...

٨- کەر "[١١٠]". وەك:

نانکەر، ڕاوکەر...

٩- مەند"[١١١]". وەك:

هونەرمەند، دەوڵەمەند...

**تێبینی**: پاشگری (گەر، دار، ساز، بەند، وان/ەوان، چی، باز، کەر، مەند) بە زۆری یارمەتیی داڕشتنی ناوێك دەدەن، کە پیشە و ئیشی یەکێکی پێ دیاری بکەن. هەروەها هەندێکیان بۆ مەبەستی دیکەش بەکاردێن"[١١٢]".

---

[١٠٩] - پاشگری (باز) هەروەها ئاوەڵناویش پێك دێنێ، وەك: فێڵباز.. کەریمی ئەیووبی و ئی.ئا. سمیر نۆڤا وشەی (فێڵباز)یان بەناو داناوە(بڕوانە: کتێبی ناوبراو، ل ٢٨). ئاشکرایە کەوا ناوبراوان لەمەدا بە هەڵە چوون.

[١١٠] - (کەر) بە زۆری دەچێتە سەر ناو و یەکێکە لە پاشگرە هەرە چالاکەکانی نێو کۆمەڵەکەی د. فارووق عومەر صدیق زۆر ڕاستە کە دەڵێ: ئەم پاشگرە بەرانبەر (کەرە)ی فارسی کۆن و (کەر)ی فارسی ناوەڕاست دەوەستێ (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، کورتەی نامەی دوکتۆری، ل ١٥)

[١١١] - پاشگری (مەند) هەندێ جاریش ناوەکە دەکاتە ئاوەڵناو. لە کرمانجیی ژووروشدا بەهەمان شێوە دەبینرێ، وەك: هونەرمەند، دەوڵەمەند (بڕوانە: چەرکەزی بەکۆڤ، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٤٧). پاشگری ناوبراو بەرانبەر (ۆمەند/ یمەند/ مەند)ی فارسی ناوەڕاست دەوەستێ، وەك ((سووت – سووتێمەند)) (سوود – سوودمەند) (بڕوانە: ڤ. س. ڕاستۆر گویڤا، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٣٤).

[١١٢] - کەریمی ئەییوبی ئی. ئا. سمیر نۆڤا بۆ ئەم گروپە هەشت پاشگری (وان/ەوان، باز، دار، گەر، بەند، چی، ساز، ی – سیفەی نیسبی)یان داناوە... لێرەدا دەبوو: دوو پاشگری (کەر) و (مەند)یش باس بکەن و ئەو هەڵە گەورەیەش نەکەن کە پاشگری (ی)ی سیفەی نیسبی بە پاشگری داڕێژی ناو دابنێن. (بڕوانە: پەرائێزی ژ ٢٤).

مامۆستا نوری عەلی ئەمین هەرچەندە لە هەموویان نەدواوە و بە یەکەوە داینەناون و وەك گروپێکی تایبەتی جیای نەکردوونەتەوە، بەڵام ئەوانەی لێیان دواوە، هەریەکەی لە شوێنێکدا باس کردووە.

د. فاروق عومەر صدیق بۆ ئەم گرووپە پاشگری (کەر، کار، گەر، وان، ەوان، چی، ساز، باز، ەر، یار)ی دەستنیشان کردووە. لە نێو ئەم کۆمەڵەی د. فاروق دیاریی کردووە، سێ پاشگری (دار، بەند، مەند) ناویان نەهاتووە، کەچی وشەی (کار) و دوو پاشگری (دەر، یار) لە ڕیزدا دانراون. ئێمە لەو ڕایەداین کە: دەبوو (دار، بەند، مەند) لەگەڵ هەمان گرووپدا باس بکات، چونکە هەرسێکیان بەزۆری دەچنە سەرناوی سادەو دەیانکەنە ناوی داڕێژراو. سەرەڕای ئەوەش لە ڕووی واتاوە لە پاشگرەکانی تری گرووپی ناوبراو نزیکن.

١–د. فاروق کە (کار)ی بەپاشگر داناوە، هەڵەی ڤ.س. ڕاستۆر گویڤا و ق. کوردۆ و چ. بەکۆ...ی دووپات کردۆتەوە. ڤ.س. ڕاستۆر گویڤا وای داوەتە قەڵەم کە لە زمانی فارسی ناوەڕستدا (کار) پاشگرە و دەچێتە سەر ناوو وشەی ((ڤناس – ڤناسکار)) (خەتا، گوناه – خەتاکار، گوناهکار) بەنموونە هێناوەتەوە (بڕوانە: کتێبی ناوبراو، ل ٣٣). ق. کوردۆ (کار)ی بەپاشگر داناوە و لەگەڵ (ڤان، دار، بەند...) دا باسی کردووە و وشەکانی (خەباتکار، سەرکار...)ی کردۆتە بەڵگە (بڕوانە: کتێبی ناوبراو، ل ٢٩٨ – ٢٩٩). چ. بەکۆش وەك پاشگر لە (کار) دواوەو دەشڵێ: واتای ئەو وشانەی بەیاریدەی پاشگری (کار) دروست کراون، سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشن کە ئەم پاشگرە لە وشەی (کار)ەوە کەوتبێتەوە (بڕوانە: کتێبی ناوبراو، ل ٢٤٨)

گومان لەوە ناکرێ کە (کار) وشەیەکی چالاکی سەربەخۆیە و بەمانای (عمل) و (عامل)ە. ئەم وشەیە بەهیچ جۆرێك نەبووەتە پاشگر و دەوری پاشگر نابینێ. هەموو ئەو نموونانەی نووسەرانی ناوبراو هێناویانەتەوە وشەی لێکدراون، نەك داڕێژراو. لە تێکڕای ئەو نموونانەدا کە (کار)یان تێدا بە پاشگر دانراوە، (کار) هەر ئەو واتایە دەبەخشێ کە سەربەخۆ بەکاربهێنرێ. هەرچی پاشگری (گەر)و (وان/ەوان)و (ی)و (ەتی)و (ەن)و (ین)و (ەوار)و... ئەوانی دیشن بە تەنیا بەکار ناهێنرێن و هەر هۆی ئەو سەربەخۆ بەکارنەهێنانەشە بوونەتە پاشگر... جا د. فاروق بێ لێکدانەوە هەڵەی نووسەرانی ناوبراوی دووپات کردۆتەوە – واتە وەك ئەوان (کار)ی بە پاشگر ناو بردووەو دەڵێ: پاشگری (کار) دەچێتە سەر ناو، وەك: کرێکار... (بڕوانە: کورتەی نامەی دوکتۆری، ل ١٥). د. فاروق نە هەر ئەوەی یادداشت نەکردووە، کە (کار) دەچێتە سەر ڕەگی کرداریش، بەڵکو وشەی (کرێکار)یش کە بە نموونە بۆ نیشاندانی پاشگری (کار) هێناویەتیەوە زۆر لە نموونەکانی نووسەرانی پێشوو نالەبارترە، چونکە ڕوون دیارە (کرێ) مانای (الاجرە)یە و (کار)یش واتای (عامل)ە. جا سەرەڕای ئەو واتا ئاشکرایەی وشەی

١٠-ی "[113]". وەك:

---

(کار) لە نموونەی ناوبراودا هەیەتی - واتە جگە لە ڕووی ماناوە - ئەگەر لە ڕووی خۆنواندنیشەوە کەمێك وردبینەوە، ئەوە یەکجاری گومان نامێنێ کە (کار) پاشگر نییە. بە وێنە بێتو لە بریتی وشەی (کرێ) پێشگری (بێ)لە پێش (کار) دابنێین، ئەوە وشەی (بێ کار) پەیدا دەبێ. خۆگومان لەوەدا نی یە کە (بێ) پێشگرە. جا ئەگەر (کار) پاشگربێ، ئەوە دەبێ بڵێین وشەی (بێ کار) لە (پێشگر+ پاشگر)دروست بووە، کە وەك ئاشکرایە ئەو جۆرە پێکهاتنە لە زمانی کوردیدا نییە... یاخود بێتو لە وشەی (کارگە) بڕوانین، ئەوە بە پێی ئەو ڕا هەڵەیە بێ دەبێ لێرەدا پێشگر بێ. جا (کار) چی دەرچوو؟... سەرەڕای ئەوە دەیان وشەی کوردی هەن کە (کار) هاوبەشیی تێیاندا کردووە و لە هەر شوێنێکدا بە جۆرێ دەبینرێ، وەك: کاربەدەست، سەرکار، کاروبار، خوێندکار، کارزان، داواکار، کارەکەر، دارکاری، کارگێڕ... ڕاست و دروست ئەوەیە کە (کار) وشەیە و پاشگر نییە. بە پێی ئەو بۆچوونە بێ لێکدانەوەیە، دەبێ (گیر) لە وشەی وەك (دەستگیر...)، (بڕ) لە وشەی وەك (دەستبڕ...)...دا پاشگر بن، بەڵام ئەمانیش پاشگر نین و پاشگر شتێکی دییە.

من تا ئەم ماوەیەی دوایی بڕوام وابوو لە وشەی (داواکار)دا (کار) پاشگر بێ، بەڵام ئێستا گومانم لەو وشەیەش پەیدا کردووە.

٢-د. فاڕووق بەپێی شێوازی لێکۆڵینەوەکەی ڕاستە کە دوو پاشگری (ەر، یار)ی لە ناو گرووپی ناوبراودا داناوە، بەڵام ناتەواوی لەوەدایە ناوی پاشگری (ەوار)ی نەهێناوە، کە ئەمیش بەپێی هەمان شێوازی لێکۆڵینەوە دەبێ لە تەك (ەر، یار) و ئەوانی دیدا دابنرێ.

113 - ئەمە پاشگری ناوی مەعنایە و لەگەڵ پاشگری سیفەتی نیسبی جیاوازن - واتە دوو پاشگری سەربەخۆن و هەریەکەیان لەسەرچاوەیەکەوە هاتووە و ئەرك و دەوری جیاواز دەبینن. وێچوونی شێوەیان بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ لە زمانناسان بەیەك پاشگریان دابنێن. شایەنی باسە مامۆستا مەسعود محەمەد، لە وتاری ((بەکار هێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا)) گەلێك ڕووی ئەو دوو پاشگرەی ڕوون کردۆتەوە (بڕوانە: ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد))، ب١، ژ١، بەغدا، ١٩٧٣، ل ٣٩ - ١٠٢). هەروەها مامۆستا فاڕووق عومەر صدیق لەوتاری ((وشەسازی لە زمانی کوردیدا)) بە دوور و درێژی لە پەیدابوون و گەشە کردن و دەوریان دواوە و هەرچەندە نووسەر لە چەند شوێنێکی وتارەکەیدا بەهەڵە چووە، بەڵام بەگشتی هەندێ زانیاری نوێی لە بارەی ئەو دوو پاشگرەوە تۆمار کردووە (بڕوانە: ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد))،ب٣، ژ٣، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٤١٧ - ٥٢٣).

ئەوەی پتر جێگەی سەرنج بێ ئەوەیە، نەك ئەوانە پاشگری ناوی مەعناو پاشگری سیفەی نیسبی بەیەك پاشگر تێگەیشتوون، بەڵکو بەشێك لەوانەشی کە جیایان کردوونەتەوە، بە

تایبەتی زانایانی مەدرەسەی یەکێتی سۆڤیەت لەو ڕایەدان کە (ی)ی پاشگری سیفەی نیسبی ئەگەر چووە سەر ناوێك، وەك: (هەولێری، بەغدایی، لێنینگرادی...)و مەبەست لە کەسێك بوو کە خەڵکی (هەولێر، بەغدا، لێنینگراد...)بێت، ناوێکی نسبییە (بڕوانە: قەناتی کوردۆ، دەستووری زمانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٥٧، ل ٢٩٦ — ٢٩٧، چەرکەزی بەکۆ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٢، ل ٢٤٤ — ٢٤٥، کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا، دیالێکتی کوردی موکری، لێنینگراد، ١٩٦٨، ل ٣٩ — ٤٠، فارووق عومەر صدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد))، ب٣، ژ٢، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٥١٤ — ٥١٥،...). من لەو ڕایەدام کە نووسەرانی ناوبراو لەم بۆچوونەدا بە هەڵە چوون، چونکە وشەی (هەولێری، بەغدایی، لێنینگرادی...) سیفەی نیسبین. بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو ڕایە مامۆستا مەسعوود محەمەد ڕاستی بۆ چووە کە دەڵێ: ((هیچ فەرقێك نییە لەوەدا پیاوێك بەغدایی بێت وەیا شەربەی ئاو بەغدایی. کاتێك (بەغدایی)دەبێتە ناو کە بکرێ بە (اسم علم) بۆ یەکێکی دیاریکراو، لێرەشدا فەرق نییە ناوەکە بۆ (شێرێکی باخچەی جانەوەران) بێت، یاخود بۆ (کابرایەکی گەڕەکی جدید حسن پاشا) بێت. کەواتە ڕاست نییە بڵێین وشەی (بەغدایی) کە بۆ مرۆڤ بوو دەبێتە ناوی نیسبی.

لە ڕستەی (کابراییکی بەغدایی مەلەی کرد) وشەی (بەغدایی) سیفەتە هەرچەندە بۆ کەسیش بەکار هاتووە کە دانیشتووی بەغدایە، بە پێچەوانەوە، کە کەڵە شێرێك هەبوو ناوی (بەغدایی) بوو ئەوسا وشەکە لە سیفەت دەشۆرێ و دەبێتە (اسم علم) هەرچەندە کەڵەشێر کەسیش نییە)) (بۆ ئەم چەند دێڕە بڕوانە ل ٥١٥ی وتاری فارووق عومەر صدیق کە لە گۆڤاری ناوبراوی کۆڕدا بڵاوکراوەتەوە). سەرەڕای ئەو ڕاستییەی مامۆستا مەسعود نیشانی داوە و گومانی لەو باسەدا نەهێشتووە، ئێمەش وا بیر دەکەینەوە کە هۆی ئەو هەڵەیەی زانایانی ناوبراو وەرگێڕانی ئەو دوو حاڵەتەیە بۆ سەر زمانی ڕووسی. ئەگەر (ی)ی پاشگری سیفەی نیسبی چووە سەر ناوێك و مەبەست لە کەسێك بوو، ئەوە لە زمانی ڕووسیدا بەرانبەری پاشگری (یتس) دەوەستێ... بەڵام ئەگەر پاشگری (ی)ی سیفەی نیسبی چووە سەر ناوێك و مەبەست شتێك بوو، ئەودەمە لە زمانی ڕووسیدا بەرانبەری پاشگری (سك) دادەنرێ. جا بەر لە هەموو شتێك دەبێ ئەوە لە یەك جیا بکەینەوە کە لە ڕووسیدا دوو پاشگر ئەو دەورە دەبینن، نەك یەك پاشگر وەك لە کوردیدا. پاشگری (یتس)ی ڕووسی پاشگرێکە ناو دروست دەکات، نەوەك وەك (ی)ی سیفەی نیسبی کوردی کە هەر ئاوەڵناو دادەڕێژێ. پاشگری (یتس) لە ڕووی مەبەستەوە هەندێ جیاوازی لەگەڵ پاشگری (ی)ی سیفەی نیسبیدا هەیە. هەر زمانێکیش خاوەن تایبەتێتی خۆیەتی. لە هەردوو دیالێکتی سەرەکی کوردیدا لە نێو ئەو پاشگرانەی یاریدەی ڕۆنانی ناوی داڕێژراو دەدەن، (ی)ی ناوی مەعنا لە هەمووان چالاکترە و دەچێتە سەر بەشە

مندالّی، هەلاجی.

١١- ەتی. وەك:

پیاوەتی، برایەتی...

١٢- ێتی"١١٤" وەك:

دزێتی، کەرێتی...

١٣- ایەتی. وەك:

دۆستایەتی، دوژمنایەتی...

---

ئاخاوتنێك (بە زۆری ناو و ئاوەڵناو)و دەیانکاتە ناوی مەعنا. دەور و واتای پاشگری (ی) ناوی مەعنای کوردی لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا پاشگری (یە)خۆی دەنوێنێ، وەك: ((پاتخشاه - پاتخشاهیە)) (پادشا - پادشایی)، ((تاریك - تاریکیە)) (تاریك - تاریکی)... (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، زمانی فارسی ناوەڕاست، ل ٣١). د. فاررووق بە هەڵە پاشگری (یە)ی بە (ئیە) ناوبردووە. وەك ئاشکرایە، دەنگە بزوێنەکان بە تەنیا تەلەفوز ناکرێن، بۆیە بۆ یاریدەدان (ئ) لە پێشیانەوە دێت. هەر بەو چەشنە ئەگەر پێشگر و پاشگر و نیشانە بەبزوێن دەست پێ بکەن، دیسان لەکاتی تەلەفوزکردنیاندا هەمان (ئ)دێتە ناوان. جا ئەو (ئ)ە کە لەو شوێنەدا تەنیا دەوری یاریدەدانی بە دەمداهاتنی بزوێنەکانە و کەرەستەی پێکهێن نییە، نابێ لەو جۆرە حاڵەتانەدا لە نووسیندا وێنەیان بۆ دابنرێ. بێگومان د. فاررووق لەوەدا بە هەڵە چووە کە وێنەی (ئیە)ی بۆ پاشگری (یە) داناوە (بڕوانە وتاری: وشەسازی لە زمانی کوردیدا، ل ٤٣٥).
شایەنی باسە مامۆستا مەسعود محمەد لە لاپەڕە (٤٣٦ - ٤٣٧)ی هەمان وتاردا ئەو هەڵەیەی د. فارووقی ڕاست کردۆتەوە.
د. فارووق لە لاپەڕە (٤٦٤ - ٤٦٥)ی هەمان وتاردا بە شێوەیەکی ڕاست و زانستی ئەوەی نیشان داوە، کە دەنگی (ە) لە پاشگری (یە)دا تێچووە و (ی) ماوەتەوە... لێرەدا پەنجە بۆ هەڵەیەکی لاوەکیی ئەو چەند دێڕەی نووسەردا ڕادەکێشم، ئەویش ئەوەیە کە (ە) و (ی)ی بە پیت ناوبردووە. وەك چەند جار و لە چەند شوێنێکی ئەم کتێبەدا لێی دواوین، ئەوانە دەنگن، نەك پیت.

١١٤ - پاشگری (ەتی) و (ێتی)هەردووکیان هەر یەك پاشگرن، بەڵام هەرچی (ەتی)یە ڕاسترەو زۆریش بەکاردێ، کەچی (ێتی) بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانی باوە. ئەم پاشگرە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە شێوەی (تی)دا دەبینرێ، وەك: شڤانتی، بچووکتی...

١٤- ێنی. وەك:

کورێنی، کچێنی...

تێبینی: پاشگری (ی) و (ەتی/ ێتی، ایەتی، ێنی)"[115]" ناوی مەعنەوی دروست دەکەن"[116]". ئەو جۆرە ناوانەش مانای تەجرید (ئەبستراکت) دەبەخشن و واتای نەوعیەت و خاسیەت و بار و جۆری چالاکی... یان تێدایە.

١٥- گا"[117]". وەك:

کۆگا، دەزگا"[118]"...

---

[115] - مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە دیاری کردنی ئەم پاشگرانەدا (ی) و (یی)ی بە دوو پاشگر،
کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا باسی تەواوی ئەو پاشگرانەیان کردووە، بەڵام هەڵەی هەرە گەورەیان ئەوەیە کە پاشگری (ایی)یان بە (ای) ناو هێناوە و سەرەڕای ئەوەش نموونەیان بۆ نەهێناوەتەوە (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل ٣٠)
لەم بارەیەوە هەڵەی زەقی د. فارووق عومەر صدیقیش ئەوەیە کە ناوی پاشگری (ەتی)ی نەبردووە، کەچی باسی(یەتی)ی کردووە (بڕوانە: کورتەی نامەی دوکتۆری، ل ١٥). وەك ئاشکرایە، لە زمانی کوردیدا هیچ پاشگرێك نییە بە ناوی (یەتی)یەوە، بەڵام ئەگەر وشەیەك کۆتاییی بە بزوێن هاتبێ، ئەو دەمە نیمچە بزوێنی (ی – y) لە نێوان وشە و پاشگرەکەدا پەیدا دەبێ، وەك: گەورەیەتی... جا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە پاشگرەکە (یەتی)بێت، بەڵکو (ەتی)یە و باری کۆتاییی وشەکە ئەوەی هێناوەتە ئاراوە.

[116] - مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە هەمان نووسراودا دەڵێ: پاشگری وا ((ناوی مەعنەویی لە ناو پێ دروست ئەکرێ)) (ل ٧٧)... ڕاستە ئەو پاشگرانە ناوی مەعنەوی دروست دەکەن، بەڵام نووسەر بۆ ئەوە نەچووە کە هەندێکیان دەچنە سەر ئاوەڵناویش و ناوی لێ دروست دەکەن، وەك: بڵندی، سپێتی، بەرزایەتی، ڕەشایی...

[117] - د. فارووق عومەر صدیق ڕاست بۆ ئەوە چووە کە پاشگری (گا)و (گە)ی شێوەی مۆرفێم (Allomorph)ی بەرانبەر (گاس)ی فارسیی ناوەڕاست، کە بە مانای (کات، شوێن...)دێت، دەوەستێ (بڕوانە: کورتەی نامەی دوکتۆری، ل ١٧).

[118] - وشەی ((دەزگا)) لە ((دەست + گا)) پێکهاتووە. لە سەرێکەوە دەنگی (ت) قووت دراوە، واتە – بەریاسای توتاندنەوە (Assimilation) کەوتووە. لە سەرێکی دیکەوە

١٦- گە"[119]". وەك:

كارگە، ڕێگە...

١٧- ستان"[120]". وەك:

كوردستان، دارستان...

١٨- خانە. وەك:

كتێبخانە، مەيخانە...

١٩- دان"[121]". وەك:

ئاگردان، گوڵدان، خەڵووزدان"[122]"...

٢٠- ڵان/ەڵان. وەك:

---

(گ)كە كۆنسۆنانتی ئاوازەدار (Voiced)ە لەگەڵ دەنگی (ز)دا كە ئەمیش هەر كۆنسۆنانتی ئاوازدارە پتر دەگونجێ، وەك لەگەڵ (س)دا كە كۆنسۆنانتی (Breathed)ە. لەم ڕووەوە یاسای تواندنەوە كاری كردووە.

[119] - (گا) و (گە) دوو پاشگری جیا نین، بەڵكو شێوەی مۆرفیمی یەكن، ئەم پاشگرە چالاكە و بە شێوەیەكی سەرەكی دەچێتە سەر ناو و جارجارەش بە هەندێ بەشە ئاخاوتنی دیكەشەوە دەلكێ.

[120] - لە هەردوو دیالێكتی سەرەكیی كوردیدا هیچ جیاوازیەك لە شێوە و جۆری بەكارهێنان و گەیاندنی واتای پاشگری (ستان)دا نییە. لە زمانی فارسی ناوەڕاستیشدا هەمان شێوەی كوردیی ئەمڕۆی هەبوو و واتای شوێن و جێگەشی دەگەیاند (بڕوانە: ڤ. س. ڕاستەر گویڤا، سەرچاوە ناوبراو، ل ٣٤).

[121] - پاشگری (دان)ی كوردی لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا هەر لە شێوەی (دان)دا دەبینرێ، وەك: ((زێنـدان)) (زیندان)...(بڕوانە: ڕاستەر گویڤا، ل ٣٠). لە دیالێكتی ژووروی زمانی كوردیدا (دان) شێوەی (دانگ)یشی هەیە، وەك: هەڤیر دانگ، قەند دانگ... (بڕوانە: چەركەزی بەكۆ، ل ٢٤٧).

[122] - لە شێوەی سلێمانیدا ((خەڵووزان)) لەگەڵ جۆرە گرتنێكی (ز)ەكەدا تەلەفوز دەكرێ. دیارە تێچوونی دەنگی (د) لەم وشەیەدا، هەمان دیاردەیە كە لە دەیان وشەدا بەرچاو دەكەوێ. بەم جۆرە(ان) لە هەندێ وشەدا وەك شێوەی مۆرفێمی (دان) دەبینرێ.

بەردەڵان، قامیشەڵان...

٢١- ەن. وەك:

پووشەن، چیمەن...

٢٢- جاڕ"[١٢٣]". وەك:

نێرگزەجاڕ، تووتنەجاڕ...

٢٣- زار"[١٢٤]". وەك:

گوڵزار، لالەزار...

٢٤- ەوار. وەك:

شوێنەوار، لێڕەوار...

**تێبینی:** پاشگری (گا/گە، ستان، خانە، دان، ڵان/ ەڵان، ەن، جاڕ، زار، ەوار)"[١٢٥]" بەشێوەیەکی گشتی شوێن و جێگە نیشان دەدەن." "[١٢٦]".

---

[١٢٣] - هەمان واتا و مەبەستی (جاڕ)ی کوردی، لەزمانی فارسیی ناوەڕاستدا پاشگری (چاڕ)بەدی دەکرێ. ڤ. س. ڕاستەر گویڤا لەو بارەیەوە دەڵێ: لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا پاشگری (چاڕ) ناوێك دروست دەكا كە واتای شوێن و جێگە بگەیەنێ، وەك: ((وزدێس)) (بت) — ((وزدێسچار)) (بتخانە، شوێنی پەرستنی بت)... لە زمانی فارسی کۆنیشدا ((گارە)) واتای (سوپا، لەشکر)ە و ((کارێچار))یش مانای (مەیدانیشەڕ)ە (بڕوانە: کتێبی ناوبراو، ل ٣٠).

[١٢٤] - د. فارووق عومەر صدیق لەو ڕایەدایە کە پاشگری (زار) بەرانبەر (چاڕ)ی فارسیی ناوەڕاست دەوەستێ (بڕوانە: کورتەی نامەی دوکتۆری، ل — ١٨). بەڕای ئێمە، وەك پێشتر دەرمان بڕی، (چاڕ) لە (جاڕ) نێزیکترە.

[١٢٥] - بەشێك لەو پاشگرانە دەچنە سەر ئاوەڵناو یاخود ڕەگی كردار و ناوی لێ دروست دەکەن، وەك: نەرمەڵان، ڕووتەن، ڕێژەن... دواتر لێیان دەدوێین.

[١٢٦] - کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا، هەرچەندە لەژێر ناوی ((پاشگری جێگە))دا لە (گا/گە، ستان، خانە، دان) دواون (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل ٣٠ — ٣١). بەڵام باسی پاشگری (ڵان/ەڵان، ەن، جاڕ، زار، ەوار) یان نەکردووە، کە ئەمانیش هەر شوێن و جێگە نیشان دەدەن.

٢٥- لە. وەک:

براله، مێروله...

٢٦- ڵە. وەک:

گۆزەڵە، دیزەڵە...

٢٧- ووله. وەک:

دانووله، مێشووله...

٢٨- ۆله. وەک:

بەرخۆله...

٢٩- ۆڵە. وەک:

کیژۆڵە، کچۆڵە...

٣٠- ۆڵ. وەک:

مچۆڵ، مەجۆڵ...

٣١- ۆڵ. وەک:

ئاسکۆڵ...

٣٢- ەڵ. وەک:

کۆمەڵ...

---

نووسەری ئەم کتێبە پێشتر دوو پاشگری (ڵان/ەڵان، زار)ی لە نێو گرووپی ناوبراودا دانەنابوو (بڕوانە کتێبی: وشە ڕۆنان لە زمانی کوردیدا، ل ٥٣ - ٥٤)، بەڵام دوای خوێندنەوەی کورتەی نامەی دوکتۆری د. فارووق عومەر صدیق، هاتە سەر ئەو ڕایەی، ئەو دوو پاشگرەش دەبێ لەگەڵ کۆمەڵی ئەو پاشگرانەدا دابنرێن کە واتای شوێن و جێگە دەگەیەنن.
د. فارووق عومەر صدیق لە نێو ئەو کۆمەڵە پاشگرەدا تەنیا ناوی (گا/گە، ستان، ڵان/ەڵان، دان، زار)ی بردووە و (خانە، ەن، جاڕ، ەوار)ی لەتەک دانەناون (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل ١٧ - ١٨).

٣٣- یلە. وەك:

ئەنگوستیلە، کاریلە...

٣٤- ۆکە. وەك:

بزنۆکە، دەسڕۆکە...

٣٥- ۆك. وەك:

گوندۆك، تیرۆك...

٣٦- چە. وەك:

باخچە، دەریاچە...

٣٧- وو. وەك:

پووشوو، ڕۆژوو...

٣٨- ۆ. وەك:

شێرۆ، هەورۆ...

٣٩- وولکە. وەك:

جاموولکە، داسوولکە...

٤٠- ۆڵکە. وەك:

تەپۆڵکە...

٤١- یلکە. وەك:

چاویلکە، جامیلکە...

٤٢- چکە. وەك:

گوێچکە، ڕێچکە...

٤٣- ۆچکە. وەك:

مندالۆچکە، داپیرۆچکە..."[127]

**تێبینی:** پاشگری (لە، ڵە، وولە، ۆلە، ۆڵـە، ۆل، ۆڵ، ەل، یلـە، ۆکـە، ۆك، چە، وو، ۆ، وولکە، ۆڵکە، یلکە، چکە، ۆچکە)"[128]" بەزۆری بۆ بچووکردنەوە یا گەیاندنی مانای نازداری بەکاردەهێنرێن،

بـەڵام هەنـدێکیان جگـە لـە واتـای بچـووك کردنـەوە، مەبەسـتی تـریش دەگەیەنن."[129]"

---

[127] - هەنـدێ پاشـگری دی ئـەم گروپـە، وەك (کـە، ك – ik، وەك...) دەچـنە سـەر بەشـە ئاخاوتنی دیش. دواتر باسیان دەکەین.

[128] - کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا لەو هەموو پاشگرانەدا تەنیا ناوی (لە، یلـە، وولـە، ۆڵە، چکە)یان هێناوە (بڕوانە: کتێبی ناوبراو ل ٣٣). جگە لەوە لە شوێنی تردا نـاوی پاشگری (چـە، وو، ۆك) یـان هێنـاوە، بـەڵام نـەیان ووتـووە کـە واتـای بچـووك کردنـەوەش دەگەیـەنن. مامۆسـتا نـووری عـەلی ئـەمین بـە شـێوەیەکی فـراوان باسـی ئـەو پاشـگرانەی کـردووە، بـەڵام پاشگری (لە، ۆلکە)ی لەیادکردووە.

د. فـارووق عومـەر صـدیق بـە شـێوەیەکی گشـتی لـە باسـی پاشـگرەکانی ئـەم گرووپـەدا لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانە و لەبار و گونجاوی کردووە. ئەوەی شایەنی باس بێ، ئەوەیە کە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك تێکڕای ئەو پاشگرانەی دەوری بچووك کردنـەوە دەبیـنن، بەسـەر پێـنج دەستەدا دابەش کردووە:

١- پاشگری (کە) و شێوە مۆرفێمەکانی : (ۆکە، ك – ik، ۆك، ەك، یك، ەکە، ووکە).

٢- پاشگری (لە/ڵە) و شێوە مۆرفێمەکانی: (ۆلە/ۆڵە، وولە/ووڵە، یلە، ۆل/ۆڵ).

٣- پاشگری (چە) و شێوەی مۆرفێمی (یچە).

٤- پاشگری (چکە) و شێوە مۆرفێمەکانی (ۆچك، چك)، کـە لـە لێکـدانی دوو پاشـگری (چـە) و(کە) پێکهاتوون.

٥- پاشگری (ۆڵکە، ۆلکە، یلکە، وولکە)، کە لە لێکدانی دوو پاشگری (لە) و(کە) پەیدابوون.

سەرەڕای سەرکەوتوویی ئەو باسە، بەداخەوە دوو ناتەواویی زەق دێنە پێش چاو:

١- باس نەکردنی هەندێ پاشگر.

٢- ناونەهێنان و جێ نەکردنەوەی دوو پاشگری (ۆ) و (وو) لە دابەش کردنەکەدا.

٤٤- ێن. وەك:

هەڵماتێن، تۆپێن...

٤٥- ێنە. وەك:

نیسکێنە، ماشێنە...

٤٦- ینە. وەك:

دۆینە، مەسینە...

٤٧- وانە. وەك:

پاوانە، ملوانە

٤٨- ك – ik. وەك:

دەسك، پەتك...

٤٩- کە. وەك:

لەتکە، لووتکە...

٥٠- گار. وەك:

ڕۆژگار، یادگار...

٥١- وەر/ەوەر"[١٣٠]". وەك:

سەروەر، جانەوەر...

٥٢- ە. "[١٣١]" وەك:

[١٢٩] - لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە نێو ئەو پاشگرانەدا کەدەوری بچووك کردنەوە دەبینن، بە تایبەتی پاشگری(ك – ik، یك، ەك، ۆك) دیارن (بڕوانە: چەرکەزی بەکۆ، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٤٣ – ٢٤٤).

[١٣٠] - پاشگری (وەر/ەوەر)ی کوردی لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا لە شێوەی (ڤەر/وڤەر)دا دەبینرێ، وەك ((جان – جانڤەر)) (گیان – گیانەوەر). (بڕوانە: ڤ.س.ڕاستەر گویڤا، ل ٣٥).

ئاگرە، شەوە...

٥٣- ین. وەك:

سەرین"[١٣٢]"، شەرمین...

٥٤- وور. وەك:

دەستوور...

٥٥- انە."[١٣٣]" وەك:

---

[١٣١] - لە زمانی کوردیدا (ە) پاشگرێکی چالاکە و دەچێتە سەر (ناو، ئاوەڵناو، کردار...)ی سادەو دەیانکاتە ناو، وەك: ((شەو - شەوە))، ((ڕاست - ڕاستە))، ((کۆکین - کۆکە))... بەرانبەر ئەم پاشگرە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا پاشگری (ەك) هەیە، کە ئەو دەورانەی خوارەوە دەبینێ:

بچووك کردنەوە، وەك:

((چەشم)) (چاو) - ((چەشمەك)) (چاوگ، سەرچاوە، کانی، کارێز).

دەچێتە سەر هەندێ ناو و واتای نوێ دێنێتە کایەوە، وەك:

((تۆخم)) (خێزان) - ((تۆخمەك)) (هۆز، ڕەسەن).

هەندێ جاریش واتای ئەو ناوە ناگۆڕێ کە پێوەی دەلکێ، وەك: ((چار)) (چار) - ((چارەك)) (چارە).

د - دەچێتە سەر ڕەگی هەندێ کردار و ناوی لێ دروست دەکات، وەك: ((ڤنەر - ڕەگی - ڤنەرتەن)) (هاتن) - ((ڤنەرەك)) (ڕێگا). (بڕوانە: ڤ.س. ڕاستەر گویڤا، ل ٢٩ - ٣٠).

[١٣٢] - مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە وشەی ((سەرین))دا ((سەر))ی بە ئاوەڵکردار داناوە (بڕوانە: ((گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی))، ل ٢٧). هەرچەندە وشەی ((سەر)) وەك ئاوەڵکردار بەکاردێت، بەڵام لە وشەی ((سەرین))دا ناوە.

[١٣٣] - لە وشەکانی ((جەژنانە، پووشانە، پاکانە، سوورانە))دا پاشگری (انە) چووەتە سەر ناو و ئاوەڵناوی سادە و کردوونیەتە ناوی داڕێژراو. لە وشەکانی ((ژنانە، پیاوانە، ژیرانە))دا هەرچەندە دیسان پاشگری (انە) چووەتە سەر ناو و ئاوەڵناوی سادە، بەڵام کردوونیەتە ئاوەڵناو یاخود ئاوەڵکرداری داڕێژراو. سەرەڕای ئەوە واتا و دەوری ئەو پاشگرە لە کۆمەڵی یەکەمی وشەکاندا لەگەڵ کۆمەڵی دووەمدا زۆر جیاوازە. ئەمەش سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە دوو پاشگری سەربەخۆ بن. هەرچەندە ئەمەی ئێمە تا ڕادەیەك بۆچوونێکی سەرپێیییە، بەڵام

جەژنانە، پووشانە...

٥٦- ەوا. وەك:

نانەوا، دۆخەوا...

٥٧- ەمەنی. "[١٣٤]" وەك:

شیرەمەنی، چاپەمەنی...

٥٨- اك. "[١٣٥]" وەك:

پیتاك...

٥٩- ندە. "[١٣٦]" وەك:

باڵندە، گازندە...

٦٠- ەك. "[١٣٧]" وەك:

کەوشەك..."[١٣٨]"

... هتد. "[١٣٩]"

---

ئەو پاشگری (انەك)ەی لە زمانیی فارسیی ناوەڕاستدا دەچێتە سەر ناو و دەیکاتە ئاوەڵناو، وەك: ((مەرتانەك)) (پیاوانە) — (بڕوانە: ڤ.س. ڕاستەر گویڤا، ل ٣٠)، هەندێ ڕای ئێمە پتەو دەکات.

[١٣٤] - پاشگری (ەمەنی) هەروەها دەچێتە سەر ئاوەڵناو و ڕەگی کرداریش و هەر دەشیانکاتە ناو. لە جێی خۆیدا نموونە دێنینەوە.

[١٣٥] - پاشگری (اك) دەچێتە سەر ڕەگی کرداریش. دواتر لێی دەدوێین.

[١٣٦] - پاشگری (ندە) هەروەها دەچێتە سەر ئاوەڵناو و ڕەگی کرداریش و هەر دەشیانکاتە ناو. دواتر نموونە دێنینەوە. بەرانبەر ئەم پاشگرە کوردییە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا پاشگری (ندەك/ەندەك) بەرچاو دەکەوێ (بڕوانە: ڤ.س. ڕاستەر گویڤا، ل ٣٣).

[١٣٧] - پاشگری (ەك)یش بە ئاوەڵناو و کرداریشەوە دەلکێ.

[١٣٨] - بۆ لێکدانەوەی بەشێك لەو پاشگرانە و هێنانەوەی نموونە، سوودێکی زۆرم لە نووسراوەکانی نووری عەلی ئەمین و کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤاو د. فارووق عومەر صدیق و چەرکەزی بەکۆ و قەناتی کوردۆ وەرگرتووە.

ب- ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و دەیکەنە ناوی دارێژراو:

١- ی"[١٤٠]". وەك:

کوێری، جوانی

٢- ەتی. وەك:

گەورەیەتی، سپیەتی...

٣- ێتی. وەك:

بەرزێتی، سپێتی...

٤- ایەتی. وەك:

بڵندایەتی، کەمایەتی

٥- ایی. وەك:

پانایی، تاریکایی..."[١٤١]

٦- ە. وەك:

خراپە، ڕاستە...

---

[١٣٩] - دەربارەی دەور و مەبەستی بەشێك لەو پاشگرانەی سەرەوە هیچمان نەنووسیوە، یاخود ئەوانەش کە لێیان دواوین شتێکی زۆر کەمە ئەویش لە بەر ئەوەیە کە ئێمە مەبەستمان شێوەی دارشتنی ناوە... دەنا ئەوە دەزانین کە هەر یەکێك لەو پاشگرانەی ئێمە بە دوو دێرێك لێیان دواوین، لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەل و تایبەتی هەڵدەگرن...

[١٤٠] - ئەمە پاشگری ناوی مەعنایە. چۆن دەچێتە سەر ناو و ناوی مەعنەوی لێ دروست دەکا، هەر بەو جۆرەش دەچێتە سەر ئاوەڵناو و ناوی مەعنەوی پێك دێنێ.

[١٤١] - لە نێو پاشگرەکانی ناوی مەعنادا (ی، ەتی، ێتی، ایەتی) دەچنە سەر ناو و ئاوەڵناویش، بەلام (ێنی) تەنیا بە ناوەوە دەلکێ و (ایی)یش بە پێچەوانەی هەر دەچێتە سەر ئاوەڵناو.

٧- لأن/ەلأن. وەك:

نەرمەلأن، سەوزەلأن...

٨- ێنە. وەك:

زەردێنە، سپێنە...

٩- کە. وەك:

پیسکە، ڕەشکە...

١٠- ك – ik. وەك:

ئەستوورك، گەرمك...

١١- ان. "[١٤٢]" وەك:

ڕەقان، نەرمان:

١٢- انە. وەك:

پاکانە، سورانە...

١٣- ەن. وەك:

ڕووتەن، تیژەن...

١٤- ەك. وەك:

بەرزەك...

---

[١٤٢] - لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا پاشگرێك بە ناوی (ان)ەوە هەیە، کە ئەو حاڵەتانەی خوارەوەی لێ پەیدا دەبێ: ناوی باوك یاخود باو باپیران نیشان دەدا، وەك: ((ئەرتەخشێری پاپەکان))(ئەردەشێری نەوەی پاپەك). ناوی هەندێ شوێن دەگەیەنێ، وەك: ((سپاه))(سوپا) – ((سپاهان))(ئەسفەهان).

ج- ناو ناوە ئاوەڵناو دروست دەکا، وەك: ((یاڤیدان)) (نەمر) (بڕوانە: ڤ. س. ڕاستەر گویڤا، ل ٣٠).

١٥- ین. "[143]"وەك:

نەرمین"[144]"...

١٦- ندە. وەك:

دڕندە...

١٧- دمەنی. وەك:

ساردەمەنی، مزرەمەنی

... هتد.

ج- ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر کرداری سادە و دەیکەنە ناوی داڕێژراو:

هەندێ پاشگر بەڕەگی کرداری ڕابوردوو و ئێستا و ناوی چاوگ (اسم المصدر)ەوە دەلکێن و ناوی داڕێژراوی لێ دروست دەکەن، وەك:

١- ار. "[145]" وەك:

((وتار)) لە ((وتن))ەوە.

((کوشتار)) لە ((کوشتن))ەوە.

---

[143] - پاشگری (ین) دەچێتە سەر ناوو ئاوەڵناوو ئاوەڵکردار، وەك: ((سەرین))، ((نەرمین))، ((پێشین))...

[144] - مامۆستا نووری عەلی ئەمین وشەی ((نەرمین))ی بە ئاوەڵناو داوەتە قەڵەم: (بڕوانە((گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی))، ل ٢٧). من وای بۆ دەچم کە ((نەرمین)) ناوەو ناوێکی تایبەتی (اسم العلم)ە.

[145] - واتا و شێوە و دەوری پاشگری (ار)ی کوردی زۆر لە پاشگری (تار)ی فارسیی ناوەڕاستەوە نێزیکە. لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا پاشگری (تار) بە زۆری ناوی کارا (اسم الفاعل) و ناوی کرداری (verbalnoun (substantive دروست دەکا (بڕوانە: ڤ. س. ڕاستەرگویڤا، ل ٣٤).

٢- یار"[١٤٦]". وەك:

((پرسیار)) لە ((پرسین))ەوە

((کڕیار)) لە ((کڕین))ەوە.

٣- ەر. وەك:

((نووسەر)) لە ((نووسین))ەوە.

((دانەر)) لە ((دانان))ەوە.

٤- مان. وەك:

((دروومان)) لە ((دروون))ەوە.

((نیشتمان)) لە ((نیشتن))ەوە.

٥- ۆك/ۆکە. وەك:

((فڕۆك/فڕۆکە))" [١٤٧]" لە ((فڕین))ەوە.

٦- ە. وەك:

((بارە)) لە ((باڕان))ەوە.

((کۆکە)) لە ((کۆکین))ەوە.

---

[١٤٦]- د. فارووق عومەر صدیق وای نیشان داوە کە پاشگری (یار)ی کوردی بەرانبەر (دارە)ی فارسیی کۆن و (دهارە)ی هیندی کۆن و(یار، دار)ی فارسیی ناوەڕاست دەوەستێ (بڕوانە: کورتەی نامەی دوکتۆری، ل ١٦).

[١٤٧]- لە هەموو شێوەکانی کوردیدا، وشەی ((فڕۆك)) بەکاردەهێنرێ - واتە پاشگرەکە(ۆك)ە، کەچی لە سلێمانی ((فڕۆکە)) دەبیسترێ - واتە پاشگرەکە بووەتە(ۆکە). لەم بارەیەوە سەرنج بۆ دوو خاڵ ڕادەکێشم: لە ئاخاوتنی ئێستای سلێمانیدا (ۆکە) لەگەڵ کرداردا تەنیا لە وشەی ((فڕۆکە))دا دەبینرێ. ئەو وشەیە لە سەرەتای پەیدا بوونیدا لە شێوەی ((فڕۆك))دا بەرچاو دەکەوێ. بەوێنە زێوەر و بێکەس سەرو هەڵبەستیان بە ناوی ((فڕۆك)ەوە هەیە (بڕوانە: دیوانی زێوەر، ل ٤٢، دیوانی بێکەس، ل ١٥٠).

٧- گە. وەك:

((لەوڕگە)) لە ((لەوەڕان))ەوە.

((بڕگە)) لە ((بڕین))ەوە.

٨- ەن. وەك:

((ڕێژەن)) لە ((ڕژان))ەوە.

((سووتەن)) لە ((سووتان))ەوە.

٩- ەك. وەك:

((کوتەك)) لە ((کوتان))ەوە.

١٠- اك"[١٤٨]". وەك:

((خۆراك)) لە ((خواردن))ەوە.

١١- وە/ەوە. "[١٤٩]" وەك:

((کردەوە)) لە ((کردن))ەوە.

١٢- کە. وەك:

((فڕکە)) لە ((فڕین))ەوە.

---

[١٤٨]- لە زمانی فارسیی ناوەڕاستیشدا لە شێوەی (اك)دا پاشگرێك هەیە، کە لە ڕووی واتا گەیاندن و دەوریشەوە زۆر لە پاشگری (اك)ی کوردی نێزیکە (بڕوانە: ڤ.س. ڕاستە گویڤا، ل ٣٥).

[١٤٩]- د. فارووق عومەر صدیق بە هەڵە وا تێگەیشتووە پاشگری (وە/ەوە) ناو سازدەکا. بۆ ئەمەش نەك هەر لەگەڵ ئەو پاشگرانەی یاریدەی ڕۆنانی ناو دەدەن دایناوە، بەڵکو وشەی ((گەڕانەوە))شی بە نموونە بۆ هێناوەتەوە (بڕوانە: کورتەی نامەی دوکتۆری، ل ١٩)... وەك ئاشکرایە پاشگری ناوبراو دەچێتە سەر (کردار/چاوگ)ی سادە و دەیکاتە (کردار/چاوگ)ی داڕێژراو، وەك: ((کردنەوە، ڕۆیشتنەوە، لێکدانەوە...)) تەنیا لە چەند حاڵەتێکی ئێجگار کەمدا نەبێ کە دەچێتە سەر ڕەگی کردار و دەیکاتە ناوی داڕێژراو، وەك: ((کردەوە...)).

١٣- ەوار"[150]". وەك:

((خوێندەوار)) لە ((خوێندن))ەوە.

١٤- ندە. وەك:

((کوشندە)) لە ((کوشتن))ەوە.

١٥- ەمەنی. وەك:

((سووتەمەنی)) لە ((سووتان))ەوە.

١٦- ان. "[151]" وەك:

((باران)) لە ((بارین))ەوە.

١٧- دە/یدە"[152]". وەك:

---

[150] - مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە وشەی ((خوێندەوار، کوردەوار، شوێنەوار))دا، (ەوار)ی بە یەك پاشگر داناوە (بڕوانە: کتێبی ((گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی)))، ل ٢٤). لێکدانەوە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە وشەی ((شوێنەوار، کوردەوار))دا واتای شوێن و جێگە هەیە، بەڵام ئەو پاشگرە لە وشەی ((خوێندەوار))دا بە جۆرێکی دیکە خۆی دەنوێنێ... ئەمەش سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە دوو پاشگری جیا بن، وەك(ی)ی ناوی مەعنا و (ی)ی سیفەتی نیسبی. بێگومان ئەمە تەنیا بیرکردنەوەیەکە، ئەگینا پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زانستی و مێژووی هەیە... لێرەدا ئەوەش دەخەینە پێش چاو کە لە فارسیی ناوەڕاستدا پاشگرێك بەناوی (ڤار)ەوە هەیە (بڕوانە:ڤ.س. ڕاستەر گویڤا، ل ٣٥)، کە لە واتا و دەوردا لە (ەوار)ی کوردییەوە نزیکە.

[151] - ئەم پاشگری (ان)ەی دەچێتە سەر ڕەگی کردار تەنیا بە شێوە وەك ئەو پاشگری (ان)ەیە کە دەچێتە سەر ئاوەڵناو (بڕوانە: لاپەڕە ١٢٧)ی ئەم کتێبە). ئەگینا لە گەیاندنی واتا و دەوربینیندا جیاوازیەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دوو پاشگری سەربەخۆ بن. ئەوەی پتر ئەم ڕایەمان بسەلمێنێ، ئەوەیە کە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستیشدا دووپاشگری (ان) هەیە. یەکێکیان ئەوەیە کە لە پەراوێزی ژ٥٣ی ئەم کتێبەماندا لێی دواوین. ئەوەی دیشیان ئەوەیە کە دەچێتە سەر ڕەگی کردار، وەك: ((ڤاران)) (باران)لە ((ڤاریتەن)) (بارین)ەوە (بڕوانە: ڤ.س. ڕاستەر گویڤا، ل ٣٠).

((دیدە)) لە ((دیتن))ەوە.

((گەڕیدە)) لە ((گەڕان))ەوە"[153].

... هتد ".

د – ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵکرداری سادەو دەیانکەنە ناوی داڕێژراو:

١– ین. وەك:

پێشین...

٢– ار.وەك:

بنار...

٣– ەوا. وەك:

پێشەوا...

٤– ۆك. وەك:

بەرۆك...

---

١٥٢ - ڕەنگە پاشگرەکە (یدە)بێ، چونکە لە زۆربەی نموونەکاندا (ی) دەبینرێ. دیار نەبوونی لە وشەی ((دیدە))دا هۆی ئەوەیە کە ڕەگی کردارەکە بە بزوێنی (ی) کۆتایی هاتووە.

١٥٣ - کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا لەم بارەیەوە تەنیا باسی پاشگری (ار، یار، ەر، مان)یان کردووە (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو ل ٣٨ – ٣٩). مامۆستا نووری عەلی ئەمینیش لە بەشێکیان کۆڵیوەتەوە (بڕوانە: کتێبی ((گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی))). لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ لە زۆربەیان دواوە (بڕوانە: ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد))،ب٤، ل ٣٨٠ – ٤٠٠). د. فارووق عومەر صدیق لە بەشێکی ئێجگار کەمیان کۆڵیوەتەوە (بڕوانە: کورتەی نامەی دوکتۆری، ل ١٤ – ١٨).

(٦٥) ئەو ناوانەی لە کردارەوە دروست دەبن لە زانستی زماندا بە (ناوی کرداری – verbal noun (substantive) ناسراون.

... هتد.

جگە لەوەی هەندێ پێشگریش هەن، کە بە ڕەگی کردار یا ناوەوە دەلکێن و ناوی داڕێژراو دروست دەکەن:

١- پێ. وەك:

((پێ ویست)) لە ((ویستن))ەوە.

((پێ خەف)) لە ((خەفتن))ەوە.

٢- ڕا. وەك:

((ڕایەخ)) لە ((خستن))ەوە.

٣- بەر. وەك:

((بەرچنە)) لە ((چنین))ەوە.

((بەرکوت)) لە ((کوتان))ەوە.

٤- هاو. وەك:

هاوولات، هاوڕێ، هاودەرد...

...هتد.

## ناوی لێکدراو

لە زمانی کوردیدا ناوی لێکدراو لەمانەی خوارەوە پێك دێ

١- دوو ناوی سادە. وەك:

شاهەنگ، ماستاو، مارماسی، گولاو، چڵکاو، بەفراو، گاسن"[١٥٤]"، گەلامێو...

٢- دوو ناوی سادە، بە یارمەتی یەکێك لەم (ئینتەرفیکس)انە:

أ- (ە).وەك:

بەردەنوێژ، مانگەشەو، گوڵەگەنم، چەرمەگا...

ب- (و). وەك:

هێلکەوڕۆن، لەرزوتا، دەنگوباس...

ج- (بە). وەك:

کولێرەبەڕۆن، کاربەدەست...

١- ناوێکی سادە و ئاوەڵناوێك، بە یارمەتی (ئینتەرفیکس)ی (ە). وەك:

مێرگەسوور، کێلەسپی، کەرەکوڵ...

٤- ئاوەڵناو + ناو. وەك:

---

١٥٤ - هەندێ جار لە وشەی لێکدراودا کورت کردنەوە بەدی دەکرێت. وەك: ((کانێسکان)) کە لە ((کانی + ئاسکان)) دروست بووە، ((چابوونەوە)) کەلە ((چاك + بوونەوە)) سازبووە، ((گاسن)) لە ((گا + سن))، ((کانبی)) لە ((کاك + نەبی))، ((دەستاڕ)) لە ((دەست + هاڕ (ڕەگی کرداری هاڕین)))، ((مامۆستا)) لە ((مام + وەستا)) [ (و) لە وشەی سادەی ((وەستا))دا کۆنسۆنانتە و دەتوانێ لەگەڵ دەنگی (ە)دا بێت، کە بەدوایدا هاتووە. کاتێ لەگەڵ وشەی ((مام))دا یەك دەگرن، ئەوە ئەو (و)وە دەبێ بە (ۆ) - کە دەنگێکی بزوێنە. جا بوونە بزوێنی ئەو دەنگە بووە بە هۆی ئەوەی (ە) تێدا بچێ، ئەوەش لەبەرئەوە کە دوو بزوێن پێکەوە نایەن.

ڕەشماڵ، زەرداو، ڕەشمار، خۆشناو...

٥- ئاوەڵناوێک و ناوێکی سادە، بە یارمەتی یەکێک لەم (ئینتەرفیکس)انە:

أ- (ە). وەک:

ڕەشەبا، سەوزەگیا، تەڕەپیاز، گەندەموو، شۆڕەبی...

ب- (و). وەک:

گەندو گوو...

٦- لە ناوێکی سادە و ڕەگی کردار. وەک:

دارتاش، دڵخواز، جلدروو، پیلانگێڕ، ڕۆژهەڵات، چاوبەست، لێفەدروو، کڵاودروو...

٧- لە ناوێکی سادە و ڕەگی کردار، بە یارمەتیی ئینتەرفیکسی (و). وەک:

دەست وبرد...

٨- لە دوو ڕەگی کردار بەیارمەتیی ئینتەرفیکسی (و). وەک:

هات وچۆ، گفتوگۆ، مشت وماڵ"[155]"...

٩- ئاوەڵکردارێک و ناوێکی سادە. وەک:

بەرماڵ، ژێرپیاڵە، پێش نوێژ، ژێرکراس، بن باخەڵ، هەمیشەبەهار...

---

[155] - ((مشت)) ڕەگی کرداری ((مشتن))ە کە هاوواتای ((ماڵین))ە. وە ((ماڵ))یش ڕەگی کرداری ((ماڵین))ە، کە بە واتای (پاک کردنەوەی) شوێنێک بە گەسک یان بە شتێکی تر دێت. کاتێ ڕەگی ئەو دوو کردارە یەک دەگرن، وشەیەکی نوێ دروست دەبێ - ((مشت وماڵ)). هەرچی وشەی ((مشت وماڵ))یشە واتای ((زاخاودانەوە و پاک کردنەوەی خەنجەر و شیر و چەقۆ)) دەبەخشێ

١٠- ئاوەڵکردارێك و ناوێکی سادە، بە یارمەتیی ئینتەرفیکسی (ە).

وەك:

پاشەلەقە، پاشەڕۆژ...

١١- ناوێکی سادەو وشەیەکی بێواتا"[156]"، بە یارمەتیی ئینتەرفیکسی (و). وەك:

قەرزوقۆڵ، گیاو گژ، گوڵ ومولّ...

١٢- رەگی کردارو وشەیەکی بێ واتا، بەیارمەتیی ئینتەرفیکسی (و).

وەك:

کوڵ وکۆ"[157]".

١٣- دووپات کردنەوەی ناوێك، بەیارمەتیی ئینتەرفیکسی"[158]" (ە). وەك:

قرچەقرچ، ملّچەملّچ، چەقەچەق، جیڕەجیڕ، لوورەلوور، گڤەگڤ، بۆڕەبۆڕ، "[159]" ڤیژەڤیژ... "[160]"

---

[156] - ئەگەر لەو دوو وشەی ناوی لێکدراو پێك دێنن بێ واتابێ، ئەوە ئەم جۆرە پێکهاتنە لەگەڵ پێناسەی ناوی لێکدراودا، کە وتراوە ئەو ناوە سادەیەیە کە وا بەلای کەمەوە دوو وشەی واتاداری تێدابێ، ناگونجێ... بەلاّم لەبەر ئەوەی بەزۆری وشە بێ واتاکە لە واتادارەکەوە داتاشراوەیاخود وشە ناسادە کە بەشێوە لێکدراوە، بۆیە ئەو جۆرە حاڵەتانەمان لەگەڵ ناوی لێکدراودا باس نەکردووە.

[157] - ((کوڵ)) رەگی کرداری ((کوڵان))ە کە بەمانای (قوڵپدانی شتی شل لەسەر ئاگر)دێت. ((کۆ)) واتای سەربەخۆی نییە. هەرچی (کوڵ وکۆ)یە مانای (کڵپەی گڕی ئاگر) دەبەخشێ.

[158] - بە تایبەتی ناوی دەنگە سروشتییەکان.

[159] - ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە بزوێنی(ە)بێت، ئەوە لەو دوو (ە)یە — واتە کۆتایی و پێوەندیی یەکێکیان تێدەچێ و یەکێکیان دەمێنێتەوە.

[160] - یەکێ لە هەڵە زۆر زەقەکانی د. فاروق عومەر صدیق لە باسی ناوی لێکدراودا، ئەوەیە کە بۆ حاڵەتی پێکهاتنی ناوی لێکدراو لە ئەنجامی یەکگرتنی دوو ناوەوە، چەند نموونەیەکی

**... هتد.** ‎[١٦١]

---

هێناوەتەوە کە زۆربەیان نەگونجاو و هەڵەن. بەوێنە لە وشەی ((سەرتاشخانە))دا پاشگری ((خانە))ی بە ناو داناوە، لە وشەی ((چیرۆك نووس))دا ڕەگی کرداری ((نووسین))ی بە ناو لەقەڵەم داوە، لە وشەی ((شەرم کردن))دا چاوگی ((کردن))ی وەك ناو تەماشاکردووە... (بڕوانە: کورتەی نامەی دوکتۆری، ل ٩ — ١٠).

١٦١ - زۆربەی زۆری ئەو حاڵەتانەی ناوی لێکدراو پێك دێنن و لەسەرەوە نیشانمادان، بەهەمان چەشن لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەبینرێن. بەوێنە: ناو + ناو، وەك (ژن باڤ، بسمام...)، ئاوەڵناو + ئاوەڵناو، بە یارمەتی ئینتەرفیکسی (ە)، وەك: (کەسکەسۆر...)، ناو + ڕەگی کردار، وەك (ماسی گر...)، ئاوەڵناو + ناو، بەیارمەتی ئینتەرفیکسی (ە)، وەك: کەلەمێر، پیرەژن...)... هتد (بڕوانە: قەناتی کوردۆ، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٩٣ — ٢٩٥ ، چەرکەزی بەکۆ، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٣٩ — ٢٥٠).

هەروەها لە زمانی فارسیی ناوەڕاستیشدا گەلێك لەوحاڵەتانە دەبینرێن. بەوێنە: ناو + ناو، وەك: ((کار)) (کار، ئیش) + ((نامەك)) (کتێب) = ((کارنامەك)) (کارنامە)، ئاوەڵناو + ناو، وەك: ((ڤیە)) (باش + چاك) + ((دێن)) (ئاین) = ((ڤێهدێن)) (دینی باش)، ناو + ڕەگی کردار، وەك ((سەر)) (سەر) + ((دار — ڕەگی کرداری داشتەن (بوون، هەبوون) = ((سەردار)) سەردار). (بڕوانە: ڤ.س. ڕاستەرگویڤا، ل ٣٦ — ٤٣).

# ژمـــارەی نـــاو

جگە لەو كتێب و نامیلكە و وتارانەی لە باسی بەشە ئاخاوتنی (ناو)دا لە (ژمارەی ناو) دواون و ئێمە لە فەصڵی یەكەمی ئەم كتێبەدا لێیان كۆڵینەوە، هەروەها دوو كاری سەربەخۆش هەن، كە تەنیا دەربارەی كێشەی ژمارەی ناون:

مامۆستا ڕەشید عومەر دزەیی لە وتاری ((چەند سەرنجێكی زمانەوانی))" "[١٦٢] دەربارەی كۆ هەندێ زانیاری باش و بەكەڵكی خستۆتە پێش چاو. بەر لە هەموو شتێك نووسەر هەستی بەوە كردووە كە لە هەندێ حاڵەتدا نیمچە بزوێن لە نێوان وشەو نیشانەدا پەیدا دەبێ و ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی كە وەك هەندێ نووسەر (ان) و(یان) بە دوو نیشانە دادەنێ. هەروەها لە كۆتاییی وتارەكەیدا باسی ژمارەیەك لەو ناوانەی كردووە كە واتای كۆ دەدەن... بەڵام بەداخەوە وتاری ناوبراو هەندێ هەڵە و كەم وكورتیی بەرچاوی تێدایە، وەك:

١- بـــۆ چـــۆنیەتیی خۆنوانـــدنی نیشـــانەی (ان)ی كـــۆ دوای دەنگـــە كۆنســـۆنانتەكان ســـێ نموونـــەی هێناوەتـــەوە، كەچـــی یـــەكێكیان وشـــەی ((كانی))یـە كـە دوا دەنگی بزوێنـە – واتـە نووسـەر لێرەدا بزوێنـی (ی) بـە كۆنسۆنانت تێ گەیشتووە.

٢- لە زۆر شوێندا دەردەكەوێ كە نەیتوانیوە جیاوازی لە نێوان (ی – y)ی كۆنسۆنانت و (ی – î)ی بزوێندا بكات.

---

[١٦٢] - ڕەشید عومەر دزەیی، چەند سەرنجێكی زمانەوانی، ڕۆژنامەی ((هاوكاری))، ژ١٥٩، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٤.

٣- لە سەرپاکی وتارەکەدا (پیت)ی لەبریتیی (دەنگ) بەکارهێناوە.

٤- کاتێ هاتۆتە سەر نیشانەی کۆ لە کرمانجیی ژووروودا بێ لێکدانەوەو بێ بەدواکەوتن، ئەوەی مامۆستا جگەرخوێن دەربارەی ئەو کێشەیە وتویە دووپاتی کردۆتەوە. جا هەمان هەڵە و ناڕاستیی جگەر خوێنی گێڕاوەتەوە.

٥- باسی (ات) و (ەها)...ی نەکردووە.

ساڵی ١٩٧٤ ئی. ئا. سمیر نۆڤا بە ناوی ((شێوەی ژمارەی ناو لە زمانە ئێرانییەکاندا)) کتێبێکی بڵاو کردەوە"[١٦٣]" و لە لاپەڕە (١٥٨ – ١٩٠)دا دەربارەی ژمارەی ناو لە بەشە دیالێکتی موکریدا دواوە. نووسەر لەم باسەدا لە گەلێك ڕووەوە سەرکەوتووە و ئەنجامی باشی وەدەست هێناوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کەم و کورتی دەبینرێ:

ئی. ئا. سمیر نۆڤا لە لاپەڕە (١٥٨)دا وای داناوە کە نیشانەی (ان)ی کۆ لە بەشە دیالێکتی موکریدا تەنیا لە دۆخی تیاندا بەرچاو دەکەوێ"[١٦٤]". نووسەر لەوەدا بەهەڵە چووە کە دەڵێ: نیشانەی (ان)ی کۆ دەچێتە سەر ئەو ناوانەی کە نیشانەی (ە)ی ناسیاویان پێوەیە"[١٦٥]". لەوەشدا ڕاست نییە کە (ەکان)ی بە پاشگر داوەتە قەڵەم"[١٦٦]"... هتد.

دوای کەمێ نیشاندانی ئەو دوو بەرهەمەی لە سەرەوە لێیان دواوین و ئەو کارانەی لە فەصڵی یەکەمدا باسمان کردن، ئەوەمان بۆ دەرکەوت، کە زۆربەی ئەوەی دەربارەی ژمارەی ناو لە زمانی کوردیدا نووسراوون هەڵە و

---

[١٦٣] - ئی.ئا.سمیر نۆڤا، شێوەی ژمارەی ناولە زمانە ئێرانیەکاندا، لێنینگراد، ١٩٧٤

[١٦٤] - وەڵام و ڕەت کردنەوەو لێکدانەوەی ئەو ڕایە لە پەراوێزی ژمارە(١٠٣)دایە.

[١٦٥] - بڕوانە: پەراوێزی ژمارە (١٠٠).

[١٦٦] - بڕوانە: پەراوێزی ژمارە (١٠٢).

ناتەواوی وکەم و کوورییان تێدایە و بەلای زۆر لایەنی باسەکەدا نەچوون و تیشکی ڕووناکییان ئاڕاستەی گەلێك ڕووی نەکردووە و ئەنجامێکی سەرکەوتوویان وەدەست نەهێناوە.

***

لە ڕووی ژمارەوە لە زمانی کوردیدا دوو جۆر ناو هەیە:

١- ناوی تاك، ٢- ناوی کۆ.

## ناوی تاك

ناوی تاك ئەو ناوەیە کە تەنیا کەسێك یان شتێك نیشان دەدات.

لە زمانی کوردیدا فۆرمی ناوی گشتی، ئەگەر نیشانەیەك یاخود وشەیەکی بۆ دووپات کردنەوە لەگەڵ نەبێ، ئەوە چۆن بۆ تاك، هەر بەو جۆرەش بۆ هەموو ڕەگەزی هاوچەشنەکەی بەکاردێت. وەك:

**تاك**

**مەلا لە مزگەوت هاتەوە**

**نەسرین کچی مام هۆمەرە**

**کۆ**

**مەلا لە مزگەوت کۆڕیان بەستبوو**

**نەسرین و نازدار کچی مام هۆمەرن**

فۆرمی ناوی تاك ئەگەر هیچ دووپات کردنەوەیەکی لەگەڵ نەبێ، ئەوە دەتوانێ بەو واتایانەی خوارەوە بێت.

١- مانای پۆلێك یاخود شێوە یاخود ڕەگەزی هاوچەشنی شتێك یان کەسێك دەگەیەنێ. وەك:

**سوار تا نەگلێ نابێ بەسوار**

**(پەندی پێشینان، ل ٢٧٠)**

**گوڵەباخ بۆنی خۆشە**

٢- نیشاندانی ناوی پۆلێك یاخود کۆمەڵێکی هاوڕەگەز. وەك:

**ئەگەر مەڕم نەدیبێ لە هەرێزا ، پشقلم دیوە لە پەرێزا.**

**(پەندی پێشینان، ل ٣٦)**

**مێرووله دەعبای بچووك و وردە**

**سەیری کە کە چەند بەدەست و بردە**

**(بێکەس، ل ٤٨)**

٣- جیاکردنەوەی بەشێك لە پۆلێك. وەك:

**گۆزەی نوێ ئاوی ساردە**

**(پەندی پێشینان، ل ٤٢)**

**سێوی کوێستان مزرە.**

٤- لە بەکارهێنانی فۆڕمی ناوی تاکدا، هەندێ حاڵەتی وا هەیە، کە تیایاندا تەواو ئاشکرا نابێ، مەبەست تاکە یاخود کۆ. وەك:

**بۆ هاتوچوون و جێ بەجێ کردنی ئەو کارەم ئۆتۆمۆبیل پێویستە.**

**ئەو ئیشە بە کرێکار دەکرێ**

٥- نیشاندانی تاك. وەك:

**ئەمڕۆ لە ماڵ زوو هاتمە دەرێ.**

**بەختیار ژنی هێنا.**

ئەگەر بە دوای فۆڕمی ناوی تاکەوە (ەکە) و (ە)ی نیشانەی ناسیاوی، (ێك)و (یَ)ی نیشانەی نەناسیاوی بلکێن، یاخود جێناوی نیشاندانی (ئەم) و (ئەو)، ژمارەی (یەك)لە پێشیەوە بێن، ئەو کاتە ناوەکە تەئکید لەسەر تاك دەکاو واتای تاك دەگەیەنیَ:

١- فۆرمی ناوی تاك لەگەڵ (ەکە) و (ە)ی ناسیاویدا تاکێکی ناسراو نیشان دەدەن. وەك:

**ئێستەش کەناری حەوشەکە جێی باز و کەوشەکە،**

**یاریی تیایە، یا بووەتە مەعرەضی نوفوور؟**

**(نالی، ل ١٩٢)**

**دڵەی هەژار بۆت بۆتە بریانی**

**حەشرە، هەرایە لە سلێمانی**

**(بێکەس، ل ١١١)**

٢- نیشانەی (ێك)و (یَ) تاکایەتی و نەناسیاوی دەردەخەن. وەك:

**هەزار دۆست کەمە، دوژمنێك زۆرە**

**(پەندی پێشینان، ل ٤٩١)**

**جووتێك کۆتری نێرومیَ**

**ئەگەڕان لەگویَ چەمیَ**

**(بێکەس، ١٤٣)**

٣- ئەگەر ناو بەدوا جێناوی نیشاندانی (ئەم، ئەو)دا بێت و نیشانەی کۆ وەرنەگریَ، ئەوە مانای تاك بە تەئکیدەوە دێنێتە گۆڕیَ، وەك:

**ئەم دێ یە جێ دێڵم ! بێ نیشان، بێ شوێن پێ**

**ئەی پەری! سڵ مەکە، لامەدە بۆ لاڕێ**

**(گۆران، ب، ل ٣٣)**

**ئەو شێخە بە کوم مەگرە کە پەشمینە مەریدە**

**ئەو ڕیشە بەسەر دارەوە ڕیسێکی بوزانە**

**(نالی، ل ٤٧٩)**

٤- ژمارەی (یەك) کە لە پێش ناوێکەوە دێت، ئەوە مانای تاك دێنێتە گۆڕێ. وەك:

**ئێستا ئەوا هەرچی بڵێی نیعمەت و نازە**

**هەمووی ئەدا بە یەك دڵۆپ فرمێسکی تازە، (٧٩)**

**(گۆران، ب، ل ٧٠)**

## ناوی کۆ

لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا حاڵەتی کۆ هەیە، بەڵام شێوەی کۆ لە زمانانی جیاوازدا وەك یەك نین. بەوێنە لە زمانی (ملایی)دا"[١٦٧]" دووپات

[١٦٧] - ئی. ئا. سمیر نۆڤا لە لاپەڕە (١٠ – ١٦)ی کتێبی ناوبراودا، هەرچەندە باسی واتاکانی ناوی کردووە، بەڵام هەندێ حاڵەتی گرنگ و ئاشکرای یادداشت نەکردووە. سەرەڕای ئەوە سێ هەڵە بەدی دەکرێ: نووسەر نیشانەی (ێك)و ژمارەی (یەك)ی بە یەك شت داناوە... ڕاستە نیشانەی (ێك) لە ژمارەی (یەك)ەوە وەرگیراوە، بەڵام وەك دوو مۆرفێمی سەربەخۆ خۆیان دەنوێنن و لە کارکردنیاندا جیاوازی لە نێوانیاندا بەدەردەکەوێ.

ئی. ئا. سمیر نۆڤا، ئەو (ە)یەی دەچێتە سەر ناو لە حاڵەتی بەکارهێنانی جێناوی نیشاندانداا لە پێشیەوە، بە نیشانەی ناسیاوی داناوە. بێگومان لەو جۆرە نموونانەدا (ە) بە یاریدەی جێ ناوەکەپەیدا بووەو لێرەدا نیشانەی ناسیاوی نییە. بەڵکو دەمێك (ە) دەتوانێ ببێتە نیشانەی

کردنــەوە، نیشــانەی کۆیــە، وەك: ((orang)) — (مــرۆڤ)، (( orang - orang)) — (مرۆڤــان). لــەزمانی (شــیلووکی)ئەفریقادا گــۆڕینی ئــاواز (Intonation) کۆ دەردەخات، وەك: ((jit — ژیت)) ئەگـەر بـەئاوازی بـەرز دەربـبڕِڕێ، ئـەوە بـە واتـای (گـوێ) دێـت — (گـوێ یـان) دێـت — واتـە لـەم حاڵەتـەدا کۆیـە. لـە زمـانی ئەڵەمانیـدا گـۆڕینی دەنگی بزوێنـی ڕەگـی وشـە حاڵەتی کۆ دێنێتە ئـەنجام، وەك: ((Mutter)) (دایـك)، ((Mûtter)) — (دایکان)، یاخود گۆڕینی نیشانەش هـەر دەوری کۆکردنـەوە دەبینێـت، وەك: ((die Fenster)) — (پەنجـەرە)، ((das Fenster)) — (پەنجـەران). لـە زمانی ڕووسیدا گۆڕینی کۆتایی وشە حاڵەتی کۆ پێك دێنێ، وەك: ((کنیگـا)) — (کتێب)، ((کنیگی)) — (کتێبان).

لە زمانی (نانسس)دا"[168]" کـۆ بـە چـوار چەشـنی جیـاواز خـۆی دەنـوێنێ: زۆربەی ناو و کردار حاڵـەتی کۆیـان بـە دووپاتکردنـەوە پەیـدا دەبـێ — واتـە

---

ناسیاوی، کە بێ یاریـدەی جێنـاوی لکـاو بەدەردەکـەوێ. نووسـەر وای بـۆ چـووە کـە ئەگـەر جێناوی نیشاندانی (ئەم، ئەو) لە پێش ناوەوە بێن، ئەوە واتـای تـاك پێـك دێ... بـەڵام بێـت و وردبینەوە سەدان نموونەی وا دێتە پێش چاومان کە ئـەو جێناوانـە نەبوونەتـە هـۆی گەیانـدنی واتای تاك، وەك:

ڕەبی خولا! ئەو برایانەت لێ نەستێنێ، هەتتا خولا دەکا دیوانێ. (**تحفەء مظفریة، ب١، ل ٢٩٤**)

ئەو قسانە پێکەوە دەکەین... (**تحفەء مظفریة، ب١، ل ٣٠٢**) ... هتد.

لەو نموونانەوە دەردەکەوێ کـە دەوری ئـەم جێناوانـە تـەنیا تەئکیدکردنـە، هەرچی گەیانـدنی واتای تاکایەتییە، بە ناوەکەوە بەندە. ئەگەر ناوەکە نیشانەی کۆ وەرنەگرێ، ئەو دەمـە واتـای تاك دەگەیەنێ.

[168] - زمانی ڕەسمی دەوڵەتی ئەندەنووسیایە. زمانی دانیشتوانی ئەو حەڤدە هەزار کەسـەیە، کە لە دورگەی نێو پرۆڤیدنیس لە ئۆقیانووسی ئەتڵەس دەژین.

بەشێك لە ڕەگ دووبارە دەکرێتەوە، وەك: ((gyat)) (مرۆڤ)، ((gyigat)) — (مرۆڤان)، چەشنی دووەم بە یاریدەی هەندێ پێشگر ساز دەبێ، وەك: ((anon)) (دەست)، ((Ka - anon)) (دەستان)، ((Wai)) — (سەوڵ)، ((lu-wai)) — (سەولان). کۆ هەروەها بەهۆی گۆڕینی دەنگی بزوێنی ڕەگەوە پێك دێ، وەك: ((gwula)) — (پالتۆ)، ((gwila)) — (پالتۆیان). لە کۆتاییدا بەشی چوارەمی کۆ بەهاریکاریی پاشگر دێتە ئەنجام وەك: ((waky)) — (برا)، ((wakykw)) — (برایان)... هتد"[169]. لە زمانی فارسیی ناوەڕاست (پەهلەوی)دا بۆ پێکهێنانی حاڵەتی کۆ دوو نیشانەیان (ان) و (یها) بەکاردەهێنا. نیشانەی (ان) لە کۆتاییی زووی حاڵەتی جەڕی کۆی (انان)ەوە هاتووە. لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا ئەو کۆتاییە واتای ڕەسەنی خۆی ون کردووە و بووە بە نیشانەی کۆ. ئەم نیشانەیە — واتە (ان)، ئێجگار زۆرتر لە (یها) بەکار دەهێنرا و بە کۆتاییی هەموو ناوێکەوە دەلکا، وەك: ((پتاران)) — (باوکان)، ((داناکان)) — (دانایان)، ((گۆسپەندان)) — (مەڕان)، ((ئاتەخشان)) — (ئاگران)، ((ئاپان)) — (ئاوان)، ((مێنشنان)) — (فکران)... نیشانەی (یها)ش دەگەڕێتەوە بۆ دەوری کۆتاییی پەهلەوی. لە سەرەتادا تەنیا بۆ ناوی بێ گیان بەکار دەهات. ئەم نیشانەیە زۆر کەمتر لە گەڕدا بوو، وەك: لە نیشانەی (ان)" [170].

---

[169] - ئا.ئا.ریفۆرماتسکی، سەرەتاییکی زمانناسی، چاپی چوارەم، مۆسکۆ، ١٩٦٧، ل ٢٦٢ (لە باس کردنی ئەو چەند زمانە بێگانەیەدا مەبەستمان ئەوەیە، بڵێین، هەر زمانە خاوەنی تایبەتێتی خۆیەتی).

[170] - ڤ. س. ڕاستۆر گویڤا، زمانی فارسیی ناوەڕاست، مۆسکۆ، ١٩٦٦، ل ٥٠ — ٥١.

لە زمانی فارسیی نوێدا دوو نیشانەی (ها) و (ان) کۆ سازدەکەن. هەرچەندە جیاوازی لە نێوان واتا گەیاندنی ئەو دوو نیشانەیەدا نییە، بەلاّم لە چالاکیدا وێك ناچن. نیشانەی (ها) دەتوانێ بە هەموو ناوێکەوە بلکێ (بێ ئەوەی حالەتی بیژۆکی تێدابێ). هەرچی نیشانەی (ان)ە تەنیا توانای لکاندنی بە کۆمەڵێکی کەمتر لە وشەوە هەیە"[171]. لێرەدا سەرنج ڕاکێش ئەوەیە کە لە مەسەلەی نیشانەی کۆدا، زمانی فارسیی نوێ لە زمانی فارسیی ناوەڕاست دوور دەکەوێتەوەو جوێ دەبێتەوە، کەچی زمانی کوردی لە زمانی فارسیی ناوەڕاست نێزیك دەبێتەوە. "[172]"

لە زمانی ڕووشانیدا (ێن)" [173]" نیشانەی کۆیە.

لە زمانی ئەفغانیدا (ونا)و (ان) نیشانەی کۆی جنسی نێرن. (ی)و (انی)ش نیشانەی کۆی جنسی مێن"[174]".

---

[171] - ئەگەر ئەمە بەڵگەبێ بۆ پتەوکردنی ڕای ئەو زانایانەی، زمانی فارسیی ناوەڕاست بە بناغەی زمانی فارسیی نوێ دانانێن، یاخود پێشکەوتن و گەشەکردن و گۆڕانی مێژوویی زمانی فارسیی بێت، یاخود کارتێکردنی زمانی کوردی یان زمانە ئێرانییەکانی تر بێ بۆ سەر زمانی فارسی، یاخود هەر هۆیەکی دیکە بێ، بێگومان پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زانستی و مێژوویی هەیە.

[172] - لە ئاخاوتن و ئەدەبیاتی زۆربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی ژووروودا (ێن) وەك نیشانەی ئیزافەی کۆ بەدەردەکەوێ، بەوێنە:

ئافەرین سەد ئافەرین هێ من ژ وانڕا ئافەرین

**تێ ژ تیرێن دلبەران دائم د دل پەیکان و گاز**

**(جزیری، ل ٢٢١)**

**خۆرتێن کورد، هۆزانێن وەلاتێ تە**

**ئەڤن ڕابوونە ژ شاخ و لاتێ تە**

**(جگەرخوێن، ل ١٣٨)**

[173] - سەرچاوەی ناوبراو، ئی. ئا. سمیر نۆڤا، ل ٩٣.

لە زمانی بلووجیدا نیشانە و حاڵەتی کۆ بەگوێرەی دەوروبەر خۆنواندنی ناو لە ڕستەدا دەگۆڕێت"[١٧٥]".

***

هەرچەندەلە زمانی کوردیدا هەندێ نیشانە هەن، کۆ پێك دێنن و هەروەها هەندێ حاڵەت هەن مانای کۆ دەگەیەنن، بەڵام نیشانەی ڕەسەن و سەرەکیی کۆی ناوە"[١٧٦]" (ان)ە.

ئەم نیشانەیە (یان) نییە، وەك هەندێ لە نووسەران دایان ناوە"[١٧٧]"، بەڵکو (ان)ە، چونکە لەباری ئاساییدا — واتە کاتێك بەدوای دەنگێکی کۆنسۆنانتدا دێ — بە باشی دەردەکەوێ، بەڵام وەك زۆر دیاردەی تری زمانی کوردی، لە هەندێ حاڵەتدا بە شێوەیەکی دیکە دەبینرێ و ئەمە بووەتە هۆی نەناسینەوەی. جا بەم بۆنەیەوە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین، کە:

١- ئەگەر ناوێك کۆتایی بە کۆنسۆنانت بێت، ئەوە(ان)ی بە ڕەوانی پێوە دەلکێنرێ، بێ ئەوەی هیچ زیادی و کەمییەك بێتە گۆڕێ، وەك:

ژن + ان = ژنان

---

١٧٤ - هەمان سەرچاوە، ل ١٩٦.

١٧٥ - هەمان سەرچاوە، ل ١١٠.

١٧٦ - هەروەها مەسەلەی کۆ پەیوەندی بەهەندێ بەشی دیکەی ئاخاوتنەوە، وەك (ئاوەڵناو، جێ ناو، ژمارە، کردار...) هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا لە حاڵەتی کۆی ناو دەدوێین.

١٧٧ - گەلێك لە زانایان و ڕووناکبیرانی کورد و بێگانە وایان داوەتە قەڵەم، کە گوایا ئەو ناوانەی بە بزوێنی (أ، ۆ، ێ، ی) کۆتاییان دێت بەهۆی پاشگر/ ئامراز (ڕاستتر نیشانە — ئەورەحمان)ی (یان)ەوە کۆ دەکرێنەوە (بڕوانە: فەصلی یەکەمی ئەم کتێبە)... شایەنی باسە مامۆستا ڕەشید عومەر دزەیی هەستی بەو ڕاستییە کردووە کە نیشانەکە (ان)ەو لە وتاری (چەند سەرنجێکی زمانەوانی، ڕۆژنامەی ((هاوکاری))، ژ١٥، بەغدا، ١٩٧١، ل ٤)دا لەم کێشەیە دواوە.

**ژنان دەچوون بۆ شایی**

**شار + ان = شاران**

**ناله هاته زمان وتی یاران**

**لازمه ڕووبکەینه ڕێی شاران**

**(زێوەر، ل ٧٥)**

**مشك + ان = مشكان**

**ئەگەر پشیله له ماڵ نەبێ، مشكان تلیلیلیانه**

**(پەندی پێشینان، ل ٣١)**

**کێو + ان = کێوان**

**له خەوفی طەلعەتی ڕۆژ هەروەکوو شێت**

**به ڕوو زەردی هەڵات و کەوته کێوان**

**(نالی، ل ٣٢١)**

٢- ئەگەر ناوێك کۆتایی به بزوێنی (أ، ۆ، ێ، ی) بێت، ئەوه له نێوان ناو و نیشانەکەدا (ی — y)ی نیمچه بزوێن پەیدادەبێ، وەك:

(أ) برا + ان = برایان

**برایانی تۆ چاویان له ماڵی خەڵك نییه**

**(ۆ) پەڕۆ + ان = پەڕۆیان**

**ئەو پەڕۆیانه دڕاون**

**(ێ) پێ + ان = پێیان**

**ئەو ڕۆژه به پێیان ڕۆیشتم**

**(له خەوما، ل ٢٩)**

(ی)" صۆفی + ان = صۆفی یان "[178]

**<u>صۆفیان</u> هاتنە مەجلیس وەرەقی دیدە بشۆن**

**لەکن ئەو دێمی یە وشکانە لە دەریا نی یە باس**

**(نالی، ل ٢٣٤)**

٣-ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (وو)بێت، ئەوە لە نێوان ناوەکە و نیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (و — W)دێتە کایەوە، هەروەها بزوێنی (وو)ی کۆتایی وشەکە کەمێك لەباری ئاسایی کورتتر دەوترێت، وەك:

بەڕوو + ان = بەڕووان

**پیاو بە <u>بەڕووان</u> تێر نابێت**

**مووروو + ان = مووروووان"[179]"**

**عومری گەیشتە شەستە <u>مووروووان</u> ئەکاتە دەستە**

**(پەندی پێشینان، ل ٣٠٥)**

بازوو + ان = بازووان

**بە ئارەقی ناوچەوان**

**بە قووەتی <u>بازووان</u>**

**(زێوەر، ل ٨٢)**

٤- ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (ە)بێت، ئەوکاتە (ە)ی کۆتاییی ناوەکە تێ دەچێ، وەك:

---

[178] - لە حاڵەتی کۆکردنەوەی وشەی کۆتایی هاتوو بە (ی)دا، هەروەها شێوەی کورت کردنەوەش دەبینرێ، بەوێنە، وەك کە دەوترێ ((صۆفیان...)).

[179] - لەم حاڵەتەشدا هەروەها شێوەی کورت کردنەوە هەیە، وەك کە دەوترێ: ((بەڕووان، مووروان...)).

بەرە + ان = بەران

**ئەو بەرانە داخە**

وەك لەسەرەوە وتمان، جگە لە (ان)، هەندێ نیشانەی دیکە هەن، کە کۆ سازدەکەن، وەك:

_ ات _

هەرچەندە (ات) لە زمانی عەرەبیدا نیشانەی کۆیە، بەلاّم لە کوردیشدا هێندە بەکاردەهێنرێ، کە ناکرێ لە باسی کۆدا پشتگوێ بخرێ.

نیشانەی (ات) لە زمانی کوردیدا بە ڕەوانی بە هەندێ وشەوە دەلکێ، وەك:

**باخ + ات = باخات**

**خاکی عیراقم سەربەسەر پڕ مەعدەن و دوڕ و گوهەر**

**جێی عیلم و جێی فەزلّ و هونەر، باخاتی پڕ میوە و سەمەر**

**(زێوەر، ل ٩٨)**

**خەیالّ + ات = خەیالاّت**

**خەیالاّتی شەو و ڕۆژم ژیانی میللەتی کوردە**

**تەمەننام لای خودا دائیم ژیانی میللەتی کوردە**

**(بێکەس، ل ٢٤)**

هەندێ جاریش لە نێوان ناو و نیشانەکەدا دەنگی (و، ج، ه) پەیدادەبێ، بە تایبەتی ئەگەر ناوەکە کۆتاییی بە دەنگی بزوێن هاتبێ، وەك:

ئاغا + و + ات = ئاغاوات

دەمێکە ئاغاوات هێزیان نەماوە

**میوە + ج + ات = میوەجات"[180]"**

**میوەجات لە کوردستان زۆرە**

**دێ + هـ + ات = دێهات**

**دوهاتی ئەوروپا وەك ئەهلی دێهات**

**لە چارەی دەردی عیشقا جوملە دامان"[181]"**

**(مەحوی، ل ٢٤٢)**

ئەوەش بەدی دەکرێ کە ناو ناو بۆ سەر ئەو ناوانەی بە یاریدەی نیشانەی (ات)ی کۆ کۆدەکرێنەوە، نیشانەی (ان)ی کۆشیان ئیزافە دەکرێ – واتە ناوێك لەبریتیی یەك نیشانەی کۆ، دوان وەردەگرێ. هەروەها پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەین کە لەو حاڵەتەدا بە زۆری نیشانەی ناسیاویی (ەکە) لە نێوان دوو نیشانەکەی کۆدا پەیدا دەبێ، وەك:

**دێ + هـ + ات + ەکە+ ان = دێهاتەکان**

**((لە نیهایەتی حاسلاتدا قیمەتی ئەو وەختەی دەغلّ و دان چەند بوو، دووقاتم لە ئەهالی دێهاتەکانی خۆم ئەسەند...))**

**(مەسەلەی ویژدان، ل ٢٢)**

---

[180] - لە وشەی ((میوە))دا چۆن دەنگی (ج) هەروەها دەنگی (هـ)ش دەتوانێ بێتە ناوەوە و بوترێ ((میوەهات)).

[181] - زۆربەی زۆری زمانەوانی کورد ناوی نیشانەی (ات)یان نەهێناوە. مامۆستا سەعید صدقی ئەوەندەی وتووە کە ناو لە زمانی کوردیدا ((بعچا بە (ات) جمع دەکرێتەوە)) (بڕوانە: مختصر صرف و نحوی کوردی، ل ٧). شایەنی باسە مامۆستا عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی لە ((قامووسی زمانی کوردی))دا (بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٤) زانیاریی بە کەڵکی دەربارەی ئەو نیشانەیە تۆمار کردووە و هەندێ ڕووی ڕاستی ساغ کردۆتەوە.

## _ ەهـــا_

مۆرفێمی (ەهـا)ش یەکێکـە لـەو نیشـانانەی لـە زمـانی کوردیـدا کـۆ پێـك دێنێ، بەلاَم تەنیا دەتوانێ بچێتە سەر ژمارەیەکی کەم لە ناو، وەك:

**دەرد + ەها = دەردەها**

**ئەو نەهاتن: دەردە، داغی ئەو نەهاتن: دەردەها**

**کەس بە دەردی من نەچێ، وەك من نەبێ تووشی نەهات**

**(مەحوی، ل ٥٩)**

وەك لە سەرەوە لێی دواین، ئەم نیشانەیە لە زمـانی فارسـیی ناوەڕاستدا هەبووە و ئێستاش لە زمانی فارسیی نوێـدا نیشـانەی سـەرەکی کۆیـە. کـەم بەکارهێنان و سستی نیشانەی (ەها) لە زمـانی کوردیـدا، ئـەوە دیاردەخـەن، کە سەرچاوەی نیشانەی (ەها)ی کۆی کوردی زمانی فارسیی ناوەڕاسـت یـان زمانی فارسی نوێیە.

## _ گەل _"١٨٢"

هەروەها ئەگەر بە ناوی هەندێ گیانلەبەرەوە مۆرفێمی (گـەل) بلکێنـرێ، ئەو دەمە کۆ پەیدا دەبێ، وەك:

**کوڕ + گەل = کوڕگەل**

---

١٨٢ - وا ڕێ دەکەوێ ئەو نیشانەیە لە شێوەی (ەگەل)دا بەدەردەکەوێ، وەك دواتر لە وشـەی ((کارەگەل)دا دەبینرێ. لێرەدا پێویستە ئەوە بلێین کە ئەو بزوێنـی (ە)یـەی لـە نێـوان وشـە و نیشانەکەدا پەیدا دەبێ، ڕەسەن نییە، بـەڵکو پەیوەندییـە و بـۆ ئاسـانکردنی کۆکردنەوەکـە — واتە بۆ یاریدەی لکاندنی نیشانەکە بە وشەکەوە — هێنراوە. بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەوەی کـە نیشانەکە (گەل)ە، نەك (ەگەل)، ئەوەیە کە هەموو ئەو وشانەی (گەل)یان پێـوە لکـاوە (جگـە لە چەند نموونەیەکی زۆر کەم) بێ یاریدەی (ە) پێکهاتوون.

**زۆری نەماوە کوڕگەلی کورد بێنە ناو کایەوە**

**ئەو سایە شخصی شخصی خۆی بە خۆی سەنگەسار نابێ "[١٨٣]"**

**(پیرەمێرد، ل ٢٨٥)**

**گا + گەل = گاگەل**

**گاگەل بە گردەوە ڕۆی، پیرێژن گوڵکە سووری ئەپێچایەوە.**

**(پەندی پێشینان، ل ٣٦١)**

**سەگ + گەل = سەگ گەل"[١٨٤]"**

**گورگ کەپیر بوو ئەبێ بە مەخسەرەی سەگ گەل**

**کار + ە + گەل = کارەگەل**

**چیغێکی کۆنی پڕ لە چڵك و تۆز**

**کە بۆ کارە گەل کرابێت بە کۆز**

**(پیرە مێرد، ل ٢٧٣)**

**کارەگەلی وان بڵباسان**

**بەرم دایتە ناو ڕێواسان**

---

[١٨٣] - هەرچەندە ئەو شیعرەی پیرەمێرد لەو سەرچاوەیەدا کەلێمان وەرگرتووە، بەو جۆرەی سەرەوە تۆمار کراوە، بەلاّم لەو ڕایەدام کە شێوەی ڕاستی بەوچەشنەی خوارەوە بێت:

زۆری نەماوە کوڕگەلی کورد بێنە کایەوە

ئەوسایە شخصی شخصی بۆ خۆی سەنگەسار ئەبێ

[١٨٤] - لەبەر ئەوەی لە وشەی ((سەگ گەل))دا دوو دەنگی (گ) — واتە دوو دەنگی کۆنسۆنانتی وێکچوو — کەوتوونەتە پاڵ یەك، لە دەربڕیندا کورت کردنەوە ڕوودەدات، واتە (گ)یەك قووت دەدرێ و ((سەگەل))دەوترێ.

**وەرنە سەیری سەر بە تاسان**

**(فۆلکلۆر، ل ٧٠)**

تاکو ئێرە ئەوەمان ڕوونکردەوە کە لە زمانی کوردیدا — (ان) نیشانەیەکی سەرەکی و ڕەسەنی کۆیە. نیشانەی (ات) و (ەها) و (گەل)یش لە پلەی دووەمدا کۆ ساز دەکەن"[١٨٥].

ئێستاش دێینە سەر ئەو حاڵەتانەی لە ڕێگای ترەوە مانای کۆ دەگەیەنن و دەردەبڕن:

١– زۆر جار نەبە ناوەوە، نەبە کردارەوە نیشانەی کۆ نییە — واتە چ ناوەکە و چ کردارەکە بە تاك هاتوون — کەچی مەبەست مانای کۆ دەگەیەنی، وەك:

**ئەرێ کارگ لە کوردستان شین دەبێ؟**

٢– گەلێك جار کۆی ناو بە یاریدەی کردار یاخود ئاوەڵناو بەدەردەکەوێ — واتە ناوەکە لە حاڵەتی تاکدایە و کردارەکە یان ئاوەڵناوەکە کۆ — ئەمەش دەبێتە هۆی نیشاندانی ناوەکە بە واتای کۆ، وەك:

**سێوی گەیشتوو لە دار کەوتنە خوارەوە**

**سێوە گەیشتووەکان لە دارەکە کەوتنە خوارەوە**

٣– هەروەها ئەگەر لە پێش ناوەوە (ژمارە)، یاخود وشەی وەك (**هەندێك، هەندێ، کۆمەڵ، چەپك، دەسك، دەستە، پۆل، تاقم، ڕەوە، چەند،**

---

[١٨٥] - هەرچەندە وشەی ((بەرخەل))کە لە ڕواڵەتدا وشەی ((بەرخ))و نیشانەی (ەل) پێکهاتووە — واتە (ەل) کۆی ساز کردووە، بەڵام وا پێ دەچێ هەر (گەل)ەکە بێ و کورت کرابێتەوە، ئەویش چونکە نموونەی دیکە لەو جۆرە بەرچاو ناکەوێ و هەروەها هەندێ جاریش ((بەرخ گەل)) بەکار دەهێنرێ.... هتد.

بڕ، هۆز، خێڵ، تیرە، چین، گەل، لەشکر، سوپا...) کە لە بنەڕەتدا واتای کۆیان تێدایە، بێن، ئەوە هەرچەندە ناوەکە بە تاک دێت، بەڵام بە ناوەرۆک واتای کۆ دەگەیەنێ. بە وێنە:

**سەد ساڵ بکەیت بێگانە پەرستی، دوایی هەردێنیت نشوستی.**

**(پەندی پێشینان، ل ٢٧٤)**

**لە خواری دێوە هەندێ کەپری شاش،**

**شایی و هەڵپەڕکێی تیا دەرئەکەوت باش!**

**(گۆران، ب،ل ١٧١)**

**بردیانینە بن کۆمەڵێك دارتوو**

**لێفەو بەڕەیان بۆ داخستین زوو**

**(گۆران، ب، ل ١٦٧)**

**چەپکێ لە گوڵەکەی باغەکەی سەرا**

**کە بە خوێناوی لاوان ئاودرا**

**(پیرەمێرد، ل ١٠٢)**

... هتد.

لە زمانی کوردیدا، ئەوەش بەدی دەکرێ کە کۆ لە حاڵەتی ناسیاویدا خۆی دەنوێنێ. وەك:

**١- ئەگەر ناوێك (ەکە)ی "[186]" نیشانەی ناسیاوی پێوە بێ، دەتوانرێ (ان)ی نیشانەی کۆی بخرێتەسەر"[187]". ئەو کاتە کۆ لە حاڵەتی تەئکیددا پەیدا دەبێ"[188]" وەك:**

**کوڕ + ەکە + ان = کوڕەکان**

**وا چاکە هەتاکو هەم**

**<u>کوڕەکانم</u> تەمێ بکەم**

**(بێکەس، ل ١٤١)**

**لووتکە + ەکە + ان = لووتکەکان**

**کە لەناو کەپران جڵەویان گرتین،**

---

[186] - ئی. ئا. سمیر نۆڤا لە لاپەڕە (١٦٤)ی کتێبی ناوبراودا، وای داناوە کە نیشانەی (ان)ی کۆ دەچێتە سەر ئەو ناوانەش کە نیشانەی (ە)ی ناسیاوییان پێوەیە. بێگومان نووسەر لەوەدا بە هەڵە چووە و (ان) ناتوانێ بە وشەیەکەوە بلکێ کە (ە)ی نیشانەی ناسیاوی پێوەبێ. هۆی ئەم هەڵەیەش ئەوەیە، کە پەیدابوونی (ە) بە کۆتاییی ناوەوە لە حاڵەتی هاتنی جێناوی نیشاندان لە پێشیەوە، بە نیشانەی ناسیاوی تێگەیشتووە.

[187] - بەلاّم ئەگەر ناوێك (ەکە)ی نیشانەی ناسیاویی پێوەبێ، ناکرێ نیشانەی (ات) و (ەها)ی کۆی بخرێتە سەر. ڕەنگە ئەمەش بتوانێ ببێتە بەڵگە بۆ سەلماندنی ناڕەسەنیی ئەو دوو نیشانەیە.

[188] - بەشێك لە ڕووناکبیران و زانایان وایان داناوە کە (ەکان) نیشانەی کۆیە و پێی دەڵێن پاشگری (ەکان). بەداخەوە بۆ ئەوە نەچوون کە لە (ەکە)ی ناسیاوی و (ان)ی کۆ پێك هاتووە و بە هەردوو نیشانەکە کۆ لە حاڵەتی تەئکیددا دەردەخەن. بە وێنە، بڕوانە، ئەحمەد حەسەن ئەحمەد، ڕێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٩١، صەباح غالب، کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی لەبەر تیشکی لێکۆڵینەوەدا (دەستنووس)،وە هەندێکی تر هەرچەندە ئی. ئا. سمیر نۆڤا لە لاپەڕە (١٦٤)ی سەرچاوەی ناوبراودا پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە، کە (ەکان) لە (ەکە + ان) دروست بووە، بەلاّم هەڵەی لەوەدایە کە ناوی ناوە پاشگری (ەکان). بێگومان لە زمانی کوردیدا پاشگرێك (ڕاستتر نیشانەیەك — ئەوڕەحمان) نییە بە ناوی (ەکان)ەوە.

**زەردەی لووتکەکان پاش و پێش ئەفڕین!**

**(گۆران، ب، ۱۷۱)**

۲- ئەگەر لەپێش ناوێکەوە کە بە (ەکە) کرابێتە ناسراو، (ژمارە) یان وشەی (چەند...) بێت، ئەوە هەرچەندە ناوەکە شێوەی تاکی دەبێ، بەڵام لەگەڵ تەئکیددا واتای کۆ پێک دێ. وەک:

**چوار نامەکەم ڕەوانە کرد**

**چەند پیاوەکە دوور کەوتنەوە**

... هتد.

۳- ئەگەر لە پێش ناوێکەوە نیشانەی (ێک، ێ)ی نەناسیاوی پێوەبێ، (ژمارە) یاخود(چەند، هەموو، کۆمەڵە...) بێت، ئەوە هەرچەندە ناوەکە شێوەی تاکی دەبێ، بەڵام بەیاریدەی ئەو وشانە واتای کۆ پێك دێ، وەك:

**ئەو وتارە بیست لاپەڕەیەک دەبێ**

**... چونکە قەت بە پێ نەڕۆیشتبووم زۆر هیلاك و ماندووبووم، لە پاش چەند سەعاتێك هێز لە ئەژنۆم بڕا، هەرچەندم کرد و کۆشام، توانای هەنگاوێکم نەمابوو بینێم بەڕێدا.**

**(لە خەوما، ل ۲۹)**

**منیش ئەم قەرارەم زۆر پێ خۆش بوو، چونکە ئەمویست سەعاتێك زووتر بگەمە جێی مقصد و هەموو ئومێدێکم لەوێ پێك بێت و لەم ناڕەحەتی و ترس و لەرزە نەجاتم بێت.**

**(لە خەوما، ل ۳۱)**

**کۆمەڵە شاخێك سەخت و گەردن کەش**

**ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش**

**(گۆران، ب، ل ١٤٥)**

تێبینی: هەروەها هەمان مەبەست لە حاڵەتی هاتنی (زۆر، ئێجگار زۆر، فرە...) یشدا، بەدوا ناوی نەناسیاوەوە، دەبینرێ، وەك:

**مەحمەڵی دەشتیان... مەڕێکی زۆری بوو**

**(تحفەء مظفریە، ب٢، ل ١٥٧)**

بینیمان کە لە زمانی کوردیدا، جگە لە نیشانەی (ان)ن، هەندێ نیشانەی تر و چەند حاڵەتێکی تایبەتی هەن کە دەبنە هۆی گەیاندنی مانای کۆ... بەڵام ئەوەی دیارو ئاشکرایە، ئەوەیە کە نیشانەی (ان)ی کۆ لە هەموان سەرەکی تر و چالاکتر و ڕەسەنترە. ئەم نیشانەیە لە حاڵەتی ڕاستەوخۆدا لە گشت بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی خواروو"[189]" و ژووروودا"[190]" (لە چەند ناوچەیەکی کەمدا نەبێ) بەدی دەکرێ.

---

[189] - گومان لەوەدا نییە کە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا نیشانەی (ان)ی کۆ لە دۆخی ڕاستەوخۆدا خۆی دەنوێنێ. ئەوەی جێی سەر سوورمان بێ، ئەوەیە کە ئی. ئا. سمیر نۆڤا لە لاپەڕە (١٥٨)ی کتێبی ناوبراودا، وای داناوە کە لە بەشەدیالێکتی کوردی موکریدا تەنیا لە دۆخی تیاندا بەرچاو دەکەوێ. بەڵام کەرەستەی بەردەستی ئەو بەشە دیالێکتەو هەندێ لە نموونەکانی نووسەر خۆی و وتاری (دیسان دەربارەی فۆرمی ناوی کۆ لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری ((نووسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات))، مۆسکۆ، ١٩٧٧، ل ٢٥٧)ی مامۆستا قەناتی کوردۆ... بەڵگەی تەواون بۆ ڕەت کردنەوەی ڕای ئی. ئا. سمیر نۆڤاو سەلماندنی ئەوەی کە نیشانەی (ان)ی کۆ لە بەشە دیالێکتی کوردی موکریدا بەرەوانی لە دۆخی ڕاستەوخۆدا دێت.

[190] - هەندێ لە نووسەرانی کرمانجیی ژووروو بە هەڵە کۆتاییی ناویان لە حاڵاتی جیاوازی تیاندا بە نیشانەی کۆی ناو داناوە. بەوێنە مامۆستا جگەرخوێن (ێن، ن، ێد، ێت)ی وەك نیشانەی کۆ باس کردووە (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل ١٧)، مامۆستا صادق بەهائەدین (ن – in)ی بە نیشانەی کۆی ناو داوەتە قەڵەم (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل ٧٠)، مامۆستا قەناتی کوردۆ لە کتێبی ((گراماتیکا زمانێ کوردی))، یەریڤان، ١٩٦٠، ل ٦٣ – ٦٤)دا (ێد، ێ)ی بەنیشانەی کۆ ژماردووە، بەڵام لەو کتێبەیدا کە ساڵی ١٩٥٧ بە زمانی ڕووسی لە ژێر

نیشانەی (ان)ی کۆ بە نیسبەت دیالێکتی کرمانجیی خوارووەوە ئاشکرا دیارە کە لە ناوچەی سۆران و بابان و موکریان... زۆر باوە. بۆ بەشە

---

ناوی ((دەستووری زمانی کوردی))دا بلاوی کردۆتەوە (ل ٥٣ — ٥٦) ڕاستی هەلکەوتی ئەو جۆرە نیشانانەی دیاری کردووە... بێگومان، ئەو چەشنە نیشانانەی لە سەرەوە ناومان بردن و هەندێکی تر، وەك (نۆ، نە...) هەڵەیە بە نیشانەی کۆی ناو، ناو ببرێن... نیشانەی کۆی ناو ئەوەیە کە لە باری ئاساییدا دەبینرێ، نەك ئەوەی لە حالاّتی جۆراوجۆری ڕێزمانیدا کە گۆڕانی بەسەردا دێت. وەك ئاشکرایە، ناو لەڕستەدا گەلێك ئەرك دەبینێ و هەمەچەشن خۆی دەنوێنێ. جاڕاست نییە کە کۆتاییی هەموو بارێکی بە نیشانەی باری ئاسایی دابنرێ. بە وێنە ئەگەر ناو لە حالەتی ئیزافەی کۆدا بوو، ئەوە لە زۆربەی زۆری بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی ژووروودا نیشانەی (ێد/ێت) یاخود (ێن)ی پێوە دەلکێ، وەك:

**زولفێد خوە کرنە پایە ئەنداز**
**دەستێد خوە کرنە فەرقێ پەروا**
**(خانی، ل ٢٠٤)**
**خۆرتێن کورد، هۆزانێن وەلاتێ تە**
**ئەڤن ڕابوونە ژ شاخ و لاتێ تە**

**(جگەر خوێن، ل ١٣٨)**

بێتو ناو لە دۆخی بانگهێشتنی کۆدابێ، ئەوە کۆتاییی بە (نۆ/ینۆ) دێت، وەك(خورتنۆ/ ینۆ هەڕن). لە ڕستەی وەك (ئەو سوارن) دا (ن — in) جێ ناوی لکاوی کەسی سێ یەمی کۆیە لە حالەتی مەفعولیدا. هەرچی (نە)یە بۆ دەربڕینی حالەتی کۆی ناوی نەناسراو بەکاردێ... و هەندێکی تر.

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداحالەتی یەکەم — واتە حالەتی ئیزافەی ناوی کۆ، کۆتایی بە (انی)ڕاستتر (ان +ی)دێت، وەك (سوارانی کورد هاتن)، یاخود (کچانی گوندی ئێمە چوون بۆ سەر کانی)... حالەتی دووەم — واتە دۆخی بانگهێشتن — کۆتاییی بە (ینە)دێت، وەك(هۆ کوڕینە ئەوە چی دەکەن)... جانابێ ئەو جۆرە کۆتایی یانە لەگەڵ نیشانەی دۆخی ڕاستەوخۆی ناودا تێکەڵ بکرێن.

دیالێکتەکانی کرمانجیی ژووروش دەبینین کە لە ناوچەی بادینان"[191]" و جەزیرە"[192]" و بۆتان"[193]" و کوردەکانی سووریا"[194]" نیشانەی سەرەکی یە.

لە نێو زمانی کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەتیشدا زۆر بەکار دەهێنرێ"[195]"، بەڵام هەندێ تایبەتێتیی هەیە"[196]".

لە بەشە دیالێکتەکانی کوردی تورکمەنستان و ئازربایجاندا نیشانەی ناوبراو بە دوو شێوە دەبینرێ — (ان) و (ا). هەرچی شێوەی دووەمە کورت کراوەی یەکەمە. شێوەی یەکەم پتر لە دووەم — واتە(ان) پتر لە (ا) — بەکار دەهێنرێ. لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستانیشدا هەردوو شێوە هەیە، بەڵام لەمدا شێوەی (ا) زیاتر لەکاردایە. هەرچی لە زمانی ئەدەبی (زمانی

---

[191] - بڕوانە: صادق بەهائەدین ئامێدی، ڕێزمانا کرمانجی، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٧٠.

[192] - بەوێنە بڕوانە بەرهەمەکانی مەلای جەزیری.

[193] - بەوێنە بڕوانە بەرهەمەکانی ئەحمەدی خانی... ئەو نموونەیەی خوارەوە مشتێکە لەو خەروارە:

**تە دوور کرم ژ نك <u>هەڤالان</u>**

**مەهجوور کرم ژ ملك و <u>مالان</u>** **(خانی، ل ٤٨٦)**

[194] - بڕوانە: جگەرخوێن، ئاوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی، بەغدا، ١٩٦١، ل ١٧ (ئەم نووسەر ژمارەیەك نیشانەی بۆ کۆی ناو ڕیزکردووەو ((ان))ی لە پێش هەموویانەوە داناوە). هەروەها بڕوانە بەرهەمی ئەدیبی نووسەرانی ئەو مەڵبەندە. ئەو نموونەیەی خوارەوەش یەکێکە لە صەدان:

**پشتی گەلەك شەڕ، کوشتن و مردن**

**ئالآ شەڕ داخست خوە سپارت <u>ترکان</u>** **(صەبری، ل ٥٢)**

[195] - فۆلکلۆرو بەرهەمی ئەدەبیی کوردەکانی سۆڤێت باشترین بەڵگەی ئەو وتانەمانن. نموونە:

**بەرتل <u>کەڤران</u> نەرم دکە** **(کوردۆ، ل ٢٢٦)**

[196] - چەرکەزی بەکۆ (باکاییڤ)، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ٦٠ — ٦١.

نووسینی کوردەکانی سۆڤێت)یشدایە تەنیا شێوەی (ا) باوە و (ان) بە هیچ جۆرێك بەدی ناکرێ.

لە بەشە دیالێکتەکانی کوردی سۆڤێت و زمانی ئەدەبییاندا نیشانەی (ان/ا)ی کۆ دەتوانێ بە هەموو ناوێکەوە بلکێ چ گیانلەبەر بێ و چ بێ گیان. حاڵتی بیژۆك تەنیا ئەو ناوانەن، کە واتایان ناتوانێ کۆ وەربگرێ، وەك: (ڕۆن، شیر، تۆراغ، هەوا، شەکر، بەفر، ماست، ئاو، دۆ، دووکەڵ، ئارد، زیو، گۆشت، جۆ، هەنگوین، گەنم...). بەم وشانەوە نیشانەی (ان/ا)نالکێ، بەلام لە حاڵەتی ئیزافەدا هێندێکیان دەتوانن شێوەی کۆ وەربگرن — واتە نیشانەی ئیزافەی کۆیان پێوە بلکێ، وەك: (ئاڤێد، کانیان...).

جیاوازی بەکارهێنانی نیشانەی (ان/ا) لە بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان، ئازەربایجان و هەروەها کوردی ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبیدا لەوەدایە کە لە دوو بەشە دیالێکتی یەکەمدا وەك نیشانەی کۆی ناو لە دۆخی ڕاستەوخۆ و دۆخی تیاندا"[١٩٧]" بەکاردێ، بەلام لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبیدا (ا) تەنیا وەك نیشانەی کۆی ناو لە دۆخی تیاندا خۆی دەنوێنێ. بەوێنە:

أ) وەك نیشانەی کۆ لە دۆخی ڕاستەوخۆدا:

**<u>گۆلکا(ن)</u> لە چەم دەرییێ دەچێرن**

**<u>بزنا(ن)</u> ژە پرا دەرباز بوون**

---

[١٩٧] - مەبەست لە دۆخی تیان (غیر مباشر – Oblique case)، ئەوەیە کە ناو لە حاڵەتی ئیزافە یاخود نیدا یاخود کارا...دا نەبێ.

لەم جۆرە حاڵەتانەدا – واتە دۆخی ڕاستەوخۆ – لە بەشە دیالێكتی كوردی ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبیدا، ناو نیشانەی (ا) وەرناگرێ، بەڵكو هەروەك حاڵەتی تاك بێ نیشانە دەمێنێتەوە، بەڵام واتای كۆ دەگەیەنێ، وەك: (گۆلك، بزن...). ئەم جۆرە بەكارهێنانە لە بەشە دیالێكتی توركمەنستان و ئازربایجاندا زۆر باوە.

ب) وەك نیشانەی كۆی ناو لە دۆخی تیاندا.

**برێ من بەرخا(ن) دەچێرینە**

**لاوێ تە لە بازاڕێ سێڤا(ن) دەفریشە**

٢– لە بەشە دیالێكتی كوردی ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبیدا:

**كەچكا كولیك بەرەڤ دكرن، خورتا ژی بەرخ دەشووشتن.**

لەتەك نیشانەی (ان/ا)دا لە بەشە دیالێكتی كوردی ئازربایجاندا، هەروەها نیشانەی (یدە، ەدە، نە، ەنە)ش نیشانەی كۆن. لەمەدا لە بەشە دیالێكتەكانی دیكە و زمانی ئەدەبی جیایە. لەو كۆمەڵە نیشانەیەدا، یەكەمیان زۆر بەكاردێ، بەڵام سیانەكەی كۆتاییان زۆر كەم دەبینرێن، وەك:

**كەڤریدە ژە مامان دەكەڤن**

**ئێڤارە مە دیت ك سە – چار كورەدە لە ناڤ مامان ڤەدەركێتن.**

**لە قشتاكا مە دوو بیست مالنە هەنە**

**من ژە تەرا قەلەمەنە ئانین.**

لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ: نیشانەی (یدە، ەدە، نە، ەنە)لە كوێوە هاتوون.

لە بەشە دیالێکتی کوردی ئازربایجاندا لە حاڵەتی ئیزافەی کۆدا (یدە) دەبینرێ و، جێناوی کەسی سێیەمی کۆ هەر(یدە)یە. سەرنج و لێکۆڵینەوە ئەوە دەردەخەن کەوا ئەم جێناوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووە بە نیشانەی کۆ. نیشانەکانی دیکەش هەر بەو جۆرە پەیدابوون. "[198]"

لە کۆتاییشدا سەرنج بۆ تایبەتی یەکی گرنگی نیشانەی کۆ لە زمانی کوردیدا ڕادەکێشین، کە ئەویش ئەوەیە:

لە کرمانجیی خواروو و ژووروشدا ئەگەر لە ڕستەدا دوو ناو یاخود پتر بە یاریدەی (و)ی پێوەندی پێکەوە بەسترابن، ئەوە دواناویان نیشانەی کۆ وەردەگرێ، بەلاَم لە ناوەڕۆکدا پێوەندی ئەو نیشانەیە، هەروەها بۆ ناوەکەی سەرەتا – واتە یەکەم – یش دەگرێتەوە، وەك:

**قازو قولنگان هاتنە خوارەوە**

**قیژو هووڕیانە بەسەر شارەوە**

**(پیرەمێرد، ل ١٤٩)**

**زولما ئاغا و بەگان خویا بوو**

**بەرێ مە دگۆت تە دگۆتا، هەڤاڵ**

**(جگەر خوێن، ل ١٣٦)**



[198] - چەرکەزی بەکۆ لە کتێبی ((زمانی کوردەکانی سۆڤێت))، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ٦٠ – ٦٥ دا لەو تایبەتی یانە دواوە. بۆ ئەم مەبەستە سوودێکی زۆرم لە سەرچاوەی ناوبراو وەرگرتووە.

# جنسەکانی ناو

لە زۆر زماندا جنسەکانی ناو بەهۆی کۆتاییی وشەوە بێت یاخود هەر نیشانە و خاسیەتێکی تر بێ لە یەك جیا دەکرێتەوە. بەوێنە لە زمانی لاتینیدا، ناو سێ جنسی هەیە: جنسی نێر (genus masculinum) ، جنسی مێ (genus femininum)، جنسی بێ لایەن( genus neutrum) ئەم سێ جنسە یا لەڕێی واتاوە یا لەڕێی نیشانەی کۆتاییەوە یا لەڕێی پاشگرەوە لە یەکتر جیا دەکرێنەوە"[199]". ناو لە زمانی ڕووسیشدا، وەك لاتینی خاوەنی سێ جنسە، بەڵام لێرەدا نیشانەی کۆتایی دەوری سەرەکیی جیاکردنەوە دەبینێ. لە زمانی ڕووسیدا جگە لەو ناوانەی کە کەسانی نێرینە و مێینە دەگەیەنن، ئەوە لەڕێی نیشانەوە جنس ئاشکرا دەبێ، بەوێنە: ١- ئەو ناوانەی کۆتاییان بە (ا) و (یا) دێت بە جنسی مێ دادەنرێن، وەك:

((ڕۆدینا – نیشتمان))، ((زیملیا – (زەوی)))... ، ٢- ئەو ناوانەی نیشانەی کۆتاییان نییە و دوادەنگیان کۆنسۆنانتی توندە بە جنسی نێر دادەنرێن، وەك: ((لێس – (دارستان)))، ((گۆرۆد – (شار)))، ((مۆست – (پرد)))، ((دۆم – (خانوو)))... ، ٣- ئەو ناوانەی کۆتاییان بە ( ۆ (یۆ)، ێ) دێت بە جنسی بێلایەن دەژمێررێن، وەك: ((پیسمۆ – (نامە)))، ((ڕوژیۆ – (چەك)))، ((مۆرێ – (دەریا)))... ، ٤- ئەو ناوانەی نیشانەی کۆتاییان

[199] - ڤ. ن. یارخۆ، ڤ، ێ. لۆبۆدی، زمانی لاتینی، چاپی دووەم، مۆسکۆ، ١٩٦٩.

نییە و دوادەنگیان کۆنسۆنانتی نەرمن یاخود کۆنسۆنانتی (ژ، ش، چ)ن نێریش و مێیشیان تێدایە، وەك: أ ((دێن – (ڕۆژ)))، ((ئوگۆل – (خەڵوون)))، ((نۆژ – (چەقۆ)،)) ((کاراندداش – (قەڵەم)))، ((ڵووچ – (تیشك))) – لە جنسی نێرن، ب– ((تێن – (سێبەر)))، ((ستال – (پۆڵا)))، ((نۆچ – (شەو))) – لە جنسی مێن...، ٥– دە وشە هەن کۆتاییان بە (میا)دێت لە ڕیزی جنسی بێلایەنن، ٦– وشەی بێگانە کە وەك وشە ڕەسەنەکان کۆتاییان بە نیشانەی جنسی بێ لایەن هاتووە، هەروەها لە ڕیزی جنسی بێ لایەن دادەنرێن، جگە لە وشەی ((کۆفی – (قاوە)))نەبێ کە لە پاڵ ناوی جنسی نێر دانراوە..." [٢٠٠]. لە زمانی فەرەنسیدا ناو دوو جنسی هەیە: جنسی نێر (Le genre masculin) و جنسی مێ ( Le genre feminin) لە نووسینی زمانی فەرەنسیی ئەمڕۆدا ناوی جنسی مێ بە زیادکردنی (e) بۆ سەر ناوی جنسی نێر پەیدا دەبێ. لەم کارەدا چۆن لە ڕووی نووسینەوە، هەروەها لە ڕووی تەلە فوزەوە گۆڕان دێتە گۆڕێ: ١– ئەو ناوانەی کۆتاییان بەدەنگی بزوێن هاتووە تەنیا لە نووسیندا گۆڕانیان بەسەردا دێت، وەك: (( un ami _ هاوڕێی نێرینە)) – ((un amie– هاوڕێی مێینە))...

٢– ئەو ناوانەی کۆتاییان بە کۆنسۆنانتی قووت دراو دێت، ئەوە لەڕووی دەربڕینیش و نووسینیشەوە گۆڕانیان بەسەردا دێت. ئەویش ئەوەیە کەئەو کۆنسۆنانتانە کاتێ (e) یان دەچێتە سەرتەلەفوز دەکرێن، وەك:

---

[٢٠٠] - بڕوانە: ئی. گ. گۆلانۆڤ، مۆرفۆلۆژیی زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ، چاپی دووەم، مۆسکۆ، ١٩٦٥، ل ٣٩ – ٤٢.

((chat – پشیلەی نێر)) – (( chatte– پشیلەی مێ))، ٣– ئەوناوانەی لە حاڵەتی نێریدا کۆتایی یان بەدەنگی بیقلۆك (الا نفی – Nasal)ی (ن) دێت، کە دەبنە مێ، ئەوە (ن) ڕوون دەبێتەوەو دەردەبڕێت. لە حاڵەتی نووسینیشدا دوو (ن) تۆمار دەکرێ، وەك: ((Lion – (نەڕەشێر))) – ((lionne – (دەڵەشێر)))، ٤– ئەو ناوانەی لەحاڵەتی نێریدا کۆتایی یان بەدەنگی (ف)ی تەلەفوزکراو دێت، ئەوە (ف) دەکرێتە (ڤ)، وەك: (((veuf – (بێوەژن) )) – ((veuve– (بێوە پیاو)))، ٥– هەروەها ناوی جنسی مێ لە ڕێگەی ئیزافەکردنی هەندێ پاشگریشەوە پەیدا دەبێ..."[٢٠١]

لە زمانە ئێرانییە دێرینەکان (ئاوێستاو فارسی کۆن)دا ناو بەپێی جنس گۆڕانی بەسەردا دەهات. جنسەکانی ناو خاوەنی دەستوورێکی تەواو ڕێك و پێك بوون و لە کاری مۆرفۆلۆژیدا دەورێکی ئاشکرا و دیاریان دەبینی... لە دەوری ناوەڕاست و نوێی زمانە ئێرانییەکاندا چارەنووسی جنسەکانی لە زمانە ئێرانییە جیاجیاکاندا وەك یەك نەبوون. لە بەشێکیاندا بە تایبەتی لە فارسی و تاجیکیدا نەماون و لە هەندێکیشیاندا پارێزراون، بەڵام لەگەڵ ئەو پاراستنەدا گۆڕانیشیان بەسەردا هاتووە. جنسەکانی ناو وەك حاڵەتێکی ڕێزمانی زیندوو لە زمانە ئێرانییە ناوەڕاستەکانی، وەك: سوگدی و خۆتەنی، لە زمانە ئێرانییە نوێکانی وەك ئەفغانی (پشتۆ) و دیالێکتەکانی خوارووی تاتی دیالێکتی ژوورووو و هەندێ بەشە دیالێکتی خوارووی کوردیدا خۆی دەنوێنێ. پاشماوەی جنسەکانی ناو، ناو ناوە لە هەندێ لە زمانە ئێرانییە

---

[٢٠١]– بڕوانە: ێ. ڤ. کۆستێتسکایا، ڤ. ی. کارداشێڤسکی، ڕێزمانی فەڕەنسی، چاپی حەوتەم، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ١٨ – ١٩.

نوێکانی وەك: خوارەزمی و پووشانی و دیالێکتی خوارووی کوردی... دا خۆیان نیشان دەدەن.

لە زمانە ئێرانییە کۆنەکاندا ناو سێ جنسی هەبووە: نێرو مێ و بێ لایەن. ئەو سێ جنسە لە دوو ڕێوە لە یەك جیا دەبوونەوە:

١- ناوی نێر و ناوی بێ لایەنی بە (ە) کۆتایی هاتوو، بەرانبەر بە ناوی مێی بە (ا) کۆتایی هاتوو دەوەستان. بەوێنە لە ئاوێستادا وشەی ((ئەسپە aspa – (ئەسپ))) لە جنسی نێرە و بەرانبەری وشەی ((ئەسپا – aspa (ماین) )) کە جنسی مێیە دەوەستێ. وشەی ((ئەکە – aka– (خراپ) )) کە لە جنسی نێر و بێ لایەنە، بەرانبەر بە وشەی ((ئەکا aka – (تووڕە) کە لە جنسی مێیە دەوەستێ...

٢- بەرانبەر بە ناوی نێر و ناوی بێ لایەنی سەر بە کۆمەڵانی دیکە، ناوی مێی بە (ی – آ) کۆتایی هاتوو دەوەستێ. بە وێنە لە ئاوێستادا وشەی ((مەس mas– (مەزن) ))، بۆ جنسی نێرو بێ لایەنە، ئەگەر بکرێتە ((مەسی masi)) ئەوە بۆ جنسی مێیە. وشەی ((نەپت napt)) واتای (نەوەی نێرینە) دەگەیەنێ، بەڵام کاتێ (نەوەی مێینە) ببێنە مەبەست، ئەوە دەوترێ ((نەپتی napti)).

لە زمانی ئاوێستادا ئەو هەردوو ڕێگەیە زۆر لە کاردا بوون، بەڵام لە زمانی فارسیی کۆندا ڕێگەی یەکەم پتر دەوری دەبینی "[٢٠٢]".

---

[٢٠٢]- ڕوانە: ڤ. ئا. یفیمۆڤ، خاسیەتی گشتیی پێشکەوتنی جنسەکانی ناو لە زمانە ئێرانییەکاندا، کتێبی ((زمانە ئێرانی یەکان))، مۆسکۆ، ١٩٧٦، ل ٢٣، ٢٥.

لە زمانە ئێرانییەکانی دەوری ناوەڕاست و نوێدا جنسەکانی ناو گۆڕانێکی زۆریان بەسەردا هات. لە زمانی فارسیی ناوەڕاست و هەندێ زمانی ئێرانیی نوێدا نەماون. لە هەندێ زمانی تریشدا وایان لێ هات کە لە حاڵەتی ئاساییدا نیشانەی جیاکردنەوەیان پێوە نەمێنێ و تەنیا لە ڕستەدا بتوانن بە دەربکەون... "[٢٠٣]

لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیدا، بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانی هەندێ شوێنی تردا لە مێژە جنسەکانی ناو دەوریان نەماوە و بەرگی سستیان لەبەرکراوە... بەڵام لە دیالێکتی ژووروو هەندێ بەشە دیالێکتی خواروودا هەرچەندە لە حاڵەتی ئاساییدا نیشانەی جیاکردنەوەی جنس بەسەرچووە، بەڵام لەڕستەدا بە تایبەتی لە دۆخی تیان و دۆخی بانگهێشتن و دۆخی ئیزافەدا ڕوون و ئاشکرا خۆیان دەنوێنن. بە وێنە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ناوی جنسی مێ لە دۆخی ئیزافەدا نیشانەی (ا) وەردەگرێ"[٢٠٤]. بێگومان ئەمەش سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە ئەم (ا) یەی نیشانەی جنسی مێی ئیزافەی دیالێکتی ژووروی کوردی لەو (ا)یەی نیشانەی جنسی مێیەی حاڵەتی ئاسایی ئاوێستاوە مابێتەوە کە لە سەرەوە لێی دواین.

لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیی ئەمڕۆدا (بەتایبەتی لە زمانی ئەدەبیدا) نیشانەی تایبەتیی وەها نییە کە لە دۆخی ئاساییدا جیاوازیی

---

[٢٠٣] - هەمان سەرچاوە، ل ٢٨.

[٢٠٤] - شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئەم کێشەیە، دواتر بەدوور و درێژی باس کراوە.

جنسی ناو دەربخا، بەلاَم لەگەلَ ئەوەشدا لە ڕێی واتاوە دەتوانین چوار چەشن دیاری بکەین:

**١- ناوی نێر:**

ناوی نێر ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا هەر بۆ جنسی نێر دانرابێت. لە زمانی کوردیدا ناوی جنسی نێر لەو پۆلە وشانەی خوارەوە پێك دێ:

أ) ناوی کەسانی نێرینە — وەك:

پیاو، باوك، کوڕ، برا، خالَ، مام، زاوا، باپیر، مێرد، زڕباب (زڕباوك)، خەزوور..

ب) ناوی تایبەتیی کوڕان. وەك:

شێرکۆ، نەژاد، بەختیار، هێمن، وریا، هیوا، گۆران، سەردار، سمکۆ، نەوزاد، ئازاد...

ج) ناوی گیانلەبەری نێر. وەك:

ئەسپ، کەلَەشێر، هێستر، بەران، کەلَ...

د) ناوی هەندێ پیشەی پیاوانە. وەك:

نانەوا، خزمەتکار، نۆکەر، سەپان، شوان... و هەندێکی تر.

**٢- ناوی مێ:**

ناوی مێ ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا هەر بۆ جنسی مێ دانرابێت. لە زمانی کوردیدا ناوی جنسی مێ لەو پۆلە وشانەی خوارەوە پێك دێ:

أ) ناوی کەسانی مێینە. وەك:

ژن، کچ، خوشك، بووك، پوور، دایك، خەسوو، باوەژن، نەنك، خالۆژن، ئامۆژن، براژن، هێوەرژن...

ب) ناوی تایبەتیی کچان. وەك:

نەسرین، شیرین، نازدار، پرشنگ، گوڵاڵە، پەروین، گوڵزار، شاناز، هێرۆ، چرا، جوان...

ج) ناوی گیانلەبەری مێ. وەك:

مریشك، ماین...

د) ناوی هەندێ پیشەی ژنانە. وەك:

نانکەر"[٢٠٥]"، جل شۆر، کارەکەر، مامان، دایەن، بەربووك...

... و هەندێکی تر.

**تێبینی:** ئەگەر هەندێ لە ناوی کچان و کوڕانی کوردی وردببینەوە، ئەوە هەندێ زانیاریمان بۆ دەردەکەوێ:

أ) ئەو وشانەی واتای هێز و ئازایی و گەورەیی و تێکۆشان... یان تێدایە کراونەتە ناوی کوڕان. وەك:

پۆڵا، پێشەوا، پێشڕەو، جوامێر، پشتیوان، خەبات، سەردار، نەبەز، شێرزاد، شاسوار، شێرکۆ، دلێر،... هتد.

ب) ناوی چیا (کە ئەمیش هەر واتای گەورەیی و بەرزیی تێدایە) و کەمێك لە ناوی ئاوایی و ڕووبار بۆ ناوی کوڕان بەکارهێنراون. وەك:

هەڵگورد، بێستوون، هەورامان، موکریان، ئاراس، سیروان... هتد.

ج) ئەو وشانەی واتای هیوا و ئامانج و خۆشی و... یان تێدایە بەزۆری کراونەتە ناوی کوڕان. وەك:

هیوا، ئامانج، ئومێد، کامەران، بەختیار، ئازاد، دڵشاد... هتد.

---

٢٠٥- وشەی ((نانکەر)) تەنیا بۆ مێینە بەکاردێ و وشەی ((نانەوا))ش تەنیا بۆ نێرینە.

د) ناوی گوڵ و درەخت و ئەستێرەو ڕووناکی و مەل و هەرشتێکی دیکە کە جوانی و نازداری و ناسکی... یان تێدابێ کراونەتە ناوی کچان. وەك:

شەوبۆ، هێرۆ، هەلاڵە، گولاڵە، گوڵە، مینا، شکۆفە، خونچە، گوڵچین، وەنەوشە، گوڵناز، نێرگز، یاسەمین، چنار، سەروو، ئەختەر، ئافتاو، پرشنگ، ڕووناك، تریفە، چرا، قومری، ئاسکۆڵ، ئاواز، ئاهەنگ، ئەڵماس، پاکیزە، تەلا، دولبەر، ژیان، سەیران، سروە، شاناز، شیرین، فریشتە، لەنجە، مژدە، نازەنین، ناسك... هتد.

هـ) بەشێك لە ناوی ئاوایی بووەتە ناوی کچان. وەك:

کوێستان، کوردستان... هتد.

هەرچەندە لە زمانی ئەدەبیدا نیشانەی نێر و مێ نەماوە و زۆربەیان بوونەتە ناوی بێ لایەن، کەچی سەلیقەی کوردەکە وای کردووە کە زۆربەی ئەو ناوانەی بۆ ناونانی نێرینە و مێینە بەکاردێن لەگەڵ ئەسڵی جنسەکانیاندا یەك بگرنەوە. ئەگەر لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداکە لە دۆخی تیاندا نیشانەی جنسی نێر و مێ ڕوون و ئاشکرا بەدەردەکەون، تەماشای ئەو ناوانەی سەرەوە بکەین، ئەوە ڕاستی و دروستی ئەو سەلیقەیە دەسەلمێنین... بەڵام پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە لەم کارەدا ناوە ناوە هەندێ هۆ وایان کردووەکە ناوی جنسی نێر بۆ ناونانی کچان بڕوات. بە پێچەوانەشەوە ناوی جنسی مێ بۆ ناونانی کوڕان بەکاربهێنرێت.

**٣- ناوی دوولایەن:**

ناوی دوولایەن ئەو ناوەیە کە بۆ نێر و مێ بەکاردێت. وەك:

کۆتر، مرواری، کەو، ڕیشۆڵە، هەڵۆ، گیسک، بەرخ، دوژمن، هاوڕێ، دۆست، شاگرد، بەرگدروو، مامۆستا، قوتابی، هەڤاڵ... هتد.

بەشێك لە ناوی دوولایەن لە ڕێگەی بەکارهێنانی وشەیەکەوە لەگەڵیدا، دەتوانرێ بەلایەکدا بخرێت و جنسی بۆ دیار بکرێت. وەك:

| **ناوی دوولایەن** | **بۆ نێر** | **بۆ مێ** |
|---|---|---|
| **کەر** | **نێرەکەر** | **ماکەر** |
| **کەو** | **نێرەکەو** | **ماکەو** |
| **ورچ** | **نێرەورچ** | **دەڵەورچ/ دێڵەورچ** |
| **سەگ** | **گۆڵەسەگ** | **دەڵەسەگ/ دێڵەسەگ** |
| **بەرخ** | **بەرخەنێر(بەرخی نێر)** | **بەرخەمێ (بەرخی مێ)** |
| **گیسك** | **گیسکە نێر (گیسکی نێر)** | **گیسکەمێ (گیسکی مێ)** |
| **... هتد.** | | |

بەم جۆرە وشەکانی (نێر، گوڵ...) یاریدەی دیاری کردنی جنسی نێر دەدەن، وە وشەکانی (ما/مێ، دەڵ/ دێڵ...) هاریکاری پێکهێنانی جنسی مێ دەدەن"[٢٠٦].

**٤- ناوی بێ لایەن:**

ناوی بێ لایەن ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا جنسی نێرو مێ نییە، وەك: ژوور، نان، دار، ترێ، هەنار، خوێ، سەر، لووت، چاو، خوێن، بەرد، گەنم، جۆ..."[٢٠٧]" لە سەرەوە وتمان کە گوایا لە دیالێکتی خوارووی زمانی

---

[٢٠٦]- ڕاست نییە کە وشەکانی (نێر، گۆڵ، دەڵ، دێڵ...) بە (نێرە، گۆڵە، دەڵە، دێڵە...) دابنرێن، چونکە ئەو (ە)یە مۆرفێمی پێوەندییە.

کوردیی ئەمڕۆدا نیشانەی تایبەتیی جیاکردنەوەی جنس نییە، بەڵام پێویستە پونجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە لە چەند حاڵەتێکدا نیشانەی وا بەدەردەکەون کە جیاوازی جنس دەگەیەنن. بە وێنە:

**١- لە دۆخی تیاندا.**

لە ناوچەی موکریان و سۆران و... تەنانەت هەندێ لە دەوروپشتی سلێمانیش، ناو ئەگەر نێربوو لە دۆخی تیاندا نیشانەی (ی)ی پێوە دەلکێ، بەڵام کە مێ بوو نیشانەی (ێ)ی دەچێتەسەر"[٢٠٨].

بێگومان، ئاخاوتنی خەڵکی ئەو مەڵبەندانە و کەرەستەی تۆمارکراویان بەڵگەی واقیعی و لەبارن لە چەسپاندن و گەشەپێدان و پێشخستنی کێشەی لێکۆڵینەوەی جنسەکانی ناودا. جا بۆ پێ سەلماندنی ئەو وشانەمان چاوێك بە فۆلكلۆری تۆمارکراوی ئەو ناوچانەدا دەگێڕین.

---

[٢٠٧] - ئەو ناوانە نەك تەنیا لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا، بەڵکو لە هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجیی خوارووشدا بەهۆی نیشانەی تایبەتییەوە بەسەر نێرو مێدا دابەش دەبن، بەڵام لە زمانی ئەدەبیدا نیشانەکانیان سواون و تێچوون و بەمەش هاتوونەتە ڕیزی ناوی جنسی بێ لایەن.

[٢٠٨] - لە ناوچەی موکریان و سۆران جیاکردنەوەی نێرومێ لە دۆخی تیاندا زۆر باوە. هەرچەندە مامۆستایان: ك. ر. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا لە کتێبی ((دیالێکتی کوردیی موکری)) (لێنینگراد، ١٩٦٨، ل ٢٥ – ٢٦)دا، وە مەسعوود محەمەد لە وتاری : هەڵدانەوەی چەند ڕوپەڕێکی‌زمانی کوردی، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد)) (بەرگی پێنجەم، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٢٧٩ – ٢٨١)دا پەنجەیان بۆ ئەو ڕاستی یە ڕاکێشاوە و بۆ پێ سەلماندنی چەند نموونەیەکیان هێناوەتەوە، بەڵام تێکڕا شتێکی ئەو تۆیان دەربارەی ئەو کێشە گرنگە تۆمار نەکردووە، ئەویش بەتایبەتی لەبەرئەوەی کە تەنیا لە زانینی خۆیانەوە بۆ باسەکە چوون و بێئەوەی چاوێك بەو کەرەستە بایەخ دارانەدا بگێڕن کە لەبەردەستدان.

أ_ لە ناوچەی موکریان:

گومان لەوە ناکرێ کە لە کاری ساغکردنەوەی کێشەی نێر و مێ لە بەشە دیالێکتی موکریدا کتێبی ((تحفەء مظفریە)) باشترین سەرچاوەیە. لە تەماشاکردنێکی ناوەڕۆکی کتێبی ناوبراودا جنسی سەدان ناومان لێ ئاشکرا بوو. بەو نووسراوەدا بۆمان دەرکەوت کە لە بەشە دیالێکتی موکریدا وشەکانی: ((دار، ئاو، شەرم، ژان، غەم، ئیمان، قیامەت، دارستان، زەمین، ڕاو، شەڕ، کار، کوێستان، گەرمیان... ناوی هەموو شار و ئاوایی (جگە لەوشەی ((شار، دێ، گوند... کە نێرن))...)...)) لە جنسی مێن، وە وشەکانی: ((میر، هەویر، شێر، شان، کەباب، ئاوڕ، دمدم، بەرد، شار، دێ، گوند...)) لە جنسی نێرن... هتد"[209].

بۆ پێ سەلماندی تەواوی ئەم مەبەستە هەندێ ڕستە لە نووسراوی ناوبراو دێنینەوە.

نموونە بۆ جنسی نێر:

**((... قاسد سبحەینێ هەڵستا، دەرکیان لێ کردەوە چووە کن خانی، کاغەزی دا بە خانی...))**

**((تحفەء مظفریة، ب١، ل ١٨١))**

**((لەشکری شاە عەبباسی پێیان زانی...))**

**(ب١، ل ١٨١)**

**((گوتی دەتان بەمە کن سوڵتانی))**

**(ب١، ل ١٨٧)**

---

[209] - هیوادارم ئەم باسە بەوتارێکی تایبەتی بخەمە بەردەستی خوێنەرانی ئازیز.

**((جاڕیان لە شاری دا کێشا))**

**(ب١، ل ١٨٦)**

**((ڕێوییێك چووە کن کەڵەبابی))**

**(ب١، ل ١٩٢)**

**((... چۆکی دادا لە پێش میری))**

**(ب١، ل ٢١٠)**

**((... خواردنەکی هێنا، دەپێش میری نا))**

**(ب١، ل ٣٧٣)**

**((لەسەر کۆشکی کاکە مەمی...))**

**(ب١، ل ٢٢٥)**

**((ئەحمەد ئاغا سەرو بەرگی پۆشی چووە زگ شێری))**

**(ب١، ل ٣٣٤)**

... هتد.

لەو ڕستانەی سەرەوەدا، وشەکانی (خان، شاە عەبباس، سوڵتان، شار، کەڵەباب، میر، مەم، شێر...) لەبەر ئەوەی لە جنسی نێرن و لە دۆخی تیاندا، نیشانەی (ی)یان پێوە لکاوە.

نموونە بۆ جنسی مێ:

**((ئەمن دەزانم کاکە مەم دەگەڵ یایە زینێ دە دیوانێ خەوی لێ کەوتووە))**

**(ب١، ل ٣١٢)**

**((لەوێ چاوی بە خەزاڵێ مەلا نەبییان کەوتبوو))**

**(ب١، ل ٣١٥)**

**((خان ئەحمەد خان شکا چوو بۆ ئەستەمبوولێ))**

**(ب١، ل ١٧٩)**

**((... بە کوردستانێ دا هات...))**

**(ب١، ل ١٧٩)**

... هتد.

بەو پێیە دەبینین وشەکانی (یایەزین، دیوان، خەزالێ، ئەستەمبوولێ، کوردستان...)) نیشانەی (ێ)یان وەرگرتووە، چونکە لە جنسی مێن و لە دۆخی تیاندان.

لە گەشتی کتێبی (تحفەء مظفرية)دا گەلێ جار ئەوە هاتۆتە پێش چاومان کە لە یەك ڕستەدا بە ئاشکرایی هەردوو جنسەکە خۆیان بنوێنن. بە وێنە کە لە لاپەڕە (٣٤)ی بەرگی یەکەمدا وتراوە: ((دایکی لاسی نێوی شەمێ بوو))، ئەوە گومان ناکرێ کە ((لاس)) ناوی نێرینەیە، وە((شەم))یش ناوی مێینەیە. جا هەرلەبەر ئەو هۆ و یاسا و دەستوورە ڕەچاوکراوەیە کە ((لاس)) نیشانەی (ی)ی پێوە لکاوەو ((شەم))یش نیشانەی (ێ)ی وەرگرتووە. یاخود کاتێ کە حیکایەتخوان وتوویە: ((شاە عبباس لە ئیسفەهانێ لەشکری نارد بۆ سەر خان ئەحمە خانی...)) (ب١، ل ١٧٩)، ئەوە لەگەڵ وشەکانی ((ئیسفەهان)) و ((خان))دا بەگوێرەی جنسەکانیان موعامەلەی لەگەڵ کردوون - واتە نیشانەی (ێ)ی بەو شەی ((ئیسفەهان))ەوە لکاندووە، چونکە لە جنسی مێیە، وە لەبەرئەوەی وشەی ((خان)) ناوی جنسی نێرە نیشانەی (ی)ی خستۆتە سەر...

ب- لە ناوچەی سۆران.

لە ڕوونکردنەوەی کێشەی نێر و مێ لە بەشە دیالێکتی سۆراندا ناوەڕۆکی کتێبی ((فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری)) کەرەستەیەکی بێ هاوتایە و ئێمەش دەیکەینە سەرچاوەی ئەم بەشەی باسەکەمان.

نموونە بۆ جنسی نێر:

**چاوت وەکی چاوی ماری**

**خۆت لۆم باوێ سەر دیوارێ**

**ماچت دەکەم پڕ بە زاری**

**(فۆلکلۆر، ل ٦٠)**

**چایەکی یەك ڕەنگی دامێ**

**ئاویش لە سەماوەری**

**(ل ٨٠)**

**بووکی مارێ میری**

**بردیان لۆ یەخسیری**

**(ل ٢٠٣)**

**مەیلەکم هەیە مەیلانی**

**لەناو بوخچەی سوڵتانی**

**خوانەبێ کەس نازانی**

**(ل ١٢)**

**... هتد.**

**نموونە بۆ جنسی مێ:**

**جانم عەیشۆکێ ئۆمەری**

**گوڵێ ڕۆیی لۆ ئەوبەری**

**(ل ٤٠)**

**لە دونیاییم لۆ نەبووی**

**چت لێ بکەم لە قیامەتێ**

**(ل ٩٤)**

**بای شەمار بە هاوینێ**

**دەیدا لە ڕەندەی جۆخینێ**

**خەو خۆشە لەگەر ئامینێ**

**(ل ٢٩)**

**سینگ مافووری خۆرەسان**

**هێنام لەلای لاجانێ**

**(ل ٣٣)**

**... هتد.**

چۆن لە کتێبی ((تحفەء مظفریـة))دا، هەروەها لە کتێبی ((فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری))شدا ڕستەی ئەو تۆ دێتە بەرچاو کە هەردوو جنسەکە خۆیان تێدا نواندووە. بەوێنە:

**نوشتی یەکمان کردبە مەلای**

**بابت بچێ لۆ دەشتێ**

**(ل ٧٩)**

**بەسەری شێخ حوسینی**

**ئاویٚ لۆ کەپریٚ دێنی**

**(ل ٩٠)**

**... هتد**"[٢١٠].

ج- لە ناوچەی سلێمانی:

هەندێ پەندی پێشینان هەن، کە نیشانەی (ێ)ی جنسی مێیان تێدا بەدی دەکرێ. جا ئەو (ێ)یەی خۆی لەو پەندانەدا نواندووە لەوە دەچن پاشماوەی جنسی مێ بێت لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا.

**دشی دشیٚ، بەچی دەچیٚ**

**(پەندی پێشینان، ل ٢١٦)**

**لە گەورە گەورەی پشدەریٚ، هۆمان کەوتە قوون مزە هاجەریٚ.**

**(ل ٣٥٤)**

**ژن لە ساجیٚ، مێرد لەحەجیٚ پێکەوە گەیشتەجیٚ.**

---

٢١٠- لە کتێبی ((فۆلکلۆری هۆنراوەی کوردەواری)دا گەلێک ناو جارێک وەک جنسی مێ و، جارێک وەک جنسی نێر موعامەلەیان لەگەڵ کراوە. بۆ نموونە وشەی ((مووسڵ))لە لاپەڕە(٨١) و هەندێ شوێنی تردا نیشانەی (ێ)ی پێوە لکێنراوە، کەچی لەلاپەڕە (٤١)دا نیشانەی (ی)ی خراوەتە سەر، لەلاپەڕە (١٠١)دا چەند جارێک وشەی ((لانك))بەکارهێنراوە. بەشێکیان (ێ)یان پێوە لکێنراوە و هەندێکیان(ی). بەوێنە لە دێڕێکدا نووسراوە: ((بابی لانکێ سەگی هارە))، کەچی پاش چەند دێڕێك دەڵێ: ((بابی لانکێ سەیێ پیرە))... لە کتێبی ناوبراودا ئەو جۆرە تێکەڵ کردنە زۆرە. جا ئایا ئەمە هەڵەی چاپە یان هەڵەی مامۆستا محەمەد کەریم شەریفە یان هۆی بەرەو نەمان و تێچوونی جیاوازی جنسە یان پێویستیی قافیەیە یان هەر هۆیەکی دیکەیە شوێن کەوتن و لێکۆڵینەوەی دەوێ.

**(ل ٣٦٤)**

... هتد "[٢١١].

٢- لە زۆربەی دیالێکتی خوارووەدا لە دۆخی بانگهێشتندا جیاوازی لە نێوان نێر و مێدا دەکرێ. تەنانەت لە ناو سلێمانیشدا کۆمەڵێك وشە هەن کە لە حاڵەتی ناوبراودا ئەو جیاوازییەیان تێدا بەدی دەکرێ، ئەویش ئەوەیە کە بە کۆتاییی ناوی نێرەوە نیشانەی (ە) و، بە کۆتایی ناوی مێوە نیشانەی (ێ)دەلکێ، وەك:

نموونە بۆ جنسی نێر:

**ئەی بابە ئەی نووری نەزەر          چەند حەقی تۆم کەوتۆتە سەر**

**(زێوەر، ل ٩١)**

**ئەی مەلا"[٢١٢]" تۆبی خودا لەم فیکرە کۆنە لابدە**

**باسی قەبر و مار بگۆڕە، بێرە سەر باسی وەطەن**

**(بێکەس، ل ٦٥)**

نموونە بۆ جنسی مێ:

---

[٢١١]- لەو نموونانەی سەرەوە باوەڕ پتر بۆ ئەوە دەچێ کە وشەکانی ((دش، پشدەر، ساج، حەج)) ناوی جنسی مێ بن، چونکە وشەی ((دش))لە هەموو ڕوویەکەوە بەجنسی مێ دادەنرێ. هەرچی وشەکانی ((پشدەر))و ((ساج))و ((حەج)یشن لە دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی تری کوردیدا وەك ناوی جنسی مێ بەکارهێنراون، بەڵام هەندێ پەندی پێشینانی ئەوتۆش بەرچاو دەکەون کە هەرچەندە نیشانەی (ێ)یان تێدا بەدی دەکرێ، بەڵام سەرنج بۆ ئەوە دەچێ کە ئەو جۆرە پەندانە لە بەشە دیالێکتی ترەوە وەرگیرابن، یاخود بۆ ڕێکەوتنی وەزن وا وترابن...

[٢١٢]- لێرەدا لە گەیشتنەیەکی بزوێنی (ا)و(ە)دا، نیشانەی (ە)تێداچووە.

**بووکێ لەگەڵ تۆمە، خەسوو"[٢١٣]" گوێت لێ بێ**

**(پەندی پێشینان، ل ٩٥)**

**پووریێ فەرموو بۆ لای سەروو.**

**کچێ ئاگاداری ئەو منداڵە بە.**

... هتد.

لێرەدا سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین کە (ە)ی نیشانەی بانگهێشتن بە زۆری بێ جیاوازی بۆ هەردوو جنس بەکاردێنرێ. هەرچی نیشانەی (ێ)یە تەنیا بە ناوی جنسی مێوە دەلکێ. وەك:

**پوورە/پووریێ بۆ کوێ دەچی**

**کوڕە وەرە بخوێنە**

ئەگەر بانگهێشتن لە حاڵەتی کۆدا بێ، ئەو دەمە بێ جیاوازی جنس، نیشانەی (ینە)بە ناوەوە دەلکێ، وەك:

**ئەی کوردینە، ئەی مەردینە**

**با دەست لەناو دەست کەین هەموو**

**(زێوەر،ل ١١٠)**

**کوڕینە/کچینە خێرا وەرن.**

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا، هەروەها نیشانەی تایبەتی وەها نییە کە لە حاڵەتی ئاساییدا جیاوازی جنسی ناو نیشان بدات، بەڵام لە ڕستەدا هەموو ناوێك بە گوێرەی جنسی خۆی نیشانە وەردەگرێ. بەو پێیە لەم

---

[٢١٣] - وشەی ((خەسوو))ش هەرناوی جنسی مێ یەو لە دۆخی بانگهێشتندایە، کەچی نیشانەی (ێ)ی پێوە نەلکاوە. هۆی ئەمەش ئەوەیە کەلەدۆخی ناوبراودا، ئەگەر ناو کۆتاییی بە بزوێن بێت، ئەوە نیشانە وەرناگرێ

دیالێکتەدا کێشەی جنس دەستوورێکی تەواوی هەیە و لە ڕێگەی ئیزافەکردنی نیشانەوە دەتوانرێ جنسەکانی ناو دیاری بکرێن:

١- لە دۆخی تیاندا.

لەم دیالێکتەدا، هەروەك لە ناوچەی موکریان و سۆران و هەندێ شوێنی دەوروپشتی سلێمانی، ناو ئەگەر نێر بوو لە دۆخی تیاندا نیشانەی (ی)ی پێوە دەلکێ، بەلام کە مێ بوو نیشانەی (ێ)ی دەچێتەسەر.

نموونە بۆ ناوی جنسی نێر:

**ب خدمەت عەرضی سولطانی**

**عەبیر و عەنبەر ئەفشان بت**

**(جزیری، ل ٥٤١)**

**(جەزیری، ل ٥٤٤)**

**گوتنێت میری**

**گاڤا کو دچینە نێڤ مەزاری**

**دا خەلقی نەبێژتن ب زاری**

**(خانی، ل ٣٩٢)**

**وەکی مێران دەست بدە خوە**

**وی شووری هلدە ڕاست و چەپ داوەشینە**

**(صبری، ل ٦٠)**

**وان دل ب کول و دەردان**

**ژ بانی ڤە خوە بەردان**

**(جگەر خوێن، ل ١٧٥)**

... هتد.

نموونە بۆ ناوی جنسی مێ:

**پەروەردە بکی ب ئافیتابێ**

**هەردەم بڕەشینی لێ گولابێ**

**(خانی، ل ٤٤٦)**

**دو ڕەشماران سەمەن سوڕ بوو**

**مە دل مابوو د خیالێ دا** **(جەزیری، ل ٥٤٤)**

**یەك ئارمانج**

**یەك ڕێزان**

**یەك ڕامان**

**خەباتێ بکی**

**ژ بۆ کوردستان** **(صبری، ل ٦٧)**

**ل سەیدا گوە بدێرە ئەز بێژم**

**چەند دلۆپان ژ خەمێ بڕێژم**

**(جگەر خوێن، ل ١٣٨)**

**...هتد.**([٢١٤])

---

[٢١٤] - زۆربەی ئەو نووسەرانەی دەربارەی نێر و مێ لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دواون، (ا)یان بە نیشانەی جنسی مێ و، (ێ)یان بە نیشانەی جنسی نێر داناوە. بەداخەوە ئەو نووسەرانە بە هەڵە بۆ ئەو باسە چوون و لە ڕاستیدا، وەك لە سەرەوە نیشانمان دا نەك هەر لە دیالێکتی ناوبراودا، بەڵکو لە هەندێ بەشە دیالێکتی خوارووشدا لە دۆخی تیاندا نیشانەی(ێ) بە ناوی جنسی مێوە دەلکێ و نیشانەی (ی)یش دەچێتەسەر ناوی جنسی نێر. جا هەرچی ئەو هەڵەیەی نووسەرانە لەوەوە هاتووە کە نیشانەی ئیزافەی نێرو مێ سەری لێ شێواندوون. بێگومان لە لێکۆڵینەوەی ئەو کێشەیەدا ڕاست وایە کە نیشانەکانی نێر و مێ بە گوێرەی

ئەو نموونانەی سەرەوە ئەوە دیاردەخەن، کە نیشانەی (ێ)و (ی)لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەوری جیاکردنەوەو نیشاندانی جنسی ناو دەبینن. بەوێنە لە ڕستەی ((ئەز چووم نك ئەحمەدی))دا وشەی ((ئەحمەد)) لەبەر ئەوەی ناوی جنسی نێرە، نیشانەی (ی) وەرگرتووە، بەڵام ئەگەر وشەی ((نەسرین)) کە ناوی کچە لە جێی ((ئەحمەد)) دابنرێ، ئەوە نیشانەی (ێ) وەردەگرێ و دەوترێ ((ئەز چووم نك نەسرینێ))... لە ڕستەی ((ئەز مریشکێ کڕم))دا نیشانەی (ێ) بە وشەی ((مریشك))ەوە لکاوە، چونکە ناوی جنسی مێیە، بەڵام بێتو وشەی ((دیکل)) کە ناوی جنسی نێرە بخرێتە شوێنی وشەی ((مریشك))، ئەوکاتە نیشانەی (ی) دێتە ناوانەوە و دەوترێ: ((ئەزێ دیکلی کڕم))...

لە دیاڵکتی کرمانجیی ژووروشدا هەندێ ناو بەرچاو دەکەون، کە لەڕیزی جنسی دوولایەن دابنرێن، وەك: هەڤاڵ، سەرکار، دژمن، دۆست، بەرخ، کار، گۆلك، پشیك، کاڤڕ... و گەلێکی تر. ئەو جۆرە ناوانە کاتێ لە دۆخی تیاندا بە واتای مێ دێن، ئەوە نیشانەی (ێ) یان دەچێتە سەر، خۆ ئەگەر بەواتای نێر بێن، ئەودەمە نیشانەی (ی)یان پێوە دەلکێ. بەوێنە ((ئەزێ بەرخێ چێرینم))، ئەوە دەگەیەنێ ((من بەرخی مێ دەلەوەڕێنم))، بەڵام کەدەوترێ

---

حاڵەتەکانیان جیابکرێنەوە و باس بکرێن. بە وێنە ئێمە لە لێکۆڵینەوەماندا بۆمان دەرکەوتووە، لە دیالێکتی ژووروودا لە دۆخی تیان و بانگهێشتندا (ێ)و لە دۆخی ئیزافەدا (ا،ە)جنسی مێ دیاری دەکەن. هەرچی جنسی نێرە لە دۆخی تیاندا (ی) و لە دۆخی بانگهێشتندا(ۆ) و لە دۆخی ئیزافەدا (ێ، ی) وەردەگرێ. جا ئەو هەموو نیشانانە بەپێی شوێن و جنسەکانی ناو دیاری دەکەن، کەچی تازە لە هەندێ باسی زمانەوانیدا، هەرئەوە دەکوترێتەوە کە وتراوە، (ا) نیشانەی جنسی مێیە و (ێ)نیشانەی جنسی نێرە.

((ئـەزێ بـەرخێ چـێرینم)) ئـەوە دیـاری دەکـا کـە ((مـن بـەرخی نێـر دەلەوەڕێنم))...

بـەو پێیـە، بینیمـان لـە دیـالێکتی کرمـانجیی ژووروودا جنسـەکانی نـاو دەستوورێکی ڕێك و پێکیان ڕەچاو کـردووە و لـە ڕێگـەی نیشـانەوە لەیـەکتر جیا دەبنەوە. لە دۆخی تیاندا جنسی مێ نیشانەی (ێ) وەردەگرێ و جنسـی نێریش نیشانەی (ی)ی پێوە دەلکێ. لـە بەشـە دیالیکتی مـوکری و هەنـدێ ناوچەی سۆران و کەمێك لە دەوروپشتی سلێمانیدا، هەرچەندە وەك دیالێکتی کرمانجیی ژووروو ڕێك و پێك خۆیان نانوێنن، بەڵام تـا ڕادەیـەك دەسـتووری خۆیـان پاراسـتووە. لـەم بەشـە دیالێکتانـەی خوارووشـدا هـەر نیشـانەی (ێ)دەچێتە سەر ناوی جنسی مێ و هەر نیشانەی (ی)ش ئیزافـە سـەر نـاوی نێر دەبێ. لە زمـانی ئـەدەبی و ئاخـاوتنی سـلێمانی و هەنـدێ ناوچـەی تـردا نیشانەی نێر و مێ (جگە لە چەند حاڵەتێکی زۆر کەم نەبێ) نەماوە.

بێگومان، نزیکیی نیشانەی نێرو مێ و یەکگرتنـەوەی نـاوی نێـر و مـێ لـە دیالێکتـەکانی زمـانی کوردیـدا، دەتـوانرێ بـە یـەکێك لـەو بەڵگـە زانسـتییانە دابنرێ، کە نیشانی یەکێتیی زمانی کوردی دەدەن"[٢١٥].

---

٢١٥ - ئەوەی لە بواری جنسدا یەکێتیی زمانی کوردی نیشان بدا، ئەوەیـە کـە نـەك هـەر نـاو، بەڵکو هەندێ بەشە ئاخاوتنی تریش یەك دەگرنەوە. بەنموونە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا، هەموو چاگەکان لە ڕیزی جنسی مێن و ئەگەر لەو ڕووەوە لـە بەشـە دیالێکتـەکانی موکریـان و سۆران... وردبببینەوە، دەبینین کە هەر وەك کرمـانجیی ژووروو تێکڕای چـاوگەکان لـە جنسـی مـێن. بێگومـان ئاخـاوتنی خـەڵکی ئـەو مەڵبەندانـە و کەرەسـتەی تۆمارکراویـان ئـەو ڕایـەمان دەسـەلمێنن. بـە وێنـە لـە سـەرپاکی کتێبـی ((تحفـەو مقفریـە))دا کۆتـاییی چـاوگەکان بـە(ێ)

٢- لە دۆخی بانگهێشتندا:

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە دۆخی بانگهێشتندا جیاوازی لە نێوان نێر و مێدا دەکرێ. ناو ئەگەر لە جنسی نێر بوو نیشانەی (ۆ)ی پێوە دەلکێ، بەڵام کە مێ بوو نیشانەی (ێ)ی دەچێتە سەر:

نموونە بۆ جنسی نێر:

**قیزکێ گۆت: ((بافۆ تشتەك نابە، برا ئەو من ببە، هەر تو کەلەك قەلەن ژێ بستینە)) (کوردۆ، ل ١٢٢)**

**مەمۆ دەنگەکی بان دکری، دگۆ: ((دلێ منی لیانە!))**

**(مەمی ئالان، ل ٥٠)**

نموونە بۆ جنسی مێ:

---

هاتووە، کە لە بەشە دیالێکتی موکریان و هەندێ بەشە دیالێکتی تری کرمانجیی خوارووو و دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا نیشانەی جنسی مێیە. وەك:

**((... دەستیان کرد بە خواردنێ))**

**(تحفەء مظفریة، ب١، ل ١٨٢)**

**((... بۆ خۆی ڕێییە گەڕانێ))**

**(ب١، ل ١٩٠)**

**((... دەستی کرد بە قەلات دروست کردنێ))**

**(ب١، ل ١٧٩)**

**((ئەگەر براهیم پاشا وا دەزانێ، دەست دەکا بە شین و گریانێ))**

**(ب١، ل٢٥٩)**

**((یایە زین! بە خولای، ئەمن دەست لە تۆ هەڵناگرم هەتتا ڕۆژی مردنێ))**

**(ب١، ل ٢٩٨)**

**((... دەستیان کرد بە هەڵکێشانێ))**

**(ب١، ل ٣٤٤)**

وی گۆت: ((دایکێ، هەسپێ من دەرخە))

(کـــوردۆ، ل

٩٧

**مـەمێ گـۆت: ((لێلـێ، زینـێ، ئـەز نـزانم کـو تـو ژ منـرە ڕاسـتی ئـان دەرەوینی؟))**

**(مەمی ئالان، ل ١١١)**

لێرەشدا هەروەك دیالێکتی خواروو، ئەگـەر بانگهێشـتن لـە حاڵـەتی کـۆدا بێ، ئەو دەمە بێ جیاوازی جنس، نیشانەی (نۆ/ینۆ)"[٢١٦]" بە ناوەوە دەلکێ، وەك:

**خوشکا بچووك گۆتە خوشکێد خوە: ((خوشکنۆ، شا بن، میرزە مەموود هاتی یە...))**

**(کوردۆ، ل ١٠٧)**

**حەسەن گۆت: ((برانۆ، نابە کو ئەم مێڤـانێ خـوە دەربـدەر بگـەڕێنن ل مالانە)).**

**(مەمێ ئالان، ل ٩٥)**

---

[٢١٦]- لە ئاخاوتن و کەرەستەی تۆمارکراوی دیالێکتی ژووروودا هـەردوو شـێوەی (نـۆ)و (ینـۆ) بەرچاو دەکەون. دەبێ (نۆ) کـورتکراوەی (ینـۆ)بێ... هەرچـی (ینـۆ)ی نیشـانەی بانگهێشـتنی کۆی دیالێکتی ژووروو و (ینە)ی نیشانەی بانگهێشتنی کۆی دیالێکتی خواروون، ئـەوا پێدەچـێ کە بناغەکەیان (ین)بێ و نیشانەی (ۆ)و (ە)ی بانگهێشتنی تاکی پێوە لکابێ.

## نیشانەکانی "ناسیاوی و نەناسیاوی"

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبە و سەرنج لەو شوێنانەی ڕابگرین کە دەربارەی نیشانەکانی ناسیاوی و نەناسیاوین"[218]"، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە ئەو باسانەی لە بارەی ئەم کێشەیەوە نووسراون هەڵە و ناتەواوی و کەم و کورییان تیدایە و بەلای زۆر لایەنی باسەکەدا نەچوون و تیشکی ڕووناکییان ئاڕاستەی گەلێك ڕووی نەکردووە و ئەنجامێکی سەرکەوتوویان وەدەست نەهێناوە.

وەك بۆمان ئاشکرابووە، نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی لەگەڵ پاشگری وشەداڕێژدا جیانەکراونەتەوە و ئەو ئەنجامە بەدەستەوە نەدراوە کە ئایا نیشانەی نەناسیاوی (ێ)یە یا (ێك)ە یا (ییك)ە یا (یەك)ە، وە نیشانەی ناسیاوی (کە)یە یا (یەکە)یە یا (ەکە)یە، یاخود (ە)ش نیشانەی ناسیاوییە یان نا. خۆ لە دیاریکردنی دەوریشیاندا شتێکی ئەوتۆ نەوتراوە و شتێکی شایان لەبارەی چۆنیەتی لکاندنیان و باری جۆراو جۆریان و گۆڕانیان دیار و دەستنیشان نەکراوە.

---

[217] - هەرچەندە لە عەرەبیدا (أداە) بەکارهێنراوە و لە کوردیدا بەرانبەری (ئامرا)یان بۆ داناوە، بەڵام ئەو ئامرازانە — واتە ئامرازی ناسیاوی و نەناسیاوی — لە ڕووی ڕێزمانەوە (نیشانە)ن. جالەبەر ئەو هۆیە بە نیشانە ناومان بردوون.

[218] - بڕوانە: فەصڵی یەکەمی ئەم کتێبە، ل ٢١ — ٣٢، ٢٨ — ٢٩، ٥١ — ٥٣، ٦٦ — ٦٧، ٧٢ — ٧٣، ٧٥، ٨١ — ٨٢، ٨٥، ٨٧ — ٨٨...

ئێمەش کە ئەو تەم و مژە بەسەر ئەو کێشەیەی زمانەکەمانەوە دەبینین، هەوڵ دەدەین لە تێکڕای ئەو ناڕاشکراییانە بدوێین کە لە سەرەوە پەنجەمان بۆ ڕاکێشان و، بە پێی توانست"[219]" لێیان بکۆڵینەوە و بتۆژینەوە.

## نیشانەی ناسیاوی"[220]"

نیشانەی ناسیاوی ئەو نیشانەیەیە کە بەدوای ناوەوە یا ئاوەڵناوەوە"[221]" دەلکێنرێ، بۆ ئەوەی بکرێ بەناسیاو.

لە زمانی کوردیدا (ەکە) و (ە) نیشانەی ناسیاوین.

نیشانەی (ەکە):

نیشانەی (ەکە) هەرچەندە بەدوای ناو ئاوەڵناوەوە دەلکێنرێ، بەڵام لەگەڵ ناودا چالاکترە، بەتایبەتی لەگەڵ ناوی گشتیدا. هەرچی لەگەڵ ناوی تایبەتیشدایە ناتوانێ خۆی بنوێنێ.

---

[219] - بۆیە وتوومانە بەپێی توانست، چونکە گومانمان لەوەدا نی یە، کە ئەم باسەی ئێمە کۆتایی بەوکێشەیە نەهێناوە.

[220] - لە زمانی فەڕەنسیدا نیشانەی ناسیاوی بەگوێرەی جنس دەگۆڕێ: لە حاڵەتی تاکدا بۆ جنسی نێر (Le) و بۆ جنسی مێ(La) بەکار دەهێنرێن، بەڵام لە حاڵەتی کۆدا، بۆ هەردوو جنس – واتە نێرو مێ – یەك نیشانە هەیە، کە ئەویش (Les)ە. وەك: ( La lune , Le soleil, Les planêtes). دەنگە بزوێنەکانی (Le) و (La)ی نیشانەی ناسیاوی حاڵەتی تاك، ئەگەر لەپێش وشەیەکەوە بێن کە بە دەنگی بزوێن یان دەنگی (h) دەست پێ بکات، ئەو دەمە تێدەچن.

(بڕوانە: ێ. ڤ. کۆستێتسکایا، ڤ. ئی. کارداشێڤسکی، ڕێزمانی عملی (تگبیقی، پراکتیکی) زمانی فەڕەنسی، چاپی حەوتەم، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ٢٤.

[221] - هەرچەندە نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی بە ئاوەڵناویشەوە دەلکێن، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنیا لە ڕووی پێوەندیانەوە لەگەڵ ناودا دەدوێین.

نیشانەی ناسیاوی (ەکە) کاتێك دەچێتە سەر وشە، دەتوانێ مانا و مەبەستی شتێك ئاشکرا بکا کە لە پێشدا ناوی هاتبێ، وەك ((ئازاد شیری دایە دەستم، منیش بە شیرەکە کەوتمە ناویان...)). یاخود دەتوانێ ناسراوی بەدیاربخا، بە وێنە کەدەوترێ ((پیاوهات))، ئەوە نازانرێ کێیە یا کێن، چونکە نەناسێنراوە، هەموو پیاوێك دەگرێتەوە، بەلام ئەگەر بوترێ ((پیاوەکە هات))، ئەوە بەدیاردەکەوێ و ناسراوە کێیە... یاخود لە فرێزی ((کچی جوان))دا، ئاشکرا نییە کێیە یان کێن، لە بەر ئەوەی نەناسێنراوە، هەموو کچێکی جوان دەگرێتەوە، بەلام کەوترا (کچە جوانەکە))، ئەو دەمە دەردەکەوێ و ناسراوە کێیە- واتە ئەو کچەیە کە مەبەستمانە و قسەی لێ دەکەین.

ئەم نیشانەیە (کە، ەکە...) نییە، وەك هەندێ لە نووسەران دایان ناوە، بەڵکو (ەکە)یە. چونکە لە باری ئاسایدا - واتە کاتێك بەدوای دەنگێکی کۆنسۆنانتدا دێ - بەباشی دەردەکەوێ، بەلام وەك زۆر دیاردەی تری زمانی کوردی، لە هەندێ حاڵەتدا بە شێوەیەکی دیکە دەبینرێ و ئەمە بووەتە هۆی نەناسینەوەی. جا بەم بۆنەیەوە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین کە:

١- ئەگەر ناوێك کۆتاییی بە دەنگی کۆنسۆنانت بێت، ئەوە (ەکە)ی بەڕەوانی پێوە دەلکێنرێ، بێ ئەوە هیچ زیادی و کەمییەك بێتە گۆڕێ، وەك:

**دڵ + ەکە = دڵەکە**

**خاڵی نی یە ((نالی)) <u>دڵەکەت</u> ساتێ لە هیجران**

**تا تاری وجوودت نەپسێنێ مەلە کول موت**

**(نالی، ل ١٥٤)**

**نان + ەکە = نانەکە**

**قۆڵی هەڵکردو نانەکەی هێنا**

**ڕووبەڕووی خۆی هەمانەکەی دانا**

**(زێوەر، ل ٧٩)**

**ژوور + ەکە = ژوورەکە**

**هەروا بە هەناسەی ساردەوە گەڕامەوە ژوورەکە و دانیشتم...**

**(لە خەوما، ل ٣٦)**

٢- ئەگەر ناوێك کۆتاییی بەبزوێنی (ا، ۆ، ێ)بێت، ئەوە یاخود (ە)ی سەرەتایی (ەکە) تێدەچێ، یاخود لە نێوان ناو و نیشانەکەدا (ی – y) نیمچە بزوێن پەیدا دەبێ، وەك:

**(ا)**

**هەوا + ەکە = هەواکە**

**هەواکەی شاهۆ ئاوەکەی قەندیل**

**لا ئەبا لە کورد ئێشی برینی**

**(زێوەر، ل ٣٥)**

**چرا + ەکە = چراکە**

**چراکە (چرایەك) کوژایەوە**

**(ۆ)**

**برۆ + ەکە = برۆکە/ برۆیەکە**

**برۆکە (برۆیەکە)کەوانییە**

**(ێ)**

**ترێ + ەکە = ترێ کە**

**سەیری ترێ کەی بە ژوور سەرتەوە**

**ئەو بەناز ترێ بکا بە دەمتەوە**

**(پیرەمێرد، ل ٢٧٩)**

**دێ + ەکە = دێ کە / دێ یەکە"[٢٢٢]"**

**دێ کە (دێ یەکە)ی ئێمە لە باکووری سلێمانییەوەیە.**

٣- ئەگەر ناوێك كۆتاییی بە بزوێنی (ی)بێت، ئەوە هەرچەندە بە زۆری لەنێوان ناو و نیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (ی — y) سەرهەڵدەدات، بەڵام حاڵەتی تێچوونی (ی)، یاخود بوونی بە (ێ)یش دەبینرێ، وەك:

**أ) سەرهەڵدانی نیمچە بزوێن:**

**شایی + ەکە = شاییيەکە**

**بوو بە شایی یەکەی بناویلە**

**(پەندی پێشینان، ل ٩٢)**

**ب) تێچوونی (ی):**

**بەڵێ ئەو شەخصە کە هات ڕووبەڕوو**

**لەسەر کانیەکەی خدری زیندە بوو**

**(پیرەمێرد، ل ٣٠٢)**

**ج) بوونی (ی) بە(ێ):**

---

[٢٢٢] - لە بەشە دیالێکتی موکریدا، ئەگەر ناوێك كۆتاییی بە بزوێنی (ێ) بێت، ئەو دەمە تەنیا حاڵەتی پەیدا بوونی نیمچە بزوێن دەبینرێ، بەڵام لە هەندێ شێوەی تردا تێچوونی نیمچە بزوێنیش بەرچاو دەکەوێ.

**وەك تانجیٚ کەی ئەحمەداغا لە وەختی ڕاوا گووی دیٚ.**

**(پەندی پێشینان، ل ٤٦٧)**

٤- ئەگەر ناوێك کۆتاییی بە بزوێنی (وو)بێت، ئەوە لە نێوان ناوەکە و نیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (و - W)دێتە کایەوە، هەروەها بزوێنی (وو)ی کۆتاییی وشەکە کەمێك لە باری ئاسایی کورتتر دەوترێت، وەك:

**ئارەزوو + ەکە = ئارەزووەکە**

**تاکو توانی لە نان و گۆشتی خوارد**

**ئارەزووەکەی چووە سەر ئاوی سارد**

**(زێوەر، ل ٧٩)**

**تەرازوو + ەکە = تەرازووەکە**

**تەرازووەکەی هەڵبڕی**

**دەستی کرد بە کێشانی**

**(بێکەس، ل ١٤٠)**

**جوانوو + ەکە = جوانووەکە**

**جوانووەکە دوو ساڵانە"**[٢٢٣]

٥- خۆ ئەگەر ناوێك کۆتاییی بە بزوێنی (ە) بێت، ئەوکاتە یەکێك لەو دوو بزوێنە - واتە (ە)ی کۆتاییی وشەکە، یاخود (ە)ی سەرەتای نیشانەکە - تێدەچیٚ و یەکێکیان دەمێنێتەوە، وەك:

**سەرچاوە + ەکە = سەرچاوەکە**

[٢٢٣]- لە وشەی کۆتایی هاتوو بە (وو)دا، هەروەها حاڵەتی کورت کردنەوە، یاخود ناوناوە بوونی (وو)بە (ۆ) دەبینریٚ، وەك کە دەوتریٚ: ((خانوەکە/ خانۆکە...)).

**سەرچاوەکەی عومری جوانیم هاتۆتەوە قوڵ،**

**باغچەی ژینم پڕبۆتەوە لە نەمامی گوڵ!...**

**(گۆران، ب، ل ٥٣)**

**شووشە + ەکە = شووشەکە**

**پەنجەرە + ەکە = پەنجەرەکە**

**شووشەکەی تێك شکاوە پەنجەرەکەم**

**تێکی دابا کتێب و دەفتەرەکەم**

**(زێوەر، ل ٧٢)**

وەك بۆمان دەرکەوت نیشانەی (ەکە) کە دەچێتە سەر ناوێك تاك نیشان دەدات، بەڵام دەشتوانێ لە حاڵەتی کۆدا خۆی بنوێنێ... لە حاڵەتی کۆدا (ان)ی نیشانەی کۆ بەدوای (ەکە)ی ناسیاوییەوە دەلکێنرێ. لەم ڕووداوەدا کە دوو بزوێن — واتە (ا) و (ە) — دەکەونە پاڵ یەك، ئەوە لە ئەنجامدا (ا)دەمێنێتەوە و (ە) تێدەچێ، وەك:

**شەهید + ەکە + ان = شەهیدەکان**

**هاتن شەهیدەکان بە جلی سووری خوێنەوە**

**دایکی وەتەن دەهەڵسە سلاویان بسێنەوە**

**(پیرەمێرد، ل ١٠٤)**

**(ا)**

**مەلا + ەکە + ان = مەلاکان**

**یەکێك هاتە ژوورەوە وتی : قوربان مەلاکان تەشریفیان هێناوە**

**(لەخەوما، ل ٥)**

(ۆ)

برۆ + ەکە + ان = برۆکان/ برۆیەکان

برۆکانی (برۆیەکانی) کەوانییە

(ێ)

فەقێ + ەکە + ان = فەقێکان

توخوا فەضایی دەشتی فەقێکان ئەمێستەکەش

مەحشەر میثالە یا بووەتە(چۆڵی سەلم و توور)؟

(نالی، ل ١٩٤)

(ی)

چەرچی + ەکە + ان = چەرچییەکان

نا بۆ کوردێك کفرە ئێستا کوردستان وتن

چەرچییەکانی ئیستیعمارم لێ ئەبنە دوژمن (گۆران، س، ل ٤٣)

(وو)

بەڕوو + ەکە + ان = بەڕووەکان

بەڕووەکان تاڵ بوون

(ە)

ئەستێرە + ەکە + ان = ئەستێرەکان

یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا

ئەستێرەکانی ڕابکشێن وەك شەهابی نوور

(نالی، ل ١٧٩)

**پشیلە + ەکە = پشیلەکان"[٢٢٤]"**

**پشیلەکان بێ بەشن**

**مانەوە مات و ڕووڕەش**

**(بێکەس، ل ١٤٠)**

... هتد.

ناو کە نیشانەی (ەکە)ی پێوە دەلکێنرێ، لە حاڵەتی (تاك)دا چ مانایەك دەبەخشێ و چ مەبەستێك دەگەیەنێ، لە حاڵەتی (کۆ)شدا هەر هەمان جۆرە. جیاوازیان تەنیا ئەوەیە کە لە حاڵەتی تاکدا مەبەست لە یەك کەس یاخود یەك شتە، بەڵام لە حاڵەتی کۆدا لە کەسێك یاخود شتێك پترە، بە وێنەی جیاوازی ئەم دوو ڕستەیە: ((کوڕەکەی وەستا عەلی کرێکارە))، ((کوڕەکانی وەستا عەلی کرێکارن)) تەنیا لە ژمارەدایە.

لە زمانی کوردیدا کە ئاوەڵناو بەدوا ناوێکدا دێت، (ی — î)ی نیشانەی ئێزافە دەخرێتە سەر ناوەکە، وەك:

**کچی جوان**

**کوڕی زیرەك**

**بەردی گەورە**

**لەولاوێکە لەولاوە بە ئەم لاوە کشاوە،**

**یا یاسەمەنی خاوە بەڕووی ڕۆژدا ڕژاوە؟!**

---

[٢٢٤] - چۆن کاتێ (ەکە)دەچێتە سەر ناوی کۆتایی هاتوو بە هەندێ بزوێن، تێچوونی بزوێن یاخود پەیدابوونی نیمچە بزوێن یاخود بوون بە بزوێنێکی دی دەبینرێ، هەروەها ئەگەر نیشانەی (ان)ی کۆش بەدوایدا بێت، ئەوە هەر هەمان دیاردە دەمێنێ. بەوێنە دەتوانرێ بوترێ: ((مەلاکان/ مەلایەکان، فەقێکان/ فەقێیەکان...)).

**(نالی، ل ٥٣٠)**

لەم جۆرە حاڵەتەدا:

١- ئەگەر نیشانەی ناسیاوی (ەکە) بە ناوەکەوە بلکێنرێ، ئەوە لە سەرێکەوە(ی)ی ئیزافەکە نامێنێ و لە سەرێکی کەوە(ە) یەک دەچێتە سەر ئاوەڵناوەکە، وەك:

**کچەکە جوانە**

**کوڕەکە زیرەکە**

**بەردەکە گەورەیە"[٢٢٥]"**

**ڕیشەکەی پان و درێژە، بۆ ڕیا خزمەت دەکا**

**ظاهیرە هەرکەس بە طوول و عەرضی ڕیشییدا ڕیا**

**(نالی، ل ١٢٨)**

٢- بەلاّم، ئەگەر بێتو نیشانەی ناسیاویی (ەکە)بە ئاوەڵناوەکەوە بلکێنرێ، ئەوە لە بریتیی(ی)ی ئیزافە (ە)یەك دەچێتە سەر ناوەکە، وەك:

**کچە جوانەکە**

**کوڕە زیرەکەکە**

**بەردە گەورەکە"[٢٢٦]"**

**بێ ئاوازەیە، دەنگە نەرمەکەی**

**بانەی دا لە گوێم، تێر نەڵێم ئۆخەی!**

**(گۆران، ب، ل ١٨)**

---

[٢٢٥] - لێرەدا لە نێوان دوو بزوێندا نیمچە بزوێنی (ی — y) پەیدابووە.

[٢٢٦] - لەم شوێنەدا لە کەوتنە پاڵ یەکتری دوو بزوێندا یەکێکیان تێ چووە.

دیارە مانا و مەبەستی حاڵەتی یەکەم لەگەڵ حاڵەتی دووەمدا جیاوازە و ئەمەش دەوری (ەکە) دەردەخات، کە چۆن دەتوانێ مەبەستی جۆراوجۆر بەدەستەوە بدات.

نیشانەی (ە)

(ە)ش هەروەك (ەکە) نیشانەی ناسیاوی یە"[٢٢٧]". بەلام لە واتا و بەکارهێناندا جیاوازیان هەیە.

نووسەرانی کورد، جگە لە ك. ر. ئەیووبی و سمیر نۆڤا و قەناتی کوردۆ و چەرکەزی بەکۆ... بەهیچ جۆرێك باسی نیشانەی ناسیاویی (ە)یان نەکردووە. نووسەرانی ناوبراویش هەرچەندە ناوی ئەو نیشانەیەیان هێناوە، بەلام بەهەڵە تێی گەیشتوون و ناوەرۆکی باسەکەیان شتێکی ترە، کە ناتوانرێ بە نیشانەی ناسیاوی دابنرێ.

نیشانەی (ە)ی ناسیاوی کاتێك دەچێتە سەر وشە، دەتوانێ مانا و مەبەستی شتێك ئاشکرا بکا کە لە پێشدا ناوی هاتبێ، وەك:

**پیاوێکی کورد چوو بۆ بەسرا**

**سبەینیان شیری ئەگێڕا**

**مەیموونی قەپتان پەیدابوو**

**ئەو کیسەی لیرەکەی تیابوو**

---

٢٢٧ - لە زمانی کوردیدا (ە) بە چەند جۆرێك خۆی دەنوێنێ. لەبەر ئەوە هەڵەیە، ئەگەر هەموویان بەیەك بدەینە قەڵەم، بەڵکو ڕاستتر وایە کە بە هاوبێژ (مشترك لفظی – Homonym)یان دابنێین. بە وێنە (ە)ی ناسیاوی، کە نیشانەیەکە ناو و ئاوەڵناوی پێ دەکرێتە ناسیاو، زۆر جیاوازە لەگەڵ پاشگری (ە)دا کە یاریدەی ڕۆنانی ناوی داڕێژراو دەدات، وەك: خراپ – خراپە، چاك – چاکە، بەند – بەندە، کردن – کردە، دیتن – دیدە... هتد.

**فــڕانــی و بــە دارا هەڵگــەڕا**

**کـــوردە ئــارامی لێ بـــڕا**

**(پیرەمێرد، ل ٤٢٤)**

لە دێڕی یەکەمی ئەم شیعرەدا، وشەی ((کورد)) ناوێکی نەناسراوە، بەڵام کاتێ لە دوا دێڕدا نیشانەی (ە)ی ناسیاویی پێوە لکێنرا، بوو بە ناسراو. بەم جۆرە نیشانەی ناوبراو، مانا و مەبەستی شتێکی ئاشکرا کردووە، کە زووتر ناوی هێنراوە.

(ە)ی ناسیاوی وەك (ەکە) بەدوای ناو و ئاوەڵناوەوە دەلکێنرێ. دوور نییە ئەم نیشانەیە کورتکراوەی (ەکە) بێت"[٢٢٨]"، هەروەك چۆن (ێ)ی نەناسیاوی کورت کراوەی (ێك)ە"[٢٢٩]". نیشانەی (ە) لەباری ئاساییدا بە ڕوونی دەردەکەوێت، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا بە شێوەیەکی دیکە خۆی دەنوێنێ، وەك لەو دەستوورەی خوارەوەدا بەدی دەکرێ:

١- ئەگەر ناوێك کۆتاییی بەدەنگی کۆنسۆنانت بێت، ئەوە(ە)ی بە ڕەوانی پێوە دەلکێنرێ، بێ ئەوەی هیچ زیادی و کەمیەك بێتە گۆڕێ، وەك:

**دڵ + ە = دڵە**

**دڵەی هەژار بۆت بۆتە بریانی**

**حەشرە، هەرایە لە سلێمانی**

**(بێکەس، ل ١١١)**

**مار + ە = مارە**

---

[٢٢٨] - ئەمە تەنیا ڕایەکی سەرپێییە، دەنا هیچ بەڵگەیەکی مێژووییمان بەدەستەوە نییە.

[٢٢٩] - پێ سەلماندی ئەم باوەڕە لە بەشی (نیشانەی نەناسیاوی)دا هاتووە.

**ئاگرێکی بۆ کردەوە**

**مارەی گەرم کردەوە**

**(بێکەس، ل ١٤٥)**

**باوك + ە = باوکە**

**باوکە هەرخەریکی کار و کاسبییە و...**

٢- ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (ا، ۆ، یٚ، ی، ە) بێت، ئەوکاتە (ە) وەرناگرێ. لەم حاڵەتەدا بە قەرینە تێدەگەین کە مەبەست باسێکراوێکی دیارییە، وەك:

**(ا) چرا + ە = چرا**

**چرا نەوتی تێدا نەما**

**کابرا + ە = کابرا**

**... کابرا گوتی: ((یا ڕەبی! ئەو پیاوە ئەگەر گوناباره ئەو شیرە سەری ببڕیٚ...)).**

**(تحفهء مظفریه، ب١، ل ١٩٤)**

**(ۆ)**

**هەڵۆ + ە = هەڵۆ**

**هەڵۆ دای لە شەقەی باڵ**

**(یٚ)**

**دیٚ + ە = دیٚ**

**دیٚ وێران بوو**

**(ی)**

**مراوی + ە = مراوی**

**... مراوی لە ترسان لەرزی...**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٩٤)**

**ڕێوی + ە = ڕێوی**

**ڕێوی... بانگی پەپوو سلەمانکەی کرد**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٩٤)**

**(ە)**

**پەپووسلەمانکە + ە = پەپووسلەمانکە**

**... پەپووسلەمانکە لە ترسان هاتە دەرێ**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٩٤)**

**پەنجەرە + ە = پەنجەرە**

**پەنجەرە کرایەوە و ڕەشەبا خۆی کرد بە ژووردا**

تێبینی: بەشێك لەو جۆرە وشانە هەندێ جار بە یاریدەی نبمچە بزوێنی (ی – ۷)، نیشانەی (ە) وەردەگرن، وەك:

**قەلا + ی + ە = قەلایە**

**دەرکی قەلایەی کردەوە...**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٨١)**

**ڕێوی + ی + ە = ڕێوییە**

**سەیەکان ڕەدووی کەوتن... هەتا گەیشتنە ڕێوییە**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٩٥)**

٣– ئەگەر ناوێك کۆتاییی بە بزوێنی (وو)بێت، ئەوسا لە نێوان وشە و نیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (و – W) دێتە کایەوە، هەروەها بزوێنی (وو)ی کۆتاییی وشەکە کەمێك کورتتر لەباری ئاسایی دەوترێت، وەك:

**جوو + و + ە = جووە**

**پشیلە بە سەگی گوت: ((ئەمە چوزانین، جووە چۆتە کویٚ...))**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٩٨)**

**... جووە زۆر هات و چۆی ماڵی پادشای دەکرد...**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٩٧)**

**توو + و + ە = تووە**

**ئازاد تووەی ڕاوشاند"**[٢٣٠]**"**

وەك لە سەرەوە ڕوونمان کردەوە، نیشانەی (ەکە)کە دەچێتە سەر وشەیەك تاك نیشان دەدات، بەڵام دەشتوانیٚ لە حاڵەتی کۆشدا خۆی بنوێنیٚ. هەرچی (ە)یە تەنیا لە حاڵەتی تاکدا بەدیاردەکەویٚ و کۆی نییە.

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا نیشانەی ناسیاویی (ەکە) بە هیچ چەشنێك نییە. هەرچی نیشانەی ناسیاوی (ە)یە، هەرچەندە هەندیٚ لە زانایان هەوڵی نیشاندانی بوونیان داوە، بەڵام بەداخەوە ئەم باسەیان لەسەر بناغەیەکی چەوت دامەزراندووە. بەوێنە د. قەناتی کوردۆ دەڵیٚ: کاتێك جێناوی نیشاندانی (ئەڤ، ئەو – بۆ تاك)، وە (ئەڤان، ئەوان – بۆ کۆ) لەپێش ناوەوە بەکاردێن، ئەوە ناوەکە نیشانەی ناسیاوی وەردەگریٚ.

ئەو نیشانەیەش (ا) یە بۆ تاك و (انا) – بۆ کۆ"[٢٣١].

---

[٢٣٠]- دەبینین کە حاڵەتی چۆنیەتیی لکاندنی (ەکە) و (ە) بە وشەوە، بەزۆری وێکدەچن.

وەك: ((ئەڤ ژنا))، ((ئەڤ ژنانا))" [٢٣٢]"..

هەروەها د. چەرکەزی بەکۆ هەر بەو جۆرە لەو باسە دواوە و بەو بۆنەیەوە نووسیوێتی: نیشانەی (ا)ی ناسیاوی بە یاریدەی جێ ناوی (ئەڤ، ئەو)، (ئەڤان، ئەوان) بەدەردەکەوێ"[٢٣٣]"...

هەرچەندە جێناوی نیشاندانی (ئەڤ، ئەو)، (ئەڤان، ئەوان) لە ناساندنی ناودا کاریگەرن و ئەمەش حاڵەتێکی تایبەتیی ناسیاوییە، بەڵام ڕاست نییە کۆتاییی ناو لەم حاڵەتەدا بە نیشانەی ناسیاوی دابنرێ. نیشانەی ناسیاوی ئەوەیە کە بێ یاریدە بەدەربکەوێ.

لەوە دەچێ لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا، وەك نیشانە، نیشانەی ناسیاوی نەبێت. هەر بەو چەشنە لە زمانی فارسیی ناوەڕاست"[٢٣٤]" و لە زمانە ئێرانییە نوێکاندا "[٢٣٥]" نیشانەی ناسیاوی بەدی ناکرێت"[٢٣٦]"، بەڵام بە

---

[٢٣١] - دانانی (انا) لە کرمانجیی ژووروودا و (ەکان) لە کرمانجیی خوارووودا بە نیشانەی ناسیاویی کۆ شتێکی بێ جێیە.

[٢٣٢] - (١٤٦) بڕوانە:

أ- قەناتی کوردۆ (کوردۆییێڤ)، دەستووری زمانی کوردی، لێنینگراد، ١٩٥٧، ل ٤٢.

ج- قەناتی کوردۆ (کوردۆییێڤ)، بەراوردکردنی ڕێزمانی کوردی (کرمانجیی ژووروو و خواروو)، ((کورتە نامەی دوکتۆرای علوم)) مۆسکۆ، ١٩٦٥، ل ١٣.

ج- قەناتی کوردۆ (کوردۆییێڤ)، زمانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٦١، ل ١٩ — ٢٠.

[٢٣٣] - بڕوانە:

چەرکەزی بەکۆ (باکاییێڤ)، بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان، مۆسکۆ، ١٩٦٢، ل ٤٦.

چەرکەزی بەکۆ (باکاییێڤ)، زمانی کوردەکانی ئازەربایجان، مۆسکۆ، ١٩٦٥، ل ٤٧.

ج- چەرکەزی بەکۆ (باکاییێڤ)، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ٦٨ — ٦٩.

[٢٣٤] - بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا، ل ٤٦.

[٢٣٥] - بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ئی. ئا. سمیر نۆڤا، ل ١٦ — ١٧.

پێچەوانەوە لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیدا، نیشانەی ناسیاوی ئاشکراو چالاك خۆی دەنوێنێ. بێگومان ئەمەش جێگەی سەرنج و لێکۆڵینەوە و گەڕان و بەدواکەوتنە. ئاشکراکردنی پەیدابوونی و لە کوێوە هاتنی و پێشکەوتنی کارێکی زانستیی گەورەیە.

## نیشانەی نەناسیاوی "[237]"

نیشانەی نەناسیاوی ئەو نیشانەیە کە بەدوای ناو یا ئاوەڵناوەوە دەلکێنرێ بۆ ئەوەی بکرێ بە نەناسیاو.

تایبەتێتیی نیشانەی نەناسیاویی زمانی کوردی لەوەدایە کە جگە لە نەناسراوی (مجهولية)، هەروەها تاکایەتی (افرادية)یش نیشان دەدا.

هەندێ کێشەی نیشانەی نەناسیاویی زمانی کوردی زۆر ئاڵۆزە، لەبەر ئەوە لێکۆڵینەوەی دوورو درێژو تەواوی دەوێ. ئێمە هەرچەندە لەم ڕووەوە

---

[236] - بەلام بۆ دەربڕینی مەبەستی ناسراوی ڕێگەی دیکە هەیە. بەوینە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدارێگەی هەرە گرنگی ناساندن بەهۆی جێ ناوی نیشاندانی (ان — ((ئەوە)))وەیە. (بڕوانە سەرچاوەی ناوبراو، ڤ. س. ڕاستۆر گویڤا، ل ٤٦).

[237] - لە زمانی فەرەنسیدا نیشانەی نەناسیاوی، هەروەك نیشانەی ناسیاوی بەگوێرەی جنس دەگۆڕێ: لە حاڵەتی تاکدا بۆ جنسی نێر(un) وە بۆ جنسی مێ(une) بەکاردەهێنرێن. بەلام لە حاڵەتی کۆدا بۆ هەردوو جنس — واتە نێرو مێ — یەك نیشانە هەیە، کە ئەویش(des)ە. نیشانەی نەناسیاوی لە ڕەسەندا لە ژمارەی (یەك)وە — (un) — بۆ نێر، (une) — بۆمێ — کەوتۆتەوە (بڕوانە:سەرچاوەی ناوبراو: یێ. ڤ. کۆستێتسکایا، ڤ. ئی. کارداشێڤسکی، ل ٢٥). نیشانەکانی ناسیاوی ونەناسیاوی لە زمانی کوردیدا لە کۆتاییی وشەوە دێن و پێ یەوە دەلکێن، بەلام لە زمانی فەرەنسیدا لە پێش وشەوە دێن و پێشیەوە نالکێن. ئەمەش تایبەتێتیزمانانی جیاواز دەردەخات. لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا(ێ/یڤ)نیشانەی نەناسیاوی یە، کە لە (ئایڤا aiva) — ((یەك))ی فارسیی کۆنەوە وەرگیراوە. لێرەدا سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین کە لە زۆر زماندا نیشانەی نەناسیاوی لە ژمارەی (یەك)ەوە پەیدا بووە.

نەگەیشتووینەتە ئەنجامێکی یەکجاری، بەڵام توانیومانە هێندێ کەرەستەی باش بخەینە پێش چاو و بیروڕامان لە بارەیانەوە نیشان بدەین.

لە ناوچەی سلێمانی و موکریان... دا (ێک)و (ێ) نیشانەی نەناسیاوین. هەرچی (ێ)یە گومانی لێ ناکرێ کە کورت کراوە و تەخفیفی (ێك)ە.

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و گەلێك ناوچەی سۆراندا (ەك)نیشانەی نەناسیاوییە.

لە هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا (ن — in)و شێوەکانی تری (ن — n، نە — ine، نە — ne) هەر بۆ نیشاندانی نەناسراوی بەکاردێنن"[٢٣٨]"، وەك:

**مەرڤن(marivin) هاتن گوند**

**(هەندێ پیاو هاتنە گوند)**

**من سێڤن (sêvin)خوارد"[٢٣٩]"**

**(من هەندێ سێوم خوارد)" [٢٤٠]"**

---

٢٣٨ - بڕوانە: قەناتی کوردۆ (کۆردۆیێڤ)، دەستووری زمانی کوردی، (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو)، مۆسکۆ، ١٩٧٨، ل ٤٤.

٢٣٩ - نیشانەی (ن — in) و شێوەکانی تەنیا لە حاڵەتی کۆدا دەبینرێ، لەبەرئەوە دەتوانرێ بە نیشانەی نەناسیاویی کۆ دابنرێ.

٢٤٠ - هەرچەندە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا نیشانەی نەناسیاویی (ن — in) نییە، بەڵام هەمان واتا و هەمان مەبەست کە نیشانەی ناوبراو لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەگەیەنێ، لە کرمانجیی خوارووا دەتوانرێ لە ڕێگەی وشەی ((هەندێك/ هەندێ))وە دەربڕدرێ، کە ئەویش بە ڕەسەن یەك دەگرنەوە.

هەرچی نیشانەی نەناسیاوی (ێك/ێ، ەك)ە لە ژمارەی (یەك)ەوە پەیدا بووە. نیشانەی نەناسیاویی (ن – in) و شێوەکانی تری لە جێ ناوی چەندێتی (هنە – هەندێك)ەوە کەوتونەتەوە.

ئنجا با تەماشای نیشانەی نەناسیاویی (ێك) بکەین لە شێوەی سلێمانی و موکریاندا:

١– ئەگەر ناوێك کۆتاییی بەدەنگی کۆنسۆنانت بێت، ئەوە (ێك)ی بەڕەوانی پێوە دەلکێنرێ، بێ ئەوەی هیچ زیادی و کەمییەك بب‌ێتە گۆڕێ، وەك:

**وڵات + ێك = وڵاتێك**

**ئەی مانگی بەرز ! سا هانایێ مل بنێ بۆ دوور!**

**بۆ وڵاتێك جێی نیزام بێ و سەربەست بێ و ڕوو سوور!**

**(گۆران، س، ل ٤٧)**

**ئاو + ێك = ئاوێك**

**ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی (سەرچنار)**

**ئاوێکە پڕ لە نارو چنار و گوڵ و چنوور**

**(نالی، ل ١٧٨)**

**سوارێك هاتووە ئەسپی شێ یە**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ٢١٢)**

**پیاوێکی ئاو فرۆش لە شاری غەزنەیدا ئاو فرۆشیی دەکرد**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٨٥)**

٢– ئەگەر ناوێك کۆتاییی بە هەر دەنگێکی بزوێن بێت، ئەوە:

أ) لە بەشی زۆری ناوچەی موکریاندا لـە نێـوان نـاو و نیشـانەکەدا نیمچـە بزوێنی (ی —) پەیدا دەبیٚ، وەك:

**(ا)**

**پادشا + ی + ێك**

**لە زەمەنی قەدیمدا پادشاییێك"[٢٤١]" بوو**

**(تحفهء مظفریه، ب١، ل ١٩٦)**

**(ێ)**

**دیٚ + ی + ێك = دیییێك**

**قەل ڕۆی چووە دیییێکی"[٢٤٢]"**

**(تحفهء مظفریه، ب١، ل ١٩٥)**

**(ی)**

**ڕێوی + ی + ێك = ڕێویییێك**

**دەگێڕنەوە ڕێوی ییێك"[٢٤٣]" شەوێکی چوو بۆ مریشك خواردنیٚ**

**(تحفهء مظفریه، ب١، ل ١٩٢)**

---

[٢٤١] - هەرچەندە لە کارەکەی مامۆستا هێمندا بەهەڵە ((پادشایەك)) نووسـراوە، بـەڵام ئەگـەر تەماشای ئەسڵی ئـەم کـارە – واتـە _ Oskar Mann, Die Mundart der Mukri Kurden, Teil I, Berlin , 1960 . بکەین، ئەوە دەبینین ڕاستەکەی ئەوەیە کە ئۆسکارمان نووسیوێتی ((پادشـاییێك)) (بڕوانـە: ل ٨). بەداخەوە ئەو جۆرە هەڵانە لە کارەکەی مامۆستا هێمندا زۆرە.

[٢٤٢] - مامۆستا هێمن ((دیٚ یەکی)) نووسیوە، بەڵام شێوەی ڕاست ئەوەیەکـە ئۆسـکارمان لـە لاپەڕە (٨)دا نووسیوێتی ((دیییێکی)).

[٢٤٣] - لـە کارەکـەی مامۆسـتا هێمنـدا ((ڕێوییێـك)) نووسـراوە، بـەڵام شـێوە ڕاسـتەکەی ((ڕێوییێك))ە، کە ئۆسکارمان لە لاپەڕە(٨)دا نووسیوێتی.

**(ە)**

**پیاڵە + ی + ێك = پیاڵەییێك**

**پیاڵەییێکی ژەهری وە ژەهرماری لە کۆڵانی ڕۆمی یان خەجڵی! "[٢٤٤]"**

**(تحفەء مظفریە، ب٢، ل ٢٧٦)**

**... هتد.**

لە بەشە دیالێکتی ناوبراودا هەندێ جار دیاردەی تێچوونی بزوێنی کۆتاییی ناوەکەش بەرچاو دەکەوێ، بەوێنە:

**(ێ)**

**جێ + ێك = جێك**

**... هەر جێکی"[٢٤٥]" ئەتۆ بڕۆی ئەمنیش دێم**

**(تحفەء مظفریە، ب٢، ل ٣٠٨)**

**(ە)**

**ئەنگوستیلە + ێك = ئەنگوستیلێك**

**پادشا...، ئەنگوستیلێکی بوو، هەرچی حوکمت لێ کردبا، جێ بەجێ پێکی دەهێنا.**

**(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٩٦)**

**... هتد.**

---

[٢٤٤] - وشەی ((پیاڵەییێکی)) و تێکرای ڕستەکەی سەرەوە، ئەو شێوە ڕاستەیەکە ئۆسکارمان لە لاپەڕە (٢٥٩)ی کتێبەکەیدا نووسیویێتی. کەچی لە کارەکەی مامۆستا هێمندا، نەك هەر ((پیاڵەییێکی)) کراوە بە ((پیاڵێکی))، بەڵکو لە بریتیی (وە)ش (و) نووسراوە.

[٢٤٥] - ئەوەی سەرەوە ئەو شێوە ڕاستەیە کە ئۆسکارمان لە لاپەڕە (٢٧٣)دا نووسیویێتی. کەچی لە کارەکەی مامۆستا هێمندا کراوە بە ((جێیەکی)).

بێگومان، ئەمە – واتە پەیدابوونی نیمچە بزوێن یاخود تێچوونی بزوێن – ڕەچاوکردنی دەستوورێکی ڕاست و ڕەوانی فۆنەتیکی زمانی کوردییە.

ب) لە بەشی زۆری ناوچەی سلێمانیدا (یەک) بەکاردێنن. هەرچەندە ئەمە لە دەستووری خۆی لای داوە، بەڵام لە سەرێکی ترەوە تەلەفوزی ئاسانترە، هەروەها لە شێوەی ناوچەی سۆران نزیک بووەتەوە، وەک:

**(ە)**

**دەریا + یێک = دەریایەک**

**هەرکەسیٚ طالیب بە دوڕڕی مەعریفەت کۆ کردنە**

**پڕ لە دوڕ دەریایەکی بیٚ مەهلەکەی خنکانە شەو**

**(مەحوی، ل ٢٦٠)**

**نیگا + یێک = نیگایەک**

**ئینشا + یێک = ئینشایەک**

**دەست و پەنجەو مە چەکێک و نیگایەک**

**چی بنووسم؟ خوایە هێزی ئینشایەک**

**(گۆران، ب، ل ٤٢)**

**(ۆ)**

**هەڵۆ + یێک = هەڵۆیەک**

**لەسەر بەردێک هەڵۆیەک هەڵفڕی کەوتە هەوا بیٚ غەم**

**بە بایەکی غرووری بایی بوو، تا کەوتە سەر عالەم**

**(پیرەمێرد، ل ٢٥٤)**

**(ی)**

**ڕێ + ێك = ڕێ یەك**

**لە ئەشك و ئاهما جۆش و خرۆشی حەولی تەئثیرە**

**دەزانن ڕێ یەکی دوورە لە پێش، ئەڵبەت دەکەن سەر ڕەو**

**(مەحوی، ل ٢٦١)**

**جێ + ێك = جێیەك**

**ئەچمە جێ یەك گۆشت بکرم، نەك دەردێ بکرم پێی بمرم.**

**(پەندی پێشینان، ل ٢٦)**

**(وو)**

**مێشوو + ێك = مێشوویەك**

**سێبەری سەر حەوز هەمووی بە مێوە**

**هەر مێشوویەکی توورەکەی پێوە**

**(پیرەمێرد، ل ٢٧٥)**

**ڕوو + ێك = ڕوویەك**

**هەرکەس حەقی خۆی پێ درایەوە**

**تۆ بەچ ڕوویەك دێیتە کایەوە؟**

**(بێکەس، ل ١٨)**

**(ی)**

**کانی + ێك = کانی یەك**

**کانی یەك ئاوت لێ خواردەوە، بەردی تێ فڕێ مەدە**

**(پەندی پێشینان، ل ٢٢٣)**

**بەندی + ێك = بەندی یەك**

**بۆ بەندی یەك کە زیندانی دڵی خەمباری**

**دوا دەلاقەی گیراوە لە ڕووڕووی بەهاری**

**(گۆران، س، ل ٤٨)**

**(٥)**

**پەپوولە + ێك = پەپوولەیەك**

**منیش چەشنی پەپوولەیەك گوڵ دای بێتە ناو**

**کێ زۆر شۆخ بێ لە بەرپێ یا ئەوەستم تاو تاو!**

**(گۆران، ب ٢، ل ٦١)**

... هتد.

دەبێ ئەوە لەیاد نەکەین، کە هەندێ جار لە ناوچەی موکریان ئەو شێوەیەی سلێمانی بەکاردەهێنن، بە پێچەوانەشەوە ناوە لە ناوچەی سلێمانی شێوەکەی موکریان بەکاردەهێنن. چەند نموونەیەك بۆ بەشە دیالێکتی موکری:

**کوتیان: ((چیبکەین بۆ فەقێ یەکی، بۆ مەولایەکی...**

**(تحفەء مظفریە، ب٢، ل ٩٢)**

**ماسی یەك وەدەرکەوت...** **(تحفەء مظفریە، ب١، ل ١٩٩)**

چەند نموونەیەك بۆ بەشە دیالێکتی سلێمانی:

**نالی ئاسوودە نییە طووڵی نەمامی عومرت**

**بە نەفەس دێت و دەچێت، ئەصڵی لەسەر بایێکە**

**(نالی، ل ٤٦٣)**

**تۆبەییێکم کردووە، وەك کێوی ئاسن مەحکەمە**

**تالە دنیا بمێنم عەشقی چاومەستانی خۆم**

**(زێوەر، ل ٣٢)**

وەك وتمان لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و گەلێك ناوچەی سۆراندا (ەك) نیشانەی نەناسیاوییە. بزانین چۆن خۆی دەنوێنێ:

١- ئەگەر ناوێك کۆتایی بە دەنگی کۆنسۆنانت بێت، ئەوە (ەك)ی بە ڕەوانی پێوە دەلکێنرێ، بێ ئەوەی هیچ زیادی و کەمییەك ببێتە گۆڕێ، وەك:

چەند نموونەیەك بۆ دیالێکتی کرمانجیی ژووروو:

**خەبەر + ەك = خەبەرەك**

**وێ ساحیرەیێ ژ بۆ نیشانە**

**دیسان خەبەرەك کرە بەهانە**

**(خانی، ل ١٥٢)**

**ڕەمز + ەك = ڕەمزەك**

**ڕەمزەك غەریب و فاطری**

**پەیدابێت نیڤ خاطری**

**(جزیری، ل ٤٤)**

چەند نموونەیەك بۆ بەشە دیالێکتی سۆران:

**ئەمیر + ەك = ئەمیرەك**

**وەزیر + ەك = وەزیرەك**

**لە (قۆچ پاشا)وە تا ئێستا ئەمیرەك**

**لە (كۆی) پەیدا نەبوو یاخود وەزیرەك**

**(كۆیی، ل ٥٥)**

**كیژ + ەك = كیژەك**

**كیژەك هەیە لەو گەڕەكە**

**كراسی سوور لەبەر دەكا**

**(فۆلكلۆر، ل ٧٤)**

٢- ئەگەر ناوێك كۆتاییی بە دەنگی بزوێن بێت ئەوە:

أ) بەزۆری لە دیالێكتی كرمانجیی ژووروودا (ە)ی (ەك) تێدەچێ، ناوە ناوەش نیمچە بزوێنی (ی – y) دێتەكایەوە. وەك:

**(ا)**

**ئاغا + ەك = ئاغاك**

**باڤێ وێ ئاغا، ئاغاكی خوین خوار**

**دەستی وی درێژ گەلەك ستەمكار**

**(جگر خوێن، ل ١٤٢)**

**(ی)**

**خانی + ەك = خانیك**

**خانیكی مەزن پان و بلّندە**

**مانەندی سەرایە**

**(جگەر خوێن، ل ١٣١)**

**(ە)**

**لەحزە + ی + ەك = لە حزەیەك**

**گەر لەحزەیەکی نەکی تو گوفتار**

**گەر ساتەکی نەبی تو خەمخوار**

**(خانی، ل ١٦٨)**

**... هتد.**

ب) لە ناوچەی سۆراندا لە نێوان ناوو نیشانەکەدا نیمچە بزوێن پەیدا دەبێ. ئەگەر بزوێنەکە (ا، ۆ، یێ، ی) بێت، ئەوە نیمچە بزوێنی (ی — Y) دێتە ناوانەوە، خۆ ئەگەر بزوێنەکە (وو)بێت، ئەوسا نیمچە بزوێنی (و — W) سەرهەڵدەدات و بزوێنی (وو)ش کورتتر بەدەمدا دێ. یاخود ئەگەر ناوێك کۆتاییی بە بزوێنی (ە) هاتبێ، ئەو کاتە بزوێنێك تێدەچێ. وەك:

نموونە بۆ پەیدابوونی نیمچە بزوێنی (ی — Y):

**شایی + ی + ەك = شایی یەك**

**مارەك لە سۆران یەك لە بادینان**

**شایی یەك دەگەڕا لە هەرسێ دینان**

**(فۆلکلۆر، ل ٣٨)**

**کیسە + ی + ەك = کیسەیەك**

**لە ئێوە کامتان بوو یەك دوو بارەك**

**بکاتە کیسەیەك یاخود خەرارەك**

**(کۆیمی، ل ٧٣)**

نموونە بۆ پەیدا بوونی نیمچە بزوێنی (و — W) :

**کەندوو – و + ەك = کەندووەك**

**ئەو مام وسووە مامی منە**

**دەمەکمان کرد (منە من)ە**

**کەندووەکمان کرد سەراوبنە**

**(فۆلکلۆر، ل ٤١)**

... هتد.

لەم بەشە دیالێکتەدا، هەموو ئەو حاڵەتانە تەواو بەپێی تایبەتێتیی زمانی کوردی ڕۆیشتوون و دەستوورێکی ڕێك و پێکیان ڕەچاو کردووە.

تاکو ئێرە، ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە، کە لە زمانی کوردیدا (ێك) – لە ناوچەی سلێمانی و موکریان، وە (ەك) – لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و گەلێك ناوچەی سۆراندا، وەك نیشانەی نەناسیاوی دەورێکی چالاك دەبینن. بەڵام لە هەندێ جار لە دەستوور لادەدەن، بەتایبەتی لە هەندێ شوێنی ناوچەی سلێمانیدا. جا ئایا ئەمە تەخفیفە یاخود چوونەوە سەر شێوەیەکی ترە، یاخود هەر هۆیەکی دیکەیە، جێی لێکۆڵینەوەیە.

ئەوەی سەرنج ڕابکێشێ، ئەوەیە کە لە شێوەی سلێمانیدا، کاتێك نیشانەی (ێك) دەکرێ بە (ێ)، ئەوە بە ڕەوانی لەسەر دەستوورێکی ڕێك و پێك دەڕوا و ئەو لادانە نامێنێ کە لە بەکارهێنانی (ێك)دا دەبینرێ، وەك:

**دیوار – دیوارێ – دیوارێك**

**گا – گایێ – گایەك**

**هەڵۆ – هەڵۆیێ – هەڵۆیەك**

**موو – موویێ – موویەك**

**ڕێ – ڕێیێ – ڕێیەك**

**مراوی – مراوییێ – مراوییەك**

**پەنجەرە – پەنجەرەیێ – پەنجەرەیەك**

چەند نموونەیەك:

**شێخێ هەمەوەندێکی دەدا پەند و نەصیحەت**

**ئەو قوڕبەسەرەی دابووە بەر فەحش و فەضیحەت**

**(مەحوی، ل ٣٣٥)**

**ئەچمە شارێ کەس نەمناسێ، خۆم هەڵئەکێشم پڕ بە کراسێ.**

**(پەندی پێشینان، ل ٢٦)**

**پێ پەتی هات و هەڕای کرد بەبێ کەوش و کڵاش**

**تازەشاگردە یەکێ جوولەکەیێ گوێچکە کەرێ**

**(زێوەر، ل ٨٤)**

لە مەدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە لە حاڵەتی بەکارهێنانی (ێك)دا دەستوورەکە شێواوە، کەچی لە حاڵەتی بەکارهێنانی (ێ)دا ڕێك و پێکە. بێگومان، ئەمەش جێگەی پرسیار و بەشوێندا گەڕان و لێکۆڵینەوەیە...

لە باسی (ەکە)دا ئەوەمان نیشان دا، کە ئەگەر وشەیەك (ەکە)ی پێوە بلکێنرێ، چۆن لە حاڵەتی تاکدا، هەر بەو چەشنەش بە یاریدەی (ان)ی کۆ لە حاڵەتی کۆدا خۆی دەنوێنێ. هەرچی نیشانەی نەناسیاوییە، هەندێ لە زماننناسان وایان داناوە کە بە هیچ جۆرێك نیشانەی (ان)ی کۆ وەرناگرێ."[٢٤٦]، بەڵام چوونە ناو زمانی کوردییەوە، ئەوە ئاشکرا دەکات کە نیشانەی نەناسیاوی لە گەلێك حاڵەتدا دەتوانێ لەگەڵ (ان)ی کۆدا خۆی بنوێنێ، وەك:

**کەس + ان + ێك = کەسانێك**

---

[٢٤٦]- بە وێنە بڕوانە: ك. ڕ. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٣.

**بێگومان کەسانێك بوون کە دژی ئەو کارە ناپەسەندە وەستابن.**

**ڕۆژ + ان + ێك = ڕۆژانێك**

**ڕۆژانێك خەڵك لە ئەشکەوتدا دەژیان...**

**کەس + ان + یٚ = کەسانیٚ**

**زەمانە بەعضە کەسانیٚ لەپڕ کە هەڵدەبڕیٚ**

**ئەوەندەی هەڵدەبڕێتن هەتا لە کەل دەبڕیٚ**

**(مەحوی، ل ٣٥٧)**

ئەوەی لە خۆنواندنی (ان)ی کۆ لەگەڵ (ەکە)و (ێك)دا جێگەی سەرنج ڕاکێشان بیٚ، ئەوەیە:

١- کاتێك (ان)ی کۆ لەگەڵ (ەکە)دا دێت، ئەوە (ان) دەکەوێتە دوای (ەکە)، وەك: ژنەکان، پیاوەکان، کوڕەکان...

٢- کاتێك (ان)ی کۆ لەگەڵ (ێك)دا دێت، ئەوە (ان) دەکەوێتە پێش (ێك)، وەك: کەسانێك، ڕۆژانێك، لاوانێك...

هەروەها نیشانەی نەناسیاوی بە هاریکاریی ژمارە و وشەی (چەند، کۆمەڵ، هەموو...)"[٢٤٧]" دەتوانریٚ وای لیٚ بکریٚ، کە مانای کۆ بگەیەنیٚ، بەلاَم لێرەدا تا ڕادەیەك لە مانای نەناسیاوی دووردەکەوێتەوە و پتر ژمارە دەگەیەنیٚ، وەك: (بڕوانە: ئەو نموونانەی لە لاپەڕە ١٥٦ — ١٥٧دا بۆ هەمان مەبەست هێنراونەتەوە).

هەروەها سەرنج بۆ تایبەتێییەکی دیکەی باسی نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی ڕادەکێشین، کە ئەویش ئەوەیە:

---

[٢٤٧] - ك. ڕ. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا تەنیا ناوی ژمارە و وشەی (چەند)یان هێناوە. هەروەها لەوەش نەدواون، کەچی گۆڕانێك ڕوودەدات (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٣).

کاتێك ناو و ئاوەڵناو پێکەوە دەگوترێن، نیشانەی نەناسیاوی بە زۆری بە ناوەکەوە دەلکێ، نەك بە ئاوەڵناوەکەوە، وەك: ((ئازاد لەسەر دیوارێکی بەرز دانیشتبوو))... کەچی نیشانەی ناسیاوی بە پێچەوانەوە پتر بە ئاوەڵناوەکەوە دەلکێ، وەك: ((ئازاد لەسەر دیوارە بەرزەکە دانیشتبوو))... ئەمەش یەکێکە لە ڕووە تایبەتییەکانی زمانی کوردی"[٢٤٨]"، بەلام ئەگەر ئاوەڵناو بە تەنیا وترا، ئەوە نیشانەی نەناسیاوی بە ناچاری پێوەی دەلکێ، وەك: ((جوانێکم لە نێو جوانان‌دا دەست نیشان کرد))، ((لە پڕ دلێرێك لە دوژمن ڕاپەڕی))... هیوام وایە خوێنەروای بۆ نەچێ کەوا وشەی ((جوانێك، دلێرێك)) وەك ناوی ڕووت بەکارهێنراون، بەڵکو هەر ئاوەڵناون. تەنیا ئەوەندە هەیە ناوەکانیان لەگەڵدا نەوتراوە و ئەمەش لە کوردیدا باوە... هەروەها پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشین کە نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی بچنە سەر ناو یاخود ئاوەڵناو، مەبەست هەر ناساندن و نەناسیاویکردنی ناوەکەیە. ئەگەر لە ڕستەیەکدا ناوەکەش نەبێ، ئەوە ئاوەڵناوەکە مانای ناوەکە دەگەیەنێ.

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا لە باسی نیشانەی نەناسیاویدا، هەندێ تایبەتێتی بەرچاو دەکەوێ:

دەزانین کاتێك بەدوا ناوی جنسی مێدا، ناو یان ئاوەڵناو یان جێناو بێت، ئەوە نیشانەی (ا) بە ناوەکەوە – واتە دیارخراوەکەوە – دەلکێ، بەلام ئەگەر ناوەکە نیشانەی نەناسیاوی پێوە بێ، ئەو دەمە نیشانەی (ە) لە شوێنی نیشانەی (ا) دادەنرێ، وەك:

---

[٢٤٨] - لەهەندێ حاڵەتی کەمدا نیشانەی نەناسیاوی دەچێتەسەر ئاوەڵناوەکە، وەك: ((مام هۆمەر لەسەر بەرە شڕێك پاڵ کەوتبوو))... وە (ەکە)ی ناسیاویش جارجارە بەناوەکەوە دەلکێ، وەك: ((پیاوەکە ئازایەو کەس پێی ناوێرێ))...

**حەیا شەش مەهان کەتە خزنەکە گەلەك مەزن و گرانە**

**(مەمێ ئالان، ل ٥٦)**

**قیزەکە کورد مەکتەبەکە بلندا دخوونە**

لە هەمان حاڵەتدا، بێتو ناوەکە — واتە دیارخراوەکە — لە جنسی نێر بێ، ئەوکاتە لەبریتیی نیشانەی (ێ)، نیشانەی (ی) دادەنرێ، "[٢٤٩]" وەك:

**ژ تە ڕەهێشت شوورەکی تووژو تازی**

**(صبری، ل ٦٠)**

**سوارەکی چەلەنگە ئەو سەردار**

**سەرێ لاغەر بەردیە بێ هەفسار**

**(جگر خوێن، ل ١٣٩)**

لەم چەشنە ڕستانەدا، ئەگەر ناوە نەناسراوەکە بە دوادا بێت — واتە کاتێ دیارخەربێ — ئەوە شێوەی کۆتایی بەگوێرەی ئەو یاسایانەی خوارەوە دەبینرێ:

١— ئەگەر ناوە نەناسراوەکە جنسی مێ بێ، ئەوە هەمیشە نیشانەی (ێ) وەردەگرێ، وەك:

**مالا ژنەکێ**

**خەباتا مالەکێ**

٢— ئەگەر ناوە نەناسراوەکە جنسی نێر بێ، ئەوە شێوەی کۆتاییی نیشانەی (ی) دەبێت، وەك:

**عەلی مەمەد چوو مالا جینانەرەکی...**

**(کوردۆ، ل ٤٥)**

---

٢٤٩- لە باسی نیشانەکانی ئیزافەدا بە دوور ودرێژی لەو تایبەتییانە دواوین.

**مێرگا <u>گوندەکی</u>**

**دلێ <u>خۆرتەکی</u>**

تێبینی: بێتو ئەو ناوانەی جنسی نێر، نیشانەی نەناسیاویان پێوە نەبێ، ئەو دەمە بەچەند جۆرێکی جیاواز خۆیان دەنوێنن، وەك:

أ) جۆرێکیان ناگۆڕێن و وەك خۆیان دەمێننەوە، وەك:

**ئەوی هنگی گلی و دەنگێ ئەحمەدێ <u>پالە</u> بهیستن...**

**(کوردۆ، ل ١٨٠)**

**مێرگا <u>گوند</u>**

**دلێ <u>خورت</u>**

ب) هەندێکیان گۆڕان بەسەر دەنگی بزوێنیاندا دێت"[٢٥٠]، وەك:

**دارێ خێنی (خانی)**

**هەقێ شڤێن (شوان)**

[٢٥٠] - مامۆستا قەناتی کوردۆ لە لاپەڕە (٥٤ — ٥٧)ی کتێبی (زمانێ کوردی، چاپی دووەم، یەریڤان ١٩٦٠)دا، باسی هەندێ لەو تایبەتییانەی کردووە.

# نیشانەکانی ئیزافە

لە گەشتی ئەو باسانەی دەربارەی ئیزافە لـە زمـانی کوردیـدا نووسـراون، ئەوەمان بۆ ئاشکرا بوو کـە کـەم و کـورتیی ئـەو زانایانـەی لەسـەر بنچینەی زمانی عەرەبی نووسینەکانیان داڕشتووە لەوەدایە کە زۆربـەیان تـەنیا باسـی نیشانەی (ی)یان کردووە و بەلای نیشانەکانی تردا نەچوون، سـەرەڕای ئـەوە نیشانەی ئیزافەیان بە پیت یاخود بە ئامراز داوەتە قەڵەم. ئەمانە و هـەروەها لە هەر شوێنێك بەشێکی جیاوازیان داناوە و بەو پێیەش ناوی بۆ دانراوە. بە وێنە لە حاڵەتی (مظاف و مظاف الیـە)دا بە (ی)ی ئیزافەیان دانـاوە، بـەلام لـە حاڵەتی (صفە و موصوف)دا بە (ی)ی وەصفی یان ناوبردووە"[٢٥١]" وەك گـەڕان و لێکۆڵینەوە دەری دەخا لە دیالێکتی کرمـانجیی خـواروودا (یَ، ە...) و لـە کرمانجیی ژووروودا (ا، ە، یَ، ێد/ێت، ێن...) نیشانەی ئیزافەن... دانانی ئەو نیشانانە بە پیت یاخود ئامراز یاخود هـەر شـتێکی تـر هەڵەیـە، چـونکە وەك ئاشکرایە مانای ڕێزمانی دەگەیەنن"[٢٥٢]". لە ڕووی دەوریشیانەوە لـە ڕسـتەدا، کە بە یەکەوە بەستنی دیارخـەر (adjunct, attribute (attributive adherent)و

---

[٢٥١]- ا) تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جزمـی یەکـەم، بەغـدا، ١٩٢٩، ل ١٨، ٢٠ — ٢١ ، یاخود (ل ٢٤)ی ئەم کتێبە.

ب) نووری عەلی ئەمین، قواعیدی زمانی کوردی لـە (صـەرف و نـەحو)دا بـەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٥٨، ل ٣٥ — ٣٧، ٩٤ — ٩٥، یاخود (ل ٣٠) ئەم کتێبە.

ج) نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ل ٢٠٠، یاخود (ل ٣٠) ئەم کتێبە.

[٢٥٢]- بۆ ناسین و جیاکردنەوەی نیشانە، بڕوانە: د. ئەورحمانی حـاجی مـارف، وشـەڕۆنان لـە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٣٦ — ٤٠.

دیارخراو (dependent memberdeterminatum)ە "[٢٥٣]" لەگەڵ نیشاندانی پێوەندی نێوانیان. لەبەر ئەوەی ئەوانە چ لە حاڵەتی (صفه و موصوف)و چ لە حاڵەتی (مضاف و مضاف الیه)دا هەرهەمان نیشانەن، پێویست ناکا بە نیشانەی جیاواز بدرێنە قەڵەم.

هەرچەندە کوردناسانی سۆڤیەت و ڕۆژئاوا لەسەر بناغەی دیارخەر و دیارخراو بۆ ئەو نیشانانە چوون و هەندێکیان ئەنجامی باشیان وەدەست هێناوە"[٢٥٤]"، بەڵام هەستیان بە گەلێك کێشەی گرنگی ئەو باسە نەکردووە. لێکۆڵینەوەی هەرە نوێ کە دەربارەی نیشانەکانی ئیزافە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووەدا کرابێ نامەی دوکتۆریەکەی د. کوردستانی موکریانییە"[٢٥٥]".

---

[٢٥٣] - لە عەرەبیدا دوو زاراوەی وا نین کە بە تەواوی بەرانبەر بە دیارخەر و دیارخراوی کوردی بووەستن. تەنیا ئەوە هەیە کە لە حاڵەتی ئیزافەدا هەموو (صفه) و (مضاف الیه)یەك دیارخەرن، هەرچی (موصوف) و (مضاف)یش دیارخراون. لە زمانی کوردیدا بەشە ئاخاوتنی (ناو، جێ ناو، ئاوەڵناو...) دەتوانن ببنە دیارخەر، وە(ناو، جێ ناو، چاوگ...)یش بۆیان هەیە دیارخراوبن.

[٢٥٤] - بەوێنە بڕوانە:

أ- قەناتی کوردۆ (کوردۆیێڤ)، دەستووری زمانی کوردی، مۆسکۆ – لینینگراد، ١٩٥٧، ل ٨٩ – ١٠٣، یاخود (ل ٨٣)ی ئەم کتێبە.

ب-چەرکەزی بەکۆ (باکاییێڤ)، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ٩٤ – ١١٥، یاخود (ل ٨٦)ی ئەم کتێبە... و هەندێکی تر.

[٢٥٥] - کوردستان عەبدولڕەحمان لەتیف، دیارخەرو شێوەکانی دەربڕینی پێوەندی یە دیارخەری یەکان لە زمانی کوردیدا – دیالێکتی سۆرانی (کورتەی نامەی دوکتۆری)، مۆسکۆ، ١٩٧٦.

هەرچەندە نووسەری ناوبراو تیشکی ڕووناکی بەسەر هەندێ ڕووی ئەو باسەدا پرژاندووە و هەندێ زانیاری نوێی خستۆتە پێش چاو، بەڵام لەو کارەشدا هەندێ کەم و کورتی و ناتەواوی و هەڵە دەبینرێن."[٢٥٦]" بەداخەوە

---

[٢٥٦] - بەرئەوەی کەمێك لە لێکۆڵینەوەکەی د. کوردستانی موکریانی بدوێین، دوو خاڵ ڕوون دەکەینەوە.

یەك – ئەو سەرنج و تێبینییانەی دەریان دەبڕین دەرهەق بە کورتەی نامەکەیە، چونکە تەنیا کورتەی باسی ناوبراو لە پێش دەستماندایە.

دوو – د. کوردستانی موکریانی لە نامەکەیدا لە ڕووی مۆرفۆلۆژی و سینتاکسەوە لە نیشانەکانی ئیزافە دواوە، بەڵام ئێمە لەبەر پێویستیی باسەکەی خۆمان ئەو لایەنانە دەگرین کە لەبارەی مۆرفۆلۆژییەوە پێوەندیان پێوە هەیە (ناوناوەیەك نەبێ کە هەندێ مەبەست بۆ بەشی سینتاکسمان ڕادەکێشن). هەر لەبەر هەمان هۆ خۆمان لەو باسانەی دیکەش ناگەیەنین کە لە نامەی ناوبراودا سەبارەت بەکێشەی جۆراو جۆر کراون.

بەو پێیە ئێستا لە بەشی دووەمی نامەکە، کە بەناوی ((شێوەکانی دەربڕینی پێوەندییە دیارخەرییەکان لە ڕێگەی فۆڕمەکانی ئیزافەوە))یە دەدوێین:

نووسەر کاتێك هاتۆتە سەر باسی نیشانەکانی ئیزافە دەڵێت: ((ئیزافە لە سۆراندا (ڕاستتر کرمانجیی خوارووداــ ئەوڕەحمان) دوو فۆڕمی هەیە: فۆڕمی یەکەمی ئیزافەی (ی) و فۆڕمی دووەمی ئیزافەی (ە))) (ل٧).

وەك ئاشکرایە، هەندێ لە کوردناسان، بەتایبەتی (کەریمی ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا، جەمال جەلال و ئەرنست مەکارۆس...) ئەوەیان دەست نیشان کردووە کە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداـ (ی)و (ە) نیشانەی ئیزافەن و هەندێ لایەنی ئەو باسەیان ڕوونکردۆتەوە. هەرچەندە د. کوردستان فراوانتر لەو نیشانانە دواوە، بەڵام دەبوو ئەو ڕاستییە بخاتە ڕوو کە زانایانی ناوبراو پتر لە دەساڵ لەمەوبەر هەستیان بەوە کردووە و لێی دواون.

لە هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداـ جگە لە (ی) و (ە)، هەروەها نیشانە و حاڵەتی دیکەی ئیزافە دەبینرێن، کە نووسەر ناوی نەبردوون و باسی نەکردوون. بەوێنە:

لە هەندێ ناوچەی سۆراندا نیشانەی (ێ)ش ئیزافە سازدەکا، وەك:

**بایێ شەمار ناکا گێرە**

**لەسەر سینگی ئەنووم تێرە**

**چەند گوناحە سێ هەند خێرە**

**(فۆلکلۆر، ل ٣١)**

جێگەی سەرسوڕمانە کە د. کوردستان هەستی بەو تایبەتێتیە ئاشکرایەی مەڵبەندەکەی خۆی نەکردووە.

مەسەلەی باس نەکردنی هەندێ حاڵەتی ئیزافە پێویستی بە ئاوڕدانەوەیەك لە بەشی سێیەمی نامەکەیە. هەرچەندە نووسەر لەم بەشەدا باسی چوار جۆر حاڵەتی ئیزافەی کردووە کە بێ نیشانە پێك دێن، بەلام جگە لەوەی کە هەندێکیان حاڵەتی ئیزافە نین و بە هەڵە تێیان گەیشتووە، کەچی هەندێ حاڵەتی ئاشکراو دیار هەن نووسەر هەستی پێیان نەکردووە، بە وێنە وەك:

لە زمانی کوردیدا ناو ناوە بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەك هاریکاری بکا، دیارخەر بەدوا دیارخراوێکدا دێ کە ناوبێ و حاڵەتی ئیزافە ساز دەبێ (بڕوانە باسی : ((ئیزافەی بێ نیشانە)) کە لە لاپەڕە (٢٤٠)ی ئەم کتێبەدا لێی دواوین).

لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا بێ ئەوەی نیشانەیەك لە ناواندا هەبێ، دیارخەر بەدوای دیارخراودا دێت، وەك کە دەوترێ (پیاو ئاغا) و ناوترێ (پیاوی ئاغا)، دەڵێن (کوڕتۆ) و ناڵێن (کوڕی تۆ)، (بەرخ نێر) دەبیسترێ و (بەرخی نێر) نابیسترێ.

دوابەدوای ناوبردنی نیشانەکانی ئیزافە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا، نووسیوێتی : ((لە کرمانجیدا (ڕاستتر لە کرمانجیی ژووروودا — ئەوڕەحمان) فۆرمەکانی ئیزافە پترن: (أ، ێ، ە، ی، ێت، ێن))) لێرەدا نووسەر نیشانەی (ێد)ی لەبیرکردووە، بەلام دواتر کە کەوتۆتە باسی چۆنیەتیی خۆنواندن و دەوریان لێی دواوە. لە هیچ شوێنێکدا ناوی ئەو نیشانانەشی نەهێناوە کە لە هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەبینرێن، وەك: (أ،ێدە، نە، ەنە، یدە...) (بڕوانە: چەرکەزی بەکۆ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ٩٤ — ١١٥).

بێگومان ئەو نیشانانەی ئیزافەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو پتر لە بیست ساڵ دەبێ بە دوورو درێژی و بەشێوەیەکی زانستی مامۆستا قەناتی کوردۆ لێ یان دواوە. دواتریش مامۆستا چەرکەزی بەکۆ بەزانیاری نوێ فراوانی کردوە، بەلام د. کوردستان لەم بەشەی باسەکەیدا نەك هیچ بەرهەمێکی نوێی نەخستۆتە سەر ئەو خەرمانە، بەڵکو بە شێوەیەکی ساکار لەو باسە دواوە و تووشی هەندێ هەڵەش بووە... سەرەڕای ئەوە ناوی ئەو زانایانەی نەبردووە کەلەو مەیدانەدا شاسوار بوون و پەردەی بەسەر ڕاستیدا داوە.

نووسەر لەلاپەڕە (٨)دا کەوتۆتە لێکۆڵینەوەی نیشانەی ئیزافەی (ی)و دەڵێ: ((... بە ناوی کۆتایی بە کۆنسۆنانت و بزوێن هاتووە وە دەلکێ. هەروەها دەشچێتە سەر ئەو ناوانەی نیشانەی (ەکە)ی ناسیاوی تاك و (ەکان)ی نیشانەی ناسیاوی کۆو (ان)ی نیشانەی کۆ و (ەك)ی نیشانەی نەناسیاوییان پێوەیە)).

هەرچەندە د. کوردستان ئەوەی وتووە کە نیشانەی ئیزافەی (ی) بە ناوی کۆتایی هاتوو بە کۆنسۆنانت و بزوێنەوە دەلکێ، بەڵام دەبوو باسێکی گۆڕان و شێوەی جۆراوجۆری نیشانەی ناوبراو لە باری جیاوازدا بکات... ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ، ئەوەتە نەک هەر لێرەدا، بەڵکو لەسەر پاکی نامەکەدا، نووسەر تەنیا (ەك)ی بە نیشانەی نەناسیاوی داناوەو بەهیچ چەشنێك ناوی (ێك، ێ)ی نەبردووە... ئەوەشی یادداشت نەکردووە کە نیشانەی (ی)ی ئیزافە بەدوا ئەو ناوانەشدا دێت کە نیشانەی (ە)ی ناسیاوی پێوەیە... لەم شوێنە و گشت شوێنێکی تردا (ەکان)ی بە نیشانەی ناسیاویی کۆ داوەتە قەڵەم (سەرنجمان دەربارەی ئەو جۆرە هەڵەیە لە هەندێ شوێنی ئەم کتێبەماندا دەربڕیوە).

هەروەها وا تێگەیشتووە کە ئەو نیشانانە لە حاڵەتی ئیزافەی بە یاریدەی نیشانەی (ی) سازبوودا، تەنیا بەدیار خراوەوە دەلکێن، بەڵام تەماشاکردنێکی سەرپێیی ئەدەبی کوردی یەکسەر ئەو ڕایەی د. کوردستان ڕەت دەکاتەوە، لەبەرئەوەی دەیان نموونە دەبینرێن کە نیشانەکانی (ەکە، ە)و (ێك، ێ) و (ان) و (ەکە + ان) لە حاڵەتی ئیزافەی بە یاریدەی نیشانەی (ی) سازبوودا، بە دیارخەریشەوە دەلکێن ( دواتر نموونەی زۆرمان هێناوەتەوە).

دوای ئەو باسە ساکار و پڕ هەڵەیەی نیشانەی (ی)، ئنجا دەستی بە توێژینەوەی نیشانەی (ە)ی ئیزافە کردووە. کاتێ کەمێك لە نیشانەی (ە)ی ئیزافە دواوە، دەڵێ :... لەم حاڵەتەدا (ەك)ی نیشانەی نەناسیاوی... جێناوی نیشاندان و (ە)ی نیشانەی ناسیاوی — (ئەو... ە)، (ئەم... ە) بە دیارخراوەوە دەلکێن. (ل ١٣).

دیسان نووسەر تەنیا (ەك)ی بە نیشانەی نەناسیاوی داناوە. کەچی ئەو ڕستەیەی پاش دێڕێك بۆ سەلماندنی ڕاکەی هێناویەتیەوە : (ڕۆژێکی مەلا لە ڕاوێدا پۆلە مراوییێکی لە گۆمێکدا دەبینێ) — دەبینین (ێك) تێیدا نیشانەی نەناسیاوییە. دواتر ڕستەی (ئەو کابرایە ئاسنگەرە هاوڕێی منە)ی هێناوەتەوە بۆ دەرخستنی ئەوەی کە بە دوا جێناوی نیشانداندا چۆن ناسیاوی دێت. لە ڕەخنەی ئەو ڕایەی نووسەردا، دەڵێم:

لە باسی نیشانەی ناسیاویی (ە)دا ڕوونم کردۆتەوە کە ئەو (ە)یەی بەدوای جێناوی نیشانداندا دێ، ڕاست نییە بە نیشانەی ناسیاوی دابنرێ، بەڵکو تەواوکەری جێناوەکەیە.

ئەو (ە)یە بە دیارخراوەوە دەلکێ، نەك بە دیارخەرەوە. کەچی نووسەر وای داناوە کە دەچێتە سەر دیارخەر.

ج— ئەو (ە)ی بەدوای وشەی ((کابرایە))دا هاتووە، بەر لە هەموشتێك بێ ئەویش ڕستەکە ساز دەبێ، واتە دەتوانرێ بوترێ (ئەو کابرا ئاسنگەرە هاوڕێی منە). جگە لەوە ئەگەر نووسەر مەبەستی لە (ە)ی کۆتاییی وشەی ((کابرایە)) بێ ئەوە نەك لە حاڵەتی ئیزافەدا، بەڵکو لە حاڵەتی تریشدا هەرجێناوەکە تەواو دەکات، وەك کە دەوترێ. (ئەو کابرایە ڕۆیشت). لێرەدا

هیچ ئیزافەش لە گۆڕێدا نییە. خۆ ئەگەر مەبەستی د. کوردستان (ە)ی کۆتایی وشەی ((ئاسنگەرە))بێت، ئەوە لەوێشدا هەر تەواوکەری جێناوی نیشاندانە. جا بێتو هێز لەسەر وشەی ((ئاسنگەرە)) دابنرێ، ئەوە دەبێتە خەبەر و (ە)ش دەبێتە کرداری بێ هێز. لەم حاڵەتەدا لە دوا وشەی ((ئاسنگەرە))وە دەبێ فاریزە دابنرێ.

د. کوردستان بۆ ئەوە چووە، کە لە حاڵەتی ئیزافەی بە یاریدەی نیشانەی (ە) پێکهاتوودا، ئەگەر دیارخەر ئاوەڵناوبێ، دەتوانێ ((نیشانەی (ەکە)ی ناسیاوی تاك و (ەکان)ی نیشانەی ناسیاویی کۆ و جێناوی نیشاندان و (ە)ی نیشانەی ناسیاوی)) (ل ١٣) وەربگرێ، کەچی دەرکی بەوە نەکردووە، کە لە حاڵەتی ناوبراودا دیارخەر دەتوانێ نیشانەی نەناسیاویش وەربگرێ، بە وێنە:

**کچە کوردێك دڵ پێی شاد بێ**

**وەك فریـــشتە و پەریزاد بێ** **(گۆران، ب، ل ٣٥)**

هەر لەو شوێنەدا کە ڕستەی ((عیسا هاودەنگەکانی خۆی کۆکردەوە و چوونە سەر ئەو دوژمنە بەهێزە))ی کردووە بە نموونەی ئەوەی کە دیارخەر جێناوی نیشاندان و نیشانەی ناسیاویی (ە)ی وەرگرتبێ، کەوتۆتە هەمان هەڵەوە کە لە ڕستەی ناوبراوی ((ئەو کابرایە ئاسنگەرە هاوڕێی منە))دا تێ کەوتووە، چونکە لێرەشدا (ە)ی کۆتایی ((دوژمنە)) و ((بەهێزە)) بەر لەوەی نیشانەی ئیزافە بن، تەواوکەری جێناوەکەن.

ئەوەی لەسەرەوە لێی دواوین بەشێکی زۆر کەمە لەو سەرنج و تێبینی یانەی دەربارەی کورتەی نامەی دوکتۆریی خوشکە کوردستانی موکریانی هەمانە. ئەگەر بۆمان کرا لە دەرفەتێکی تردا ئەوانی دیکەش دەخەینە پێش چاو.

بەپێی ئەو لێدوانەمان، ئەوە دەردەکەوێ کە بەرهەمی ناوبراو بە شێوەیەکی گشتی نەك هەر سادە و ساکارە، بەڵکو هەڵە و ناتەواوییشی زۆر تێدایە. کەچی د. برایمی عەزیزی برایمی پسپۆڕی هەمان مەیدان و لە ژمارە (٥٧)ی ساڵی ١٩٧٧ی گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))دا بە ناوی ((کورتە پێش چاوخستنێکی نامەی دوکتۆرای کوردستان عبدولڕەحمان لەتیف)) (ل ٥٣ — ٥٥)ەوە وتارێکی دەربارەی بەرهەمی ناوبراو نووسیوە و نەك هەر بە کارێکی گرنگ و بایەخدار و زانستیی گەورەی داناوە، بەڵکو هیچ ناتەواوی و هەڵەیەکیش سەرنجی ڕانەکێشاوە و یەك ڕەخنەش چییە دەربارەی نەیبووە. دیارە دەبێ هەستی بە هیچ کەم و کورتی و هەڵەیەك نەکردبێ تیایدا !...

**(تێبینی:** ١— لە چاپدانی ئەم کتێبەمان زۆری خایاندو لەو ماوەیەدا دەربارەی نامەی دوکتۆریی ناوبراو لە ژمارە ٧٠ی ساڵی ١٩٧٨ی گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))دا بە ناوی ((بەرکولێکی هەڵە زانستییەکانی کورتەی نامەی دوکتۆرییەکەی د. کوردستانی موکریانی))یەوە وتارێکم بڵاو

ئێمەش لەم کتێبەماندا لەبەر ئەوەی لە ڕووی مۆرفۆلۆژی یەوە لە ناو دەدوێین، ناتوانین هەموولایەنێکی بخەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە.

نیشانەی ئیزافە، بەونیشانەیە دەوترێ کە دیارخەر و دیارخراو بە یەکەوە دەبەستێت و پێوەندی وەسفی و خاوەنێتی و چۆنیەتی... نێوانیان نیشان دەدات. لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا (ی، ە...) نیشانەی ئیزافەن و هەمیشە بە دیار خراوەوە دەلکێن"[257]".

نیشانەی (ی)

هەندێ (بەڵگە وا دەگەیەنن ئەم نیشانەیە لە جێناوی هەیی (الضمیر الملکی – relative pronoun) هی (ئی)یەوە کەوتبێتەوە:

هەرچەندە وشەی هی (ئی)لە تێکستی کۆن و نوێی کوردیدا، بە شێوەیەکی سەرەکی وەك جێناوی هەیی بەرچاو دەکەوێ، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا دەبینرێ کە دیارخەرو دیارخراوی پێکەوە بەستووە – واتە دەوری ئیزافەی بینیوە.

---

کردەوە... ٢– ئەو وتارەی لەم دواییەدا د. کوردستانی موکریانی بە ناوی ((ئامرازەکانی خستنەسەر لە زمانی کوردیدا))وە، لە ژمارە ١ی بەرگی ٤ی ساڵی ١٩٧٨ی گۆڤاری ((زانکۆ))دا بلاوی کردەوە، بەداخەوە فریای ئەوە نەکەوت لەم نووسینەماندا لێی بدوێین. جا هیوامانە لە هەلێکی دیدا بیروڕامان سەبارەت بەو کارەش دەربڕین).

[257] - وەك پەراوێزی ژمارە (١٦٧)دا وتمان، بەشە ئاخاوتنی (ناو، جێناو، چاوگ...) دەتوانین ببنە دیارخراو. بەڵام لەبەر ئەوەی مەبەستی ئەم کتێبەی ئێمە باسی ناوە، بۆیە دیارخراو تەنیا لە شێوەی ناودا نیشان دەدەین.

**لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا (ئی) جێناوی هەیی بووە و هەروەها کاری ئیزافەشی بەجێ هێناوە — واتە یاریدەی دانەپاڵ یەکتری دیارخەرو دیارخراوی داوە"[258].**

**جێناوی هەیی، کە لە ئاوێستادا (یە/یا)، (یەت/هیەت) بووە، لە هەمان کاتدا وەك نیشانەی پێکەوە بەستنی دیارخەرو دیارخراو خۆی نواندووە"[259].**

**ئەم نیشانەیە کە لەوانی دیکە چالاکتر و پتر لە کاردایە، بە دیارخراوەوە دەلکێ و بەم شێوانەی خوارەوە دەبینرێ:**

**١- ئەگەر دیارخراو کۆتاییی بە هەر دەنگێکی کۆنسۆنانت بێ، ئەوە بەڕەوانی نیشانەی (ی)ی ئیزافەی دەچێتە سەر. وەك:**

**سەر + ی = سەری**

**دەست + ی = دەستی**

**دامێن + ی = دامێنی**

**سەری فەرهادم و، دەندووکی قوڵنگ**

**دەستی مەجنوونم و، دامێنی چیا**

**(نالی، ل ١٢٥)**

**بەهار + ی = بەهاری**

**بەهاری پووزەرد، بەهاری پووزەرد**

**منیشی خستە کەژو کێوو هەرد**

**(پیرەمێرد، ل ٢٠٧)**

---

[258] - بڕوانە: ڤ. س. ڕاستۆر گویڤا، زمانی فارسیی ناوەڕاست، مۆسکۆ، ١٩٦٦، ل ٧٣ — ٧٤.

[259] - بڕوانە: س. ن. سۆکۆلۆڤ، زمانی ئاوێستا، مۆسکۆ، ١٩٦١، ل ٦٥ — ٦٦.

**خەیاڵ + ی = خەیاڵی**

**ڕۆژ + ی = ڕۆژی**

**خەیاڵی پووچی دنیــا وا دەماغ و دڵمی پێچاوە**

**قیامەت، هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فکرم**

**(مەحوی، ل ٢٢١)**

٢- بێتو دیار خراو کۆتاییی بەدەنگی بزوێنی (ا، ۆ، وو، یێ، ە)بێت ئەوە بە پێی یاسای فۆنەتیکی کوردی (ی – î) دەبێتە (ی – Y). وەك:

**(أ)**

**مانگا + (ی – î) = مانگای (mangay)**

**ئەڵێی مانگای مالوانە**

**(پەندی پێشینان، ل ٤٩)**

**چرا + (ی – î) = چرای (ciray)**

**چرای ئاهەنگی ناو دۆستانم ڕۆ !**

**شێری مەیدانی ناو ژیانم ڕۆ !**

**(بێکەس، ل ١١٢)**

**(ۆ)**

**برۆ + (ی – î) = برۆی (biroy)**

**کوانێ دوو چاوی مەست؟ کوانێ؟**

**کوانێ برۆی پەیوەست؟ کوانێ؟**

**(گۆران، ب، ل ٢١)**

**دۆ + (ی – î) = دۆی (doy)**

بزنەگەڕ لە دژی مالآنی کردین

(پەندی پێشینان، ل ٨٦)

ئاسۆ + (ی – î) = ئاسۆی (asoy)

سوپاس بۆ یەزدان، یەزدانی گەورە

ئاسۆی هیوای کورد بێ تەم و هەورە

(بێکەس، ل ٢١)

(وو)

خانوو + (ی – î) = خانووی (xanmûy)

خانووی فەقیر، مانگە شەو چرایەتی

(پەندی پێشینان، ل ١٨٦)

ڕوو + (ی – î) = ڕووی (rûy)

لە ڕووی زەمینا نی یە وەك تۆ

قەومێکی دوودڵ، دیل و ڕەنجەڕۆ

(بێکەس، ل ١٨)

(ێ)

ڕێ + (ی – î) = ڕێی (rêy)

سەیری کۆڵانان بکە ئێستاکە چەند پاکە و تەمیزە

پیسی یو تۆزی سەرەنگوێلك لە ڕێی مەعبەر نەما

(زێوەر، ل ٣١)

کرێ + (ی – î) = کرێی (kirêy)

پوولی پارەیەکیشم پێ نی یە بیدەم بە کرێی ولاَخ...

(لە خەوما، ل ٣٠)

**پێ + (ی – î) = پێی (pêy)**

**پێی ناز ئەنێ بەسەر ئەرزا**

**جوانێ لە بەژنێکی بەرزا !...**

**(گۆران، ب٢، ل ٢٠)**

**(٥)**

**پیاڵە + (ی – î) = پیاڵەیی (pyaley)**

**بە نۆشی جانی وەردەگرم پیاڵەی زەهری هەر نیشێ**

**بە دەردی دڵ بچم گەر بێ لە جەوری تۆ دڵم بێشێ**

**(مەحوی، ل ٣٠٢)**

**میوە + (ی – î) = میوەی (mîwey)**

**شەراب لە میوەی تۆ دێتە بەرهەم**

**ئەبێ بە شیفای پەژارەو ئەلەم**

**(پیرەمێرد، ل ١٥٠)**

**خەندە + (ی – î) = خەندەی (xendey)**

**نەغمە + (ی – î) = نەغمەی (nexmey)**

**زڕە + (ی – î) = زڕەی (zirey)**

**هاڕە + (ی – î) = هاڕەی (harey)**

**ورشە + (ی – î) = ورشەی (wirsey)**

**بابێ خەندەی پڕ ئاهەنگ بێ !**

**نەغمەی نازی شۆخ و شەنگ بێ**

**زڕەی بازن بێ**

**بەرەو لای من بێ !**

**هاڕەی هەیاسەکەی،**

**ورشەی کراسەکەی**

**(گۆران، ب، ل ٢١)**

٣- ئەگەر دیارخراو کۆتاییی بە دەنگی بزوێنی (ی) بێت، ئەوکاتە نیشانەی ئیزافەی (ی) لە تەلەفوزدا دەرناکەوێ وەك:

**ڕێوی + ی - ڕێویی**

**ڕێویی ماڵ و شێری دەرەوەیە**

**(پەندی پێشینان، ل ٢٢٥)**

**ماسی + ی - ماسیی**

**دەعبای ناو ئەشکەوت، ماسیی گۆمی شین**

**باڵداری ڕەنگاوڕەنگ پەپولەی نەخشین "[٢٦٠]"**

**(گۆران، س، ل ٥٢)**

---

[٢٦٠] - ئەگەر دیارخراو ناسیاوی یا نەناسیاوی یا کۆ ... ی پێوە بوو، ئەو دەمەش دەتوانێ نیشانەی ئیزافەی (ی) وەربگرێ، بەلاّم لەم حاڵەتەدا، ئەگەر کۆتاییی بە دەنگی کۆنسۆنانت هاتبێ، وەك: (ژنێك ، ژنان ، ژنەکان ... ) ، ئەوە بەڕەوانی (ی)ی ئیزافەی پێوە دەلکێ: ( ژنێکی جوان ، ژنانی سلێمانی ، ژنەکانی تۆ ... ). بەلاّم بێتو کۆتاییی بە دەنگی بزوێن بێت، وەك: (دارەکە ، پیاوەکە ...) ، ئەو دەمە (ی – $\hat{1}$)ی ئیزافە دەبێتە (ی – Y)ی نیمچە بزوێن: ( دارەکەی مامۆستا، پیاوی هەژار ... ).

**نیشانەی (ە)" [٢٦١] ":**

هەرچەندە (ە)ش نیشانەی ئیزافەیە، بەلام لەبەکارهێنان و گەیاندنی واتادا هەندێك جیاوازی لەگەلّ نیشانەی (ی)دا هەیە " [٢٦٢] ".

ئەم نیشانەیە کەلە (ی) کەمتر لەکاردایە، هەروەها بە دیارخراوەوە دەلکێ. ئەمیش بەم شێوانەی خوارەوە دەبینرێ:

١- ئەگەر دیار خراو کۆتاییی بە هەردەنگێکی کۆنسۆنانت بێت، ئەوە بەڕەوانی نیشانەی (ە)ی ئیزافەی پێوە دەلکێ، وەك:

**کلك + ە = کلکە**

---

[٢٦١] - زۆربەی زۆری نووسەرانی ڕێزمانی کوردی باسی (ە)یان وەك نیشانەی ئیزافە نەکردووە. ئەو نووسەرانەش کە ناویان بردووە، شتێکی ئەوتۆیان لە بارەیەوە نەخستۆتە ڕوو ... هەرچەندە (ە) لە زمانی کوردیدا بە چەند جۆرێك خۆی دەنوێنێ، بەلام دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە ئەو (ە)ی وەك ئینتەرفیکس لە لێکدانی وشەدا هاریکاری دەکا، بەوێنە ( بەردەنوێژ ، مزرەسێو ، بووکە شووشە ...)، هەمان (ە)ی ئیزافەیە کە دەوری دانەپالّ یەکدی و پێکەوە بەستنی دیارخەر و دیارخراو دەبینێ.

[٢٦٢] - د. کوردستانی موکریانی لەو ڕایەدایە کە نیشانەی (ە) هەروەك (ی) دەور دەبینێ (بڕوانە: کورتەی نامەی دوکتۆری ((دیارخەر و شێوەکانی دەربڕینی پێوەندییە دیارخەرییەکان لە زمانی کوردیدا))، ل ١٢).

ڕاستە (ە)ش وەك (ی)دیارخەرو دیارخراو پێکەوە دەبەستێ، بەلام نابێ ئەوە لەبیربکرێ کە: (ی) زۆر لە (ە) چالاکترە.

لە هەندێ حالّەتدا ئەگەر (ی) بکرێ بە (ە) واتای جیاواز پەیدادەبێ، بەوێنە ((پووری نەسرین – پوورە نەسرین)) ، ((مامی نەریمان – مامە نەریمان)) ...

ج- هەندێ جاریش بێتو (ی) بکرێ بە(ە) لە بریتی دەوری ئیزافە ، دەوری لێکدان دەبینێ، وەك: ((گوڵی باخ – گوڵەباخ))، ((چەرمی گا – چەرمەگا)) ... ..... و هەندێکی تر

د- نیشانەی ئیزافەی (ی) دەتوانێ بچێتە سەر دیارخراوێك ، کە نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاوی و کۆ...ی پێوەبێ ، بەلام نیشانەی (ە) ناتوانێ.

**لە مێ مەیدانی عیشقە، کلکە ڕێوی ڕیشی تۆ، زاهید**

**چ بێ قەدری، دەبێ گەر شێری بێتێ کلکی ڕاکێشێ**

**(مەحوی، ل ٣٠٣)**

**کچ + ە = کچە**

**ئەڵێی کچە جافیان بۆ دابەزاندووە**

**(پەندی پێشینان، ل ٤٤)**

**بار + ە = بارە**

**شەرتە کەر بم بارە گوێزم لێ بنێن خڕڕەی نەیێ**

**بادەمێ زۆرو کەمێ وەك بێ غەمێ بۆ خۆم بژیم**

**(بێکەس، ل ١١٨)**

٢- ئەگەر دیارخراو کۆتاییی بە هەردەنگێکی بزوێن بێت، ئەو دەمە نیشانەی (ە)ی ئیزافە تێ دەچێ. وەك:

**باڵا + ە = باڵا**

**ئەگریجە + ە = ئەگریجە**

**بە یادی باڵا لاولاوێ**

**چاوڕەشی، ئەگریجە خاوێ**

**(گۆران، ب، ل ٣٠)**

**هەمانە + ە = هەمانە**

**هاتە سەرپێ کەوا بچێ بۆ ئاو**

**بە لەپا کەوتە سەر هەمانە دڕاو**

**(زێوەر، ل ٧٩)**

**بەچکە + ە = بەچکە**

**بەچکە مەلەوان، لە ئاوا ئەخنکێ**

**(پەندی پێشینان، ل ١٠٢)**

هەردوو نیشانەی (ی) و (ە)ی ئیزافە بە دیارخراوەوە دەلکێن. زۆرجاریش نیشانەی ناسیاوی و نیشانەی نەناسیاوی و نیشانەی کۆ دێنە ناوانەوە. ئنجا با بزانین، ئەو جۆرە نیشانانە کە دێنە ناوەوە، چۆن خۆیان دەنوێنن:

١- ئەگەر ئیزافە بەهۆی نیشانەی (ی)ەوە ساز ببێ، ئەوە ئەو نیشانە ناوبراوانە دەچنە سەر دیارخراو و دیارخەریش:

أ) ئەگەر دیارخەر بە تایبەتی ناو یاخود جێناو بێ و واتای خاوەنێتی بگەیەنێ، ئەو دەمە نیشانەکان بە دیارخراوەوە دەلکێن، وەك: (کوڕەکەی نەریمان، کوڕەکەی تۆ)،(کوڕەکەی نەریمان، کوڕەی تۆ)،(کوڕێکی نەریمان، کوڕێکی تۆ)،(کوڕانی نەریمان، کوڕانی تۆ)،(کوڕەکانی نەریمان، کوڕەکانی تۆ)...

با تەماشای هەندێ بەڵگە بکەین:

**دیارخراو + ەکە**

**گردەکەی یارە جێی خۆرەتاوە**

**ڕێگای سەیرانی نەورۆز بڕاوە**

**(پیرەمێرد، ل ١٠٦)**

**ماڵەکەی تۆ ئەخۆم بە بەلاش، هینەکەی خۆم ئەخەمە پاش.**

**(پەندی پێشینان، ل ٤١٣)**

**دیارخراو + ێك**

**شەرابی لەعلی ڕوممانی لە ((نالی))**

**حەرامە بێ مەزەی ماچێکی لێوان**

**(نالی، ل ٣٢٢)**

**هەموو وەزنێکی گۆرانی، لە توولانی هەتا کورتی،**

**بەسەر پەنجەی هونەر کردت بە دیلی کۆششی زاڵت!...**

**(گۆران، ب، ل ١٣٥)**

**دیارخراو + ان**

**شاخانی ئەوروپا بە فیدای ئەم مەقامە بن**

**هەر مەنزەرەی تەبیعی یەکەی مەحوەکا، کەدەر**

**(زێوەر، ل١٦)**

**حاکمانی مەحکەمە نامە سییان**

**قەت نەماوە غیرەت و ناموسییان**

**(نالی، ل ٣٢٥)**

**دیارخراو + (ەکە + ان)**

**حاکم و میرەکانی کوردستان**

**هەر لە (بۆتان)ەوە هەتا بابان**

**(کۆیی، ل ٥٤)**

**بە یادی دیلەکانی کوردی نازدار**

**بە حەپسی چوونە قەسری شاهی قاجار** **(سەلام،ل ١٠)**

ب) ئەگەر دیارخەر ناوی گشتی یاخود ئاوەڵناو بێ و لە حاڵەتی (مضاف الیە) دا بێ، ئەوە نیشانەکان بە دیارخەرەوە دەنووسێن، وەك: (کوڕی کوردەکە، کوڕی ئازاکە)،(کوڕی کوردە)، کوڕی کوردێك، کوڕی کوردێ، کوڕی ئازایەك)،(کوڕی کوردان، کوڕی ئازایان).

(کوڕی کوردەکان، کوڕی ئازاکان)"[٢٦٣].

هەندێ بەڵگە:

**دیارخەر + ەکە**

**ماچی دەمەکەی دامێ کە دامێ سەر وماڵم**

**بڕوانە چ صەبیادە، چ جەللادە بە حاڵم (نالی، ل ٢٨٦)**

**دیارخەر + ە**

**کوڕی شوانە کە ئەمەی بیست شێت بوو، دایە کێو،**

**زەویی داگرت بە تف کردن، ئاسمان بە جنێو! (گۆران، ب، ٦٩)**

**دیارخەر + ێك**

**سەرچاوەی ئاوێك، کەڵەکێك لەسەر**

**ژنێك تێی ئەچێ، ژنێك دێتەدەر...**

**(گۆران، ب، ل ١٥١)**

**دیارخەر + ێ**

**سەفیل و دەربەدەر ڕۆژی لە کووچە و قوژبنی شارێ**

---

[٢٦٣] - لێرەدا کە ئاوەڵناوی (ئازاکە، ئازایەك، ئازایان، ئازاکان)بەدوا وشەی (کوڕی)دا هاتووە و دەوری (مضاف الیە)ی بینیوە، هۆی ئەوەیە کە مەبەست (کەسێك)ە (ئازا)یە و ئەو ناوەی بەردەمی کە وەسفی دەکا، لابراوە.

**(بێکەس، ل ٨٦)**

**دیارخەر + ان**

**لە دوگمەی سەخمە دوێنێ نوێژی شێوان**

**بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان**

**(نالی، ل ٣٢٠)**

**دیارخەر + (ان + ەکە)**

**جۆگەی ئاوەکان تیایا قەتیس ماو**

**هەر ئەڕۆن ناکەن پێچی شاخ تەواو**

**(گۆران، ب، ل ١٤٥)**

**بە شیری مەمکەکانی**

**منی بە بەرهەم هانی**

**(بێکەس، ل ١٣٦)**

ج) بێتو دیارخەر ئاوەڵناو بێ و واتای وەسفی بگەیەنێ، ئەوە نیشانەکان دەچنە سەر دیارخراو" [٢٦٤] "، وەك: (کوڕەی ئازا لە بەردەم مەرگدا وەستابوو)، (کوڕێکی ئازا لە بەردەم مەرگدا وەستابوو)،(کوڕانی ئازا لەبەردەم مەرگدا وەستابوون)" [٢٦٥] ".

چەند نموونەیەك:

---

[٢٦٤] - د. کوردستان موکریانی وای داوەتە قەڵەم کە ئەو نیشانانە لە حاڵەتی ئیزافەی بە یاریدەی نیشانەی (ی) سازبوودا تەنیا بە دیارخراوەوە دەلکێن، بەڵام ئەو نموونانەی سەرەوە کە لە بەشی (ب)دا و هەروەها ئەوانەی لە بەشی (ج)دا نیشانمان داون، ئەو ڕایە ڕەت دەکەنەوە و ئەوە ئیسپات دەکەن کە دەتوانن بە دیارخەریشەوە بلکێن.

[٢٦٥] - لەم بارەدا (ەکە)و (ەکە + ان) بە دیارخەرەوە نالکێن.

**دیارخراو + ە**

**حەیرانی لەنجە و بەژن و بالاَتم**

**شەرابێ بابێ بۆ دلەی ماتم**

**(بێکەس، ل ٨٢)**

**دیارخەر + ێك**

**شێرکۆ کوڕێکی چاکە**

**زۆر بە رەحم و دلپاکە** **(بێکەس، ل ١٤٥)**

**چوومە لای مەلایەکی عەسەبی**

**وتم: ئەی واریسی عولوومی نەبی**

**(زێوەر، ل ٦٧)**

**مالێکی ئاوەدان لە سەد مالی وێران باشترە**

**(پەندی پێشینان، ل ١٤٥)**

**دیارخەر + ان**

**کۆن و موصەففا، لابەری جەفا**

**بەزم و ڕابیطە ی یارانی وەفا**

**(بێکەس، ل ٨٢)**

تێبینی: بێگومان، گواستنەوەی ئەو نیشانانە لە دیارخراوەوە بۆ دیارخەر، یاخود بە پێچەوانەوە لە دیارخەرەوە بۆ دیار خراو دەبێتە هۆی پەیدابوونی واتای جیاواز.

٢- ئەگەر ئیزافە بە هاریكاری نیشانەی (ە)ی ئیزافە پێك بێت، ئەودەمە نیشانە ناوبراوەكان تەنیا بە دیارخەرەوە دەنووسێن و دیارخراو هەرگیز وەریان ناگرێ.

چەند بەڵگەیەك:

**دیار خەر + ەكە**

**غەڵبە غەڵب و هەرای مەردم**

**خەوە شیرینەكەی لەدەس كردم**

**(زێوەر، ل ٧٣)**

**گورگانە شەوێ، گورگانە شەوێ**

**بەرخە بچكۆلەكەم خەوی لێ بكەوێ**

**(پیرەمێرد، ل ٤٣٣)**

**دیارخەر + ێك**

**كچە كوردێك دڵ پێی شاد بێ**

**وەك فریشتە پەریزاد بێ**

**(گۆران، ب،ل ٣٥)**

**دیارخەر + ێ**

**صەبا یارانی مەجلیس گەر هەواڵی من ئەپرسن لێت**

**بڵێ كێشایە مەیخانە دوچاوی بێچوە عەیارێ**

**(كوردی، ل ٣٤)**

**دیارخەر + (ەكە + ان)**

**ئەستێرە بەرزەكان ئەدرەو شێنەوە بە شەو**

**وەك من بە داخەوەن، نە سرەوتیان هەیە و نە خەو**

**(پیرەمێرد، ل ١٠٦)**

**ئەی چاو! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەریٚ پەرت،**

**کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دلبەرت؟**

**(گۆران، ب، ل ٢١)**

... هتد.

تێبینی: کاتیٚ ئیزافە بە هۆی نیشانەی (ە)ی ئیزافە ساز دەبیٚ، ئەوە:

١– بە زۆری ناو و ئاوەڵناو دەتوانن ببنە دیارخەر.

٢– ئەگەر دیارخەر ناو بیٚ، ئەوە ناوەکەش دەوری ئاوەڵناو دەبینیٚ و وەسف دەکا.

٣– تەنیا حاڵەتی (صفە و موصوف) دەور دەبینیٚ و (مضاف و مضاف الیە) پێك نایەت.

## ئیزافەی بیٚ نیشانە

لە زمانی کوردیدا ناو ناوە بیٚ ئەوەی هیچ نیشانەیەك هاریکاری بکا، دیارخەر بەدوا دیارخراوێکدا دیٚ کە ناوبیٚ و حاڵەتی ئیزافە سازدەبی"[٢٦٦]. وەك:

**خاوەن ماڵ "[٢٦٧]"دەستی هەڵگرت، دز ئەڵیٚ حەق ئەگەیەنم بە جێی خۆی.**

---

[٢٦٦]– نووسەرانی ڕێزمانی کوردی هەستیان بەبوونی ئەو حاڵەتەی ئیزافە نەکردووە.

[٢٦٧]– هەمان مەبەست لە پەندێکی تری کوردیدا، بە یاریدەی نیشانەی (ی)ی ئیزافە ساز بووە:

**خاوەنی باخ و بێستان شەرمەزارە بە زستان (پەندی پێشینان، ل ١٨٦)**

(پەندی پێشینان، ل ١٨٦)

مل عەلەم،شیرین "[٢٦٨]" "قەڵەم، ئاهوو شکەم، مەیموون قـەدەم سـم خـڕو

کلك ئێسترو مەنزڵ بڕ و عارەق نەڕێژ

(نالی، ل٢٢٥)

کوڕی شوانی برژاوی ئیش، لەبەر هەتاو قاڵ،

مەچەك ئەستوور، لەش کەڵەگەت دەفەی ناوشان چاڵ

(گۆران، ب، ل٦٨)

وردە تایبەتێتیی هەندێ بەشە دیالێکتی

کرمانجیی خواروو

١- لە ناوچەی سۆران لە حاڵەتی ئیزافەدا، جگە لەو نیشـانانەی باسمـان کردن، هەروەها نیشانەی (ێ)ش بەکاردێنن، وەك:

داکێ کوڕان گەردن بە خار

داکێ کیژان مایینێ حەبد (فۆلکلۆر، ل ٣١)

بابێ شەمار لە نەوی یان

دەنگی کۆترێ، غرمەی سی یان

لە بۆی کەتمە غەریبی یان

---

[٢٦٨]- لە زمانی کوردیدا هەندێ جار ئاوەڵناو پێش نـاو دەکـەوێ، وەك لـە ((شـیرین قەڵـەم))دا بینیمـان. هـەمان دیـاردە لـە وشـەی لێکـدراوی کوردیـدا ڕەنگـی داوەتـەوە، وەك: ڕەشمـاڵ ، زەرداو، پرسوود ، خۆش باوەڕ ...دا دەیان بینین.

**(فۆلکلۆر، ل٣١)**

**میریێ من کێ لەوانە**

**میریێ تۆ عەلۆ جوانە**

**(فۆلکلۆر، ل٣٩)**

**عەیشۆك ژنە بە بازنە**

**خوشکێ تووەو یارێ منە**

**(فۆلکلۆر، ل ٦١)**

٢- لە هەندێ شوێنی ناوچەی کوردستان حاڵەتی ئیزافە بەزۆری بە بێ نیشانە ساز دەبێ. لە کاتی ئاخاوتندا ئەوە دێتە بەرگوێ، کە ئەگەر دوا دەنگی وشەی دیارخراو کۆنسۆنانت بوو، ئەوە دەڵێن: پیاو ئاغا، کوڕ تۆ، بەرخ نێر... کەچی پیاوی ئاغا، کوڕی تۆ، بەرخی نێر... ناڵێن.

بێتو دیار خراو بە دەنگی بزوێن کۆتاییی هاتبێ، ئەودەمە نیشانە بەکاردێت و دەڵێن:

برای گەورە

پەنجەی من

... هتد.

کاتێ حاڵەتی ئیزافە (مضاف و مضاف الیە) بێ و نیشانەی (ەکە، ێك...)یش بێتە ناوانەوە، ئەوە نیشانەی ئیزافە پەیدا دەبێتەوە، وەك ئەوە کە دەڵێن:

پیاوەکەی ئاغا ، کوڕەکەی تۆ...

پیاوێکی ئاغا ، کوڕێکی تۆ...

لە هەمان حاڵەتدا ئەگەر (ەکە + ان) لە ناودا بێ، ئەو دەمە نیشانەی ئیزافە تێ دەچێ.

خۆئەگەر حاڵەتی ئیزافە(صفە و موصوف) بێ و نیشانەی ناسیاوی و نەناسیاویش لە ئارادابن، ئەوە نیشانەی ئیزافە نابینرێ.

***

بەهۆی ئەو دوو نیشانە – (ی، ە) سەرەکی یەو هەندێ نیشانە و تایبەتێتیی ترەوە کە لەسەرەوە باسمان کردن، لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداا ئیزافە ساز دەبێ. لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا نیشانەی (ا، ە، ی، ێ، ێد/ێت، ێن)و هەندێکی تر"[٢٦٩]" ئیزافە پێك دێنن.

ئەوەی نیشانەی ئیزافە لە دوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا لە یەك جیا بکاتەوە مەسەلەی ژمارە و جنسە. لە دیالێکتی خوارووادا وەك بینیمان نیشانەی ئیزافە بە ژمارە و جنسەوە بەند نییە. هەموو نیشانە ناوبراوەکان لە حاڵەتی تاك و کۆ و نێر و مێی دیارخراودا جیا نابنەوە. هەرچی دیالێکتی ژووروە نیشانەکانی ئیزافە بە پێی ژمارە و جنس خۆیان دەنوێنن تیایدا: نیشانەی (ا،ە) بە دیارخراوی ژمارەی تاکی جنسی مێوە دەلکێن. نیشانەی (ێ، ی) ئیزافەی دیارخراوی ژمارەی تاکی جنسی نێر ساز دەکەن. هەرچی (ێد/ ێت، ێن...)یشە بە دیارخراوی کۆی نێر و مێوە دەنووسێن. وەك لەو خشتەیەی خوارەوەدا دەبینرێ.

---

[٢٦٩]- وەك (آ، ێدە، نە، ەنە، یدە...) کەتایبەتین بەهەندێ بەشە دیالێکت و دواتر لێیان دەدوێین.




## نیشانەکانی ئیزافەی تاك

١- نیشانەکانی ئیزافەی تاکی جنسی مێ:

(ا)و(ە) نیشانەی ئیزافەی تاکی جنسی مێن.

نیشانەی ئیزافە(ا)

هەندێ لە زمانەوانان لەو ڕایەدان کە نیشانەی ئیزافەی (ا) لە جێناوی هەییی تاکی جنسی مێی (ئیا)وە کەوتۆتەوە"[٢٧٠]".

(ا) کە نیشانەی ئیزافەی تاکی جنسی مێیە، کاتێك بە دیارخراوەوە دەلکێ کە نیشانەی (ەك)ی نەناسیاوی پێوە نەبێ، وەك:

**کەس نینە ب لوتف و حسنێ مەشهوور**

**ئیلا کو ل دەفتەرا مە مە سطوور**

[٢٧٠]- بەوێنە بڕوانە: چەرکەزی بەکۆ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل ٩٤.

**(خانی، ل ١٣٦)**

**شەمعا ویصالێ هەر گەشە**

**شەوقا شەماڵێ ئاتەشە**

**(جزیری، ل ٦٣)**

**کا شێخ تە نەدی بۆتە چ انی**

**خەونا خوە ببێژە**

**(جگر خوێن، ل ١٣٣)**

... هتد.

**نیشانەی ئیزافەی (ە)**

(ە)ش هەر نیشانەی ئیزافەی تاکی جنسی مێیە، بەڵام جیاوازی لەگەڵ نیشانەی(ا)دا بە تایبەتی لەوەدایە ئەو کاتێك بە دیارخراوەوە دەلکێ کە نیشانەی (ەك)ی نەناسیاویی پێوەبێ، وەك:

**ئەگەر چاڤێ تە کەتییە ل قیزەکە بەك و غاییێن کوردانە،**

**(مەمی ئالان، ل ٥٧)**

**ئەوی دەری ڤەکر و دیت: قیزەك تێدا ڕۆنشتی یە ل بەر وێ ژی تاژیکی زێڕی و کێوریشکەکە زێڕین ڤردا وێدا دڕڤن.**

**(کۆردۆ، ل ٩٨)**

**دبێژن وەفدەکە کوردی**

**لەسەر زینات و ستەمکاریا ئەسەم**

**(صەبری، ل ٥٤)**

... هتد.

٢- نیشانەکانی ئیزافەی تاکی جنسی نێر:

(ێ)و(ی) دوو نیشانەن کە بۆ ئیزافەی جنسی نێر بەکاردێن.

نیشانەی ئیزافەی (ێ)

باوەڕی کوردناسان وا دەگەیەنێ کە سەرچاوەی نیشانەی ئیزافەی (ێ) جێناوی هەییی تاکی جنسی نێری (ئێ)بێت" [٢٧١] ".

(ێ)ی نیشانەی ئیزافەی تاکی جنسی نێر، هەروەك (ا)ی نیشانەی ئیزافەی جنسی مێ، دەمێك دەچێتە سەر دیارخراو کە (ەك)ی نیشانەی نەناسیاوی پێوە نەبێ، وەك:

**ڕابە هەـــــڕە زوو ب بێژە تاجدین**

**گەردێ تە ستی بە ڤێ، مەمێ زین** **(خانی، ل ١٦٨)**

**لاوێ من، سەرێ مێران وەك چیایێ بلّند هەر ب مژو دومانە.**

**(مەمێ ئالان، ل ٧٧)**

**خورشیدێ نەخوەش لەسەر کەرێ ڕەش پالّدایە وسا خوەش**

**(جگەر خوێن، ل ١٣١)**

... هتد.

نیشانەی ئیزافەی (ی)

ئەم نیشانەیەش بۆ جێ ناوی (هی)"[٢٧٢]" لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا دەگەڕێتەوە"[٢٧٣]".

---

[٢٧١] - هەمان سەرچاوە، ل ٩٤.

(ی)ی نیشانەی ئیزافەی تاکی جنسی نێر، هەروەك (ە)ی نیشانەی ئیزافەی تاکی جنسی مێ، کاتێك بە دیارخراوەوە دەلکێ کە نیشانەی (ەك)ی نەناسیاوی پێوەبێ. وەك:

**دەرمانەکی صیحەت و شیفایێ**

**مزگین و بەشارەتا وەفایێ**

**(خانی، ل٣)**

**دەست د دانە هەڤ ب دلەکی گەرم تەڤ ئاگرو پێت.**

**(صبری، ل ٤١)**

**هۆزانەکی ژیرو زانایە بێداری**

**ب زارێ کوردی تم دکی زاری**

**(جگەر خوێن، ل ١٣٩)**

... هتد

**تێبینی:**

أ) دوو نیشانەی (ا) و (ێ) تەنیا لە حاڵەتی نەبوونی نیشانەی (ەك)ی نەناسیاوی، بە دیارخراوەوە دەلکێن، کەچی دوو نیشانەی (ە) و (ی) بە پێچەوانەوە، کاتێك دەچنە سەر دیار خراو کە نیشانەی (ەك)ی نەناسیاویی پێوەبێ"[٢٧٤].

---

[٢٧٢]- ئەو جێناوە لە بەشە دیالێکتی کوردی ئازەربایجاندا لە شێوەی (ی)دا دەبینرێ. سەرەڕای ئەوە شێوەی ژمارەو جنسی نییە (بڕوانە: هەمان سەرچاوە، چەرکەزی بەکۆ، ل ٩٥).

[٢٧٣]- بڕوانە لاپەڕە (٢٢٦ – ٢٢٧)ی ئەم کتێبە.

[٢٧٤] - مامۆستا قەناتی کوردۆ لە لاپەڕە (٩١)ی کتێبی (دەستووری زمانی کوردی)دا ، مۆسکۆ – لێنینگراد، ١٩٧٣ ئەو ڕاستییەی خستۆتە ڕوو. کەچی لە دیوانی مەلای جزیری دا کە

مامۆستا صادق بەهائەددین چاپی کردووە، دەیان نموونە دەبینرێن کە (یٚ) بەدوادا (ەك)دا هاتووە و (ی)ش بەبێ لە ناواندا بوونی (ەك) بەدوا دیارخراودا هاتووە. بەم پێیە دیوانی مەلای جزیری ڕای مامۆستا کوردۆ ڕەت دەکاتەوە. جا بۆ ساغکردنەوەو یەك لاکردنەوەی ئەو کێشەیە، ژمارەیەکی زۆر لە تێکستی ناوچەی جیاوازی کرمانجیی ژووروم خوێندەوە و بەرهەمەکانی ئەحمەدی خانی و عوسمان صەبری و جگەر خوێن ...م ورد تەماشاکرد. دوای ئەو هەموو گەڕانە کەوتمە پرسیارکردن و گوێڕایەڵ کردن و لە ئاخاوتنی هەڵگرانی ئەو دیالێکتە ... ئەمانە هەموو گومانیان ڕەواندمەوە و گەیاندمانە ئەو ئەنجامە کە نیشانەی (یٚ)ی ئیزافە تەنیا لە حاڵەتی نەبوونی نیشانەی (ەك)ی نەناسیاویدا، بەدیارخراوەوە دەلکێ، هەرچی نیشانەی ئیزافەی (ی)یشە کاتێك دەچێتە سەر دیارخراو کە نیشانەی (ەك)ی نەناسیاویی پێوەبێ — واتە : ١- ئەوەی بیستساڵێك لەمەوبەر مامۆستا قەناتی کوردۆ وتوویە تەواو لەگەڵ واقیعی زمانی کوردی دەگونجێ،٢- چاپی نوێی دیوانی مەلای جزیری کە ئەرکی مامۆستا صادق بەهائەددینە پڕ هەڵە و نادروستییە. لە نووسراوی ناوبراودا گەلێ شێوەی وەها بەرچاو دەکەوێ کە باوەڕ ناکەم بەلای هیچ ناوچەیەکی کرمانجیی ژووروەوە لە کاردابێ. بە وێنە با بڕوانینە ئەو چەند دێڕە:

**جانا تویی من جان گولی بێ خاری گرم بی**
**مننەت کو نە وەك بولبولی محنەت عەبەسم ئەز**

**(جزیری ، ل٢١٥)**

**ڕوح و ڕەوانی من حەبیب دیسا ب تەلبیسا ڕەقیب**
**ڕەنجید کر مسکین غەریب تەرکا دلی ئەحبابی دا**

**(جزیری ، ل ٨٩)**

.... وە گەلێکی تر.

دەبینین لە شیعری یەکەمدا (بولبولی محنەت)ی تۆمار کردووە، بەڵام نەك شاعیرێکی مەزنی وەك مەلای جەزیری، بەڵکو لەهیچ کرمانجێکیش بەو شێوەیە نابیسترێ. واتە ڕاستی یەکەی (بولبولێ محنەت)ە. لە شیعری دووەمیشدا لە (ڕوح و ڕەوانی من)و (دلی ئەحبابی)دا، هەرهەمان هەڵە کراوە. ئەوەی پتریش ئەو ڕایەمان بسەلمێنێ، ئەوەیە کە مامۆستا صادق لە پەراوێزی (١٢)و (١٣)دا پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە، کەلە هەندێ دەسنووسدا (ڕوح و ڕەوانی من) و (دلێ ئەحبابی دا) تۆمار کراوە. بە پێچەوانەشەوە لە دەیان شوێندا دەبینرێ کە (یٚ) لە جێی (ی) دانراوە، وەك:

**زولفەکێ ئەو بەست بوون**
**عەقرەبیان گەست بوون** **(جزیری ، ل ٦٠٨)**

ب) دوو نیشانەی (ێ) و (ە) چۆن لە حاڵەتی تاکدا هەن، هەر بەو چەشنە لە حاڵەتی کۆشدا خۆیان دەنوێنن. سەرەڕای گەیاندنی واتای تاك و كۆ، هەروەها ئەوەش بەدی دەکرێ کە لە حاڵەتی کۆدا پێوەندیان بە جنسەوە نییە.

## نیشانەکانی ئیزافەی کۆ

وەك لەسەرەوە لێی دواین (ێد/ێت، ێن...) نیشانەی ئیزافەی کۆن و بە جنسەوە پێوەندیان نییە و بە گوێرەی جنس گۆڕانیان بەسەردا نایەت.

### نیشانەی ئیزافەی (ێد/ێت)

(ێد) نیشانەی باو و چالاکی ئیزافەی کۆیە و لە زۆربەی زۆری بەشە دیالێکتەکانی ژووروودا لە گەردایە. مامۆستا چەرکەزی بەکۆ لەو ڕایا دایە کە

---

.... هتد.

لە هەموو ئەو بەدواکەوتن و گەڕانەمدا تەنیا چەند نموونەیەکی زۆر کەم و بێ هێزم بەرچاو کەوتن، کە وەك حاڵەتی بیژۆك لە دەستوور لایان داوە، ئەویش هۆی لادانیان ڕوون و ئاشکرایە. ئەو چەند نموونە کەمەش بە هیچ جۆرێك نەیانتوانیوە کار بکەنە سەر ئەو دەستوورە ڕێك و پێکە، بەڵام ئەگەر زماناسێك بەختی وا بێنێ و تەنیا چاپی ناوبراوی دیوانی مەلای جزیری سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی بێ، ئەوە ئەو دەستوورە لەبار و چەسپاوە زیندە بەچاڵ دەکا. بێگومان، چاپی باسکراوی دیوانی مەلای جزیری پێویستی بە چارەسەرکردنە. هەرچەندە لە باسی نیشانەکانی (ێ) و (ی)دا ژمارەیەك نموونەی لەبار و گونجاومان خستە پێش چاو، کە هەموو هەڵکەوتی دیالێکتی کرمانجی ژوورو نیشان دەدەن، دیسان بۆ پتر ڕوون کردنەوە و تەواو ڕەتکردنەوەی چاپە پڕ هەڵەکەی جزیری بەیتێك لە کتێبی ((مەمێ ئالان))ەوە دێنینەوە کە هەردوو نیشانەی (ێ)و (ی)ی تێدایە و کورد واتەنی بەکارهاتوون:

**ب هەڤرە دبێن: ((ژ کەرەما یەزدانێ پاك بنێڕن، ئەڤ چ خورتەکی چەلەنگ، و چ جانە!))**

لە تەماشاکردنی ئەو بەیتەدا دەبینین:

١- (ێ) بەدوای وشەی ((یەزدان))دا هاتووە کە نیشانەی نەناسیاویی (ەك)ی پێوە نییە.

٢- (ی) بەدوا وشەی ((خورتەك))دا هاتووە کە نیشانەی نەناسیاویی (ەك)ی پێوەیە.

(ێـد) کـەرت و پارچـەی (ێدە)یـە، کەلـە هەنـدێ بەشـە دیـالێکتی ژووروودا بـەکاردێ. هـەروەها دەڵـێ، کـە (ێـد) بـۆ جێنـاوی هـەییی کـۆی (ییێـدە) دەگەڕێتەوە"[٢٧٥].

نیشـانەی (ێـد) لـە شـێوەی (ێت)یشـدا دەبینـرێ. واتـە هەرچـی (ێـت)ە شێوەی فۆنەتیکی (ێد)ە"[٢٧٦].

چەند نموونەیەك:

**زولفێد خوە کـرنە پایـە ئەنداز**

**دەستێد خوە کرنە فەرقێ پەرداز**

**(خانی، ل ٢٠٤)**

**هنەك ئاغا و میرێد کوردا قرار کرن کۆمەکێ بدەن خانێ چەنگ زێڕین.**

**(کوردۆ، ل ٢١٣)**

**قەولێت وی سەر سەری گوزافن**

**فیعلێت وی جملەتەن خیلافن**

**(خانی، ل ٤٤٠)**

---

٢٧٥– بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٠٥.

٢٧٦– هەندێ لە نووسەران، بەتایبەتی د. جمال نەبەز و د. کوردستانی موکریانی (ێد/ێت)بە دوو نیشانە تێگەیشتوون و دەرکیان بەوە نەکردووە کە (ێت) شێوەی فۆنەتیکی (ێـد)ە. دیارە ئاگاداری ئەوە نین کە لە هەندێ باردا دەنگی (د)ی کۆنسۆنانتی ئاوازدار وەك (ت)ی کۆنۆنـانتی کپ تەلەفوز دەکرێت. ئەم دیاردەیە واتە کپ بوونی دەنگێکی ئـاوازەدار کـە لـە زانسـتی زمانـدا (تواندنەوە – Assimilation)ی پێ دەوترێ، لـە زمـانی کوردیدا جگـە لـەوەی لـە دەنگـی (د)دا ، هەروەها لە چەند دەنگێکی تریشدا دەبینرێ.

**نیشانەی ئیزافەی (ێن)**

لە ئاخاوتن و ئەدەبیاتی زۆربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی ژووروودا(ێن)"[٢٧٧]" وەك:

**ئافەرین سەد ئافەرین هێ من ژ وانڕا ئافەرین**

**ئێ ژ تیرێن دلبەران دائم و دل پەیکان و گار**

**(جزیری، ل ٢٢١)**

**خورتێن کورد هۆزانێن ولاتێ تە**

**ئەڤن ڕابوونە ژ شاخ و لاتێ تە**

**(جگەر خوێن، ل ١٣٨)**

**وردە تایبەتێتیی هەندێ بەشە دیالێکتی کرمانجی ژووروو**

١- لە بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان و ئازەربایجاندا (Î)ش وەك نیشانەی ئیزافەی تاك بەکاردێ. ئەم نیشانەیە کورت کراوە و بچووکراوەی (ی)یە. واتە (Î) شێوەی فۆنەتیکی (ی)یە "[٢٧٨]". وەك:

**باڤ (bavi) وی دۆها چوویا شێر.**

٢- لە بەشە دیالێکتی کوردی ئازەربایجاندا (ێدە،ەدە، ێنە، ەنە، یدە)ش وەك نیشانەی ئیزافەی کۆ دەور دەبینن.

---

[٢٧٧]- لە زمانی ڕۆشانیدا (ێن) نیشانەی کۆی ناوە (بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ئی . ئا. سمیر نۆڤا، ل ٩٣). هەروەها لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیدا شێوەیی (ین) لە وشەی ((چەندین))دا وەك نیشانەی کۆ خۆی دەنوێنێ.

[٢٧٨]- چەرکەزی بەکۆ، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٩٤ ، ٩٨.

٣- لە بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستاندا (ێدە، ێنە)ش کاری نیشانەی ئیزافەی کۆ بەجێ دێنن "[٢٧٩].

**هەندێ خاسیەتی**
**نیشانەی ئیزافە لە دیالێکتی ژوورووو و خوارووودا**

١- نیشانەکانی ئیزافەی هەردوو دیالێکتە سەرەکی یەکەی زمانی کوردی لە گەیاندنی واتا و بینینی دەوردا هیچ جیاوازیەك لە نێوانیاندا نی یە. تەنانەت واتا بەخشینی نیشانەکانی (ێد/ێت، ێن...)ی کۆی دیالێکتی ژووروو، لە دیالێکتی خوارووودا دەتوانرێ بە یاریدەی نیشانەی کۆ + (ی)ی ئیزافە دەربڕرێ. وەك:

**برادەران و ڕەفیقانی خۆم مەبن غافڵ**
**لە تەربی یەو ئەدەب و سەنعەتێکی بەکار**

**(زێوەر، ل ١٥)**

**تە دگو لو کوڕێد من د دینن**
**نا بێژییە من : ستی و زێنن**

**(خانی، ل ١٥٠)**

**پرسپاس ژ وەرە هەی لاوێن جیهان**
**ل پێش وە دبن ئم دۆزەك پڕ گران**

**(صەبری، ل ٢٣)**

٢- لە تێکڕای دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا وا ڕێ دەکەوێ لە یەك ڕستەدا لە دوا دیارخەرەوە کۆمەڵە ناوێك بەدوا یەکدا دێن و نیشانەی ئیزافە وەردەگرن و هەمووشیان دەوری دیار خەر دەبینن.

---

[٢٧٩]- هەمان سەرچاوە ، ل ١٠٧.

وەك:

**گەلێ شێر و پڵنگ و باز و شاهێنی شــەهنشــاهی**
**وەکو ((نالی)) بە دڵ نێچیری ڕاوی چاوی جادووتن**

**(نالی، ل ٣٣٠)**

**خەڵکی گوندی ڕۆخی زێی بادین و کۆی وانێك بیە**
**تووش فەقەت زۆر گۆشتی ماسی و پێستی سەگلاوت هەیە**

**(زێوەر، ل ٢١)**

**تاجێ فەرقێ سەرێ مەحبووبانێ**
**تو ب شیرانی و لەب شەککەریێ**

**(جزیری، ل ٥١٨)**

**یەك مەولانا خەلیلێ سەردی**
**سوارێ هەسبێ کێموەشێ کوردی** **(جگەر خوێن، ل ١٣٨)**

... هتد.

٣- لە کرمانجیی ژووروو و خوارووشدا ئەگەر لـە ڕسـتـەدا دوو نـاو یـاخود پتر بە یاریدەی (و)ی پێوەندی پێکەوە بەسترابن و دەوری دیـارخراو ببیـنن، ئەوە دوا ناویان نیشانەی ئیزافە وەردەگرێ. بەڵام لە ناوەڕۆکدا پێوەندی ئەو نیشانەیە، هەروەها بۆ ناوەکەی سەرەتا - واتە یەکەم - یش دەگەڕێتـەوە. وەك:

**بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم**
**بە نان و ئاو و جل و بەرگی خۆم**

**(بێکەس، ل٢٤)**

**هەمیشە بەهار لە کەناری چەم**
**بوو بووە لاگیرەو گوڵی سەرپەرچەم**

**(پیرەمێرد، ل ١٤١)**

**میقدار و شکلێ هەندەسی**

**کێم زێدەیەك پێ ناحەسی** **(جزیری، ل ٦٩)**

**ملك و مالێ دنێ لازم دبە ژ بۆ تەنگی و ڕوومەتانە**

**(مەمێ ئالان، ل ٧٤)**

**... هتد.**

***

# قواعد اللغة الكردية

## المجلد الاول

## ( المورفولوجيا )

## القسم الاول

## _ الأسم _

ان قواعد اللغة (( grammar)) كمادة علمية ماهي الا من مكونات الفيلوجيا و مجموعة من القوانين و الضوابط حول تغيير الكلمة وتركبيها فى الجملة. فان مصطلح ((grammar)) مقتبس من اللغة اليونانية، وان اساس قواعد اللغة من حيث هي علم انما وضعت لبناتة فى اليونان منذ القدم. وتطلق كلمة ((grammatika)) في اللغة اليونانية على قواعد اللغة وهي انما تعني ((فن الكتابة)). من هنا كان

علمـاء اللغـة القـدامى ينظـرون الى قواعـد اللغـة علـى انهـا قبـل كـل شـيء يجب ان تعلم الانسان صحة الكتابة من حيث الاملاء وا سلوب التعبير.

علـى ان لكـل لغـة قواعـدها الخاصـة. و علـى موادهـا الثابتـة تصـاغ قواعـدها مـن حيـث هـي علـم، ومـع ذلـك فـان ثمـة قواعـد عامـة كمـادة علميـة هـي الاخـرى و هـي تعنـى ضـبط الاسـلوب العـام في دراسـة تكـون قواعـد اللغـة. وبـالرغم مـن ان لكـل لغـة موادهـا الخاصـة و اسـلوبها المختلـف و اسـتعمالاتها المسـتقلة و تشـترك في هـذه الخـواص مختلـف اللغـات، غـير ان ثمـة بعـض الاسـس الـتي لا معـدى مـن اخـذها الاعتبـار فـي اسـاس دراسـة اي لغـة " [٢٨٠] ". ومـن اجـل اسـتيعاب الطـرق الرئيسـة لقواعـد اللغـة الكرديـة لابـد من مراجعة بعض المشكلات العلمية للغة وتفسيرها و تحليلها.

ان قواعد اللغة من حيث هي علم تشكل شقين مهمين:

١– علم الصرف ((المورفولوجيا)) – Morphology

٢– علم النحو – "Syntax[٢٨١]"

ان الدراسـات العلميـة العميقـة الجـادة لشـقي قواعـد اللغـة: علـم الصـرف و علـم النحـو للغـة الكرديـة تتطلـب الدقـة و البحـث و تـوفير المراجـع والوقـت الكـافي معـاً وتقتضـينا دون شـك بالتـالي ان نسـود مئـات الصـفحات بهـا... وانـى عـاكف بحمـاس منـذ مـدة علـى تحقيـق مـا اقـدمت

---

[٢٨٠]– ظ . ظ ظينوطرادوظ، اللغة الروسية المعاصرة (المورفولوجيا)، موسكو، ١٩٧٢ ص ٢٢.

[٢٨١]– يرى بعض علماء اللغة ان الفونتيك يشكل جزء من القواعد، ولكن معظم علماء اللغة يعتبرونه جزء خاصا من هذا العلم ولا يدخلونه ضمن القواعد.

عليـه. فبعـد استقصـاء طويـل في المورفولوجيـا اسـطعت ان انجـز القسـم المتعلـق بالاسـم ناشـرا ايـاه فـى كتـاب مسـتقل. امـا اقسـام الكـلام الاخـرى فعـازم علـى ان اقـدمها كتابـا كتابـا. وسـتكون دراسـتى للنحـو الكـردى علـى الشـاكلة ذاتهـا. وان عملنـا هـذا المكـرس لدراسـة قواعـد اللغـة الكرديـة يتـألف مـن جـزئين: الجـزء الاول يتنـاول (علـم الصـرف – المورفولوجيـا)، و يتنـاول الجـزء الثـانى النحـو. ثـم يتـألف كـل جـزء مـن عـدة اقسـام، و الكتـاب الـذى بـين ايـدى القـراء، وهـو حـول الاسـم، يشـكل القسـم الاول مـن الجزء الاول.

(الاسـم) وحـدة مهمـة فـى الدراسـات المورفولوجيـة. ويتـألف المحتـوى الاسـاس للمورفولوجيـا مـن دراسـة اقسـام الكـلام وتكونهـا واقسـامها وتغيرها.

والـذى يسـتأثر بالاهتمـام اكثـر مـن غـيره فـى اللغـات مسـألة اقسـام الكـلام اذ مـن تفسـير مسـألة اقسـام الكـلام يبـدأ البحـث في قواعـد كـل لغـة. مـن هنـا وجـدنا لـزا ماعلينـا ان نراجـع تكـون اقسـام الكـلام وتطـوره. وتحـدثنا في مراجعتنـا هـذه عـن تلـك الخطـة الاولى التـى وضـعها العلمـاء اليونـانيون فـى الاسـكندرية (القـرن الثـانى ق. م) للغـة اليونانيـة كمـا تحـدثنا عـن الكيفيـة التـى نقـل بهـا الرومـان هـذه الخطـة بتصـرف قليـل الى اللغـة لاتينيـة وكيـف اصـبحت هـذه الخطـة القديمـة تسـتخدم بفضـل تـأثير اللغـة اللاتينيـة في ثقافـات القـرون الوسـطى في دراسـة بعـض اللغـات الاورويپـه الحديثـة ثـم اصـبحت ذات فائـدة للغـات العـالم الاخـرى واوضـحنا كيـف ان ثمـة لحـد الان اراء مختلفـة حـول تحديـد عـدد اقسـام الكـلام..

وكيف ان الكتاب الذين درسوا قواعد اللغة الكردية في ضوء قواعد اللغة الانجليزية، قسموا الكلام الى ثمانية اقسام فى حين ان المتأثرين بقواعد اللغة الروسية قسموه الى عشرة اقسام. كما نبهت على الفرق بين اراء الفريقين مضيفا الى ذالك رأيي الخاص باقسام الكلام فى اللغة الكردية.

وقد جاءت هذه البحوث و بعض الابحاث المهمة الاخرى فى مقدمة كتابنا هذا.

يتألف الكتاب من مقدمة وفصلين كبيرين: يحتوى الفصل الاول بعنوان ((موازنة موجزة للاعمال التى انجزت فى هذا الحقل)) عرضا لمجمل الكتب و الرسائل المتعلقة بالاسم الذى هو جزء من الكلام، ولا سيما نتاجات الذوات: سعيد صدقى كابان، توفيق وهبى، نورى على امين، رِشيد كورد، جگرخوێن، محمد امين هورامانى، صادق بهاءالدين، لجنة اللغة الكردية و علومها فى المجمع العلمى الكردى، د.جمال نبز، احمد حسن، لجنة الدراسة الكردية، قناتى كوردو، چركزى بكو، كريم ايوبى، و ئي. ئا. سمير نۆڤا... وغيرهم.

وفى استعراضنا هذا نبهنا على ان ما كتب حول هذه الاعمال بصدد المسألة المطروحة تعوزه الدقة والنظرة الشمولية الى جوانب المتعددة منها. وعلى سبيل المثال ان ادوات التعريف لم تميز حتى الان عن اللواحق المكونة للكلمة، ولم يتم التوصيل الى ما اذا كانت اداة التنكير (یٚ) او (ێك) او(یێك) او (یەك). وما اذا كانت اداة التعريف (كە) او(یەكە) او(ەك) او (ەكە)، وما اذا كانت (ە) اداة تعريف ام لا؟

كما لم يذكر شيء يعتمد عليه حول دور هذه الادوات وكيفية لصوقها بما تلحق بها واو جهها المختلفة والتغيرات التى تطرأ عليها.

كذالك فان غالبية الكتاب لم يميزوا بين الاسم المشتق ولمركب من الاسماء، اضف الى ذالك انهم غفلوا عن ذكر كثير من اللواحق و السوابق الواضحة للعيان جدا، فضلا عن وقوعهم فى اخطاء صارخة.

وبصدد ذكر الجمع عدوا (يان) اضافة الى (ان) لاحقة (وبالأحرى علامة – الؤلف) فى حين انها ليست شيئا من ذالك بل هي في الاساس (نصف طليق) وتأتى غالبا بين محركين من حروف التحريك. وعلية فان العلامة هي (ان)، الا ان ظهور (النصف الطليق) من حروف التحريك هو الذى فوت عليهم تحديد علامة الجمع من حيث الاساس.

وثمة نواقص اخرى تشوب مسألة الجمع، فانهم لم يذكروا علامتى (ات، ه ها،...) غافلين عن بعض الكلمات التى تكون صيغ الجمع ايضا. وكما ذكرنا سابقا فان معظم العلماء المار ذكرهم انما تصوروا مشكلات اللغة الكردية بذهنية قواعد اللغة العربية حيث لم يذكروا من علامات الربط بين المضاف والمضاف اليه والصفة والموصوف الا (ى) ولم يتطرقوا الى غيرها، كما انهم اعتبروا علامة الاضافة اداة او حرفا. وعلى الرغم من ان علماء الكردولوجيا فى الاتحاد السوفيتى وفي الغرب تطرقوا الى جملة من العلامات متوصلين الى استنتاجات معقولة الا انهم لم يحسوا بالاهمية القصوى لهذه المسألة كما يجب. وفيما يتعلق بتحديد انواع الجنس فى اللغة الكردية لم يتطرقوا الا الى نوعين منها

المذكر والمؤنث في حين ان ثمة نوعين اخرين احدهما مزدوج الجنس والثاني حيادي. فانهم في الوقت الذي تحدثوا عن علامة التأنيث في الاضافة بالنسبة للهجة الكرمانجية الشمالية نسوا العلامة نفسها وهي (ى) للمذكر و (ێ) للمؤنث فى حالة المفعولية، وهو يكون اساسا لموضوع الجنس للأسماء، ومهما قلنا من النواقص والاخطاء فان ثمة اساسا يمكن الركون الية ويبشر بالخير اذا كرست لهذا الاساس مواد ضرورية و بذلت في دراساتها محاولات جادة جديدة تمهد السبيل الى نتائج موفقة و حصائل منطقية. والجدير بالذكر ان ما كتبه الاساتذة: توفيق وهبى، نوري علي امين، قناتي كوردو، ضركزي بكو، حول الاسم، عمل ناجح وقد لعب دورا ايجابيا.

اما الفصل الثانى الذى يعد اساسا لهذا الكتاب فيضطلع بدور رئيس فى دراسة تلك المشاكل المهمة التى تخص الاسم فى اللغة الكردية من وجهتي المورفولوجيا وعلم اللغة.

ففي مستهل هذا الفصل قدمنا تعريفا للاسم مستشهدين بامثلة زادلة لة، ثم يلى ذلك البحث في الاسم من حيث مضمونه مقسما الى الاسم الخاص والاسم العام واسم الجمع، ونبة على كثير من جوانب هذه الانواع من الاسماء.

ثم نظر في الاسم من حيث مصدوقه، فميزنا بين المادى منه والمعنوى، وفيما يتعلق بالمعنوي فرعناه الى الاساسي والموضوع، ففي البحث في المعنوي الموضوع نبه على انه يتكون في الاكثر من

الاسم وصفته باضافة اللواحق التى قدمت نماذج منها كثيرة. ثم يتدرج البحث الى دراسة مفصلة بعنوان (الاسم من حيث بناؤه) ثم قسم الاسم من حيث بناؤه الى:

١- الاسماء التى تنقسم على المورفيم نحو: كۆگا، سەرۆك، پاوانە، لووتكە... شەكراو، بەردەنوێژ، ڕەشماڵ، خاكەناز...

٢- الاسماء التى لا تنقسم على المورفيم مثل: سەر، شەڕ، جۆ، لووت، دار، بەرد، هێز...

اما الاسماء التى تقسم على المورفيم فنوعان من حيث وقوعها في اللغة الكردية: اولا المشتق وثانيا المركب.

نعني بالمشتق ذلك الاسم البسيط الذي يتكون من كلمة بسيطة وزيادة. سواء أكانت الزيادة سابقة ام لاحقة او سابقة و لا حقة معا.

يتكون الاسم المشتق في الغالب بواسطو الاحقة "[٢٨٢]". ومن انواع هذه الاحقة ما يلحق الاسم او الصفة او الفعل او متعلقات الفعل البسيط و يجعلها اسما مشتقا... و اوردت المجمل هذه اللواحق امثله كافية. ومما له اهمية علمية اننا حاولنا ان نبرز اصالة هذه اللواحق مستشهدين بامثلة كافية فى اللهجة الكرمانجية الشمالية مع مقارنتها

---

[٢٨٢]- فضلا عن حالات اخرى تلتصق فيها بعض السوابق بجذر الفعل مركبا منها الاسم المشتق، وقد تحدثنا عن ذالك في الصفة (١٣٣) من هذا الكتاب. اما في تركيب الفعل فان السوابق تلعب بالعكس دورا مهما. وهذا من خصائص اللغة الكردية.

بلغــة الابســـتاق و الفارســـية القديمـــة و الفارســـية المتوســـطة (البهلويـــة) والفارسية الحديثة...

نعـني بالاسـم المركـب – ذلـك الاسـم البسـيط الـذى يتـألف فـى الاقـل مـن كلمـتين مستشـهدين بمجمـل الحـالات التـى تكـون الاسـم المركـب في اللغة الكردية.

ثـم يـأتى بعـد لـك موضـوع بعنـوان (اسمـاء العـدد) في اللغـة الكرديـة مشيرين في المقدمة التى الحالات المختلفة للاسم المفرد فالجمع.

وبغيـة الولـوج في الموضـوع ولابـراز خصـائص كـل لغـة فـى التعـبير عـن مفهـوم الجمـع، فقـد قـام كاتـب هـذا البحـث بجولـة سـريعة بـين بعـض مـن اللغـات الاجنبيـة ذات الجـذر الواحـد مـع اللغـة الكرديـة وابـرز اخـتلاف صـور الجمـع فـى هـذه اللغـات، واعـار اللغـة الفارسـية الوسـطى والفارسـية الحديثـة وبعـض اللغـات الايرانيـة اهتمامـا خاصـا، كمـدخل للحـديث عـن اصـل علامـة (ان) بوصفها العلامة الاساسية والاصلية للجمع في اللغة الكردية.

تحـدث الؤلـف في البدايـة عـن علامـة (ان) وحـدد صـورتها الصـحيحية في اللحـوق بمختلـف انـواع الاسمـاء مـن حيـث اخـتلاف اواخرهـا ومـا اذا كانـت حروفا صحيحة ام حروف علة او أى حرف من حروف العلة بعينه.

ثـم قـام بتحقيقـات فـى علامـات اخـرى للجمـع هـي (ات، ەهـا، گـەل). وهكـذا فقـد اوضـح صـاحب البحـث ان (ان)هـي العلامـة ارئيسـة للجمـع في اللغـة الكرديـة، وان (ات) و (ەهـا) و (گـەل) تشـكل علائـم للجمـع مـن المرتبـة الثانيـة. ثـم تحـدث عـن طـرق اخـرى لاداء معنـى الجمـع، فأفـاض

فـي الحـديث عـن الحـالات التـي يـؤدى فيهـا مفهـوم الجمـع لا مـن خـلال علائمه وانما عن طرق اخرى.

هـذا كلـه بالنسـبة للهجـة الكرمانجيـة الجنوبيـة. امـا بالنسـبة للكرمانجيـة الشـمالية فقـد بـذل محـاولات لالقـاء الضـوء علـى اوجـه الالتقـاء بينها وبين اللهجة الكرمانجية الجنوبية في هذا المجال.

وفي ختـام بحثـه لفـت كاتـب البحـث الانظـار الى بعـض خصـائص جمـع الاسـم غـي اللغـة الكرديـة. و كمـدخل الى دراسـة الاسـم مـن حيـث الجـنس و بيـان خصوصـية أي لغـة قـدمنا عرضـا في المقدمـة حـول عـدد مـن اللغـات الاوروپيـة القديمـة والحديثـة ثـم عرضـنا مـن خـلال اللغـات الابسـتاقية و الفارسـية القديمـة و الفارسـية المتوسـطة امعانـا في تشـخيص حقيقـة مفهـوم الجـنس للاسـم في الكرديـة، ثـم اجرينـا مقارنـة بـين الكرديـة وعـدد مـن اللغـات الايرانية الحديثة لابراز تطور تلك المشكلة.

كـان للاسـم في اللغـات الايرانيـة القديمـة ثلاثـة اجنـاس: المـذكر والمؤنـث والمحايـد و كانـت هـذه الاجنـاس الثلاثـة يتميـز بعضـها عـن الـبعض بطريقتين:

١) كـان الاسـم المـذكر والاسـم المحايـد مختـومين ب(الفتحـة)، يقابلـهما الاسـم المؤنـث المختـوم بـالالف، فـان كلمـة (اسـپ = ئەسـپە) في الابستاقية (الحصان) اسم لمذكر يقابله (أسپا= الفرس) وهو مؤنث.

٢) امـا الاسـم المـذكر و الاسـم المحايـد مـن المجموعـات الاخـرى فيقابلـهما الاسـم المختـوم باليـاء (ى) فـان كلمـة (نبـت) تعـني (الحفيـد)، واذا اريد لهذه الكلمة ان تدل على الحفيدة قيل (نبتى).

كانـت طريقتـا التميـز في الابسـتاقية شـائعتي الاسـتعمال بكـثيرة غـير ان طريقـة التمييـز الاولى كانـت هـي الاكثـر شـيوعا في الفارسـية القديمـة. لقـد تطورت اجناس الاسم كثيرا فى اللغات الايرانية المتوسطة.

ففـي الفارسـية المتوسـطة و بعـض اللغـات الايرانيـة الحديثـة تلاشـت علامـات التمييـز و اصـبحت في بعـض اللغـات الاخـرى في حالاتهـا الاعتياديـة عديمة الوجود الا في الجمل.

ففـي اللهجـة الجنوبيـة للغـة الكرديـة و بخاصـة في منطقـة السـليمانية اختفـت علامـات التمييـز بـين اجنـاس الاسـم منـذ مـدة طويلـة ولم يبـق لـه دور الا في حـالات قليلـة الـورود. غـير انهـا في اللهجـة الشـمالية و بعـض اللـهجات الجنوبيـة (الموكريـة و السـورانية) وان كانـت في الحـالات الاعتياديـة قـد انتهـى دورهـا، الا انهـا في الجملـة و خاصـة في حالـة المفعوليـة والنـداء والاضـافة تظهـر بوضـوح. فـان اسـم الجـنس المؤنـث في اللهجـة الكرمانجيـة علـى سـبيل المثـال في حالـة الاضـافة يميـز بعلامـة (ا). وهـذا ممـا يـثير الا نتبـاه الى ان علامـة (ا) الخاصـة بتأنيـث الجـنس في حالـة الاضـافة في اللهجـة الشـمالية هـي نفسـها كعلامـة تأنيـث الجـنس في الحالـة الاعتياديـة في الابسـتاقية التـى مـر ذكرهـا انفـا. وبعـد دراسـة مسـهبة و استشـهاد بامثلـة و ادلـة ضـافية بينـا ان اجنـاس الاسـم في اللهجـة

الكرمانجيـة الشـمالية تخضـع الى قاعـدة مطـردة ويتميـز بعضـها عـن بعـض بعلامات خاصة.

ففـي حالـة المفعوليـة يتميـز الجـنس الؤنـث ب(ێ – ê) والجـنس المـذكر ب(ى – î). امـا فـى اللهجـة الموكريـة و بعـض منـاطق اللهجـة السـورانية و الى حـد قليـل فيمـا حـول السـليمانية وان لم تتميـز هـذه الاجنـاس كمـا في اللهجـة الكرمانجيـة الشـمالية بصـورة مطـردة الا انهـا تحـتفظ الى حـد مـا بقواعـدها الخاصـة بهـا. ففـي اقسـام اللـهجات الجنوبيـة هـي الاخـرى يميـز اسـم الجـنس المؤنـث ب(ێ) و يميـز اسـم الجـنس المـذكر ب (ى) علـى ان هـذا التمييـز في اللغـة الادبيـة ولهجـة السـليمانية وبعـض المنـاطق الاخـرى وان كانـت عديمـة الـورود غـير ان بقاياهـا في بعـض الكلمـات والامثـال الشـائرة مـاتزال تحـتفظ بنفسـها، و فيمـا قـدمنا مـن عـرض و تحليـل ينبغـي الاستدلال بـان تشـابه علامـات التمييـز بـين المـذكر و المؤنـث و اتحـاد الاسـم المـذكر و المؤنـث في لهجـات اللغـة الكرديـة يـدل علـى ان اللغـة الكرديـة مـن حيـث قواعـدها الاساسـية لغـة واحـدة، وفيمـا اوردناه ما ينهض بالدليل على هذه الوحيد " [٢٨٣] ".

وفي الحـديث عـن ادوات التعريـف والتـنكير في فصـل اخـر بـدئ بدراسـة علامـة التعريـف وهـي (ەكـە) و (ە) و فصـل القـول فيهـا باسـهاب.

---

[٢٨٣] - ان الدليل على وحدة اللغة الكردية في مجال الجنس لـيس محصـورا في الاسم فقط بـل يوجد في اقسام الكلام الاخرى كذلك. ففي اللهجة الكرمانجيـة الشمالية مـثلا تنـدرج المصدر تحت الجنس المؤنث كما تندرج في اللهجات الموكريانيـة و السورانية وغيرهـا كمـا يسـتدل مـن تحدث قاطني تلك المناطق ومدوناتها.

ومــن الجــدير بالملاحظــة ان كاتــب هــذا البحــث لم يكشــف النقــاب عــن الاخطــاء الصــارخة حــول هــذه العلامــة فحســب، بــل قــدم كــذلك معلومــات ضــافية و جديــدة حولهــا حتــى انــه يمكــن القــول بأنــه هــو اول مــن احــس بوجود علامة التعريف (ه) في اللغة الكردية.

ثــم يــتكلم الكاتــب علــى علامــة التــنكير بانهــا (ێــك) و (ێ) فــى منطقــة الســليمانية و موكريــان. امــا (ێ) فلاشــك في انهــا مخففــة مــن (ێــك). ففــي اللهجــة الكرمانجيــة الشــمالية وعــدد مــن منــاطق اللهجــة الســورانية فــان علامــة التــنكير ذاتهــا (ەك)، كمــا ان (ن –) في بعــض اقســام اللــهجات الكرمانجيــة الشــمالية و (ن –، نــه – ، نــه –) فــى اللــهجات الاخــرى هــي علامــة التنكير.

وفــى الفصــل التــالى حــديث عــن علامــات الاضــافة. فــان علامــة الاضــافة في اللهجــة الكرمانجيــة الجنوبيــة (ی، ه). ويشــير بعــض الــدلائل الى ان (ی) انما نشأت من ضمير الملك (هى/ئى).

ففــي الفارســية المتوســطة (البهلــويــة) كانــت (ئــى) الضــمير الملكــى اضــافة الى انهــا كانــت تــربط بــين المضــاف والمضــاف اليــة. ومــن المعلــوم ان الضــمير الملكــى في الابســتاقية كــان (يــه/ يــا)، (يــەت/ هيــەت) التــى كانت تقوم بدور الربط بين المضاف والمضاف اليه.

ففــي الكرديــة تبــدو علامــة الاضــافة (ی) انشــط واكثــر اســتعمالا، ويعروها التغير وفق نهاية الكلمة.

اما(ه) فعلامة للاضافة ايضا، ولكن هناك بعض الفوارق بينها و بين (ى) في الاستعمال و الدلالة على المعنى. وعدا ما ذكرنا من علامتي الاضافة فان علامة (ێ) هي الاخرى شائعة الاستعمال في حالة الاضافة في بعض اللهجات السورانية. اما علامة الربط بين المضاف والمضاف اليه فغير محسوس بها لفضاً وكتابة في بعض المناطق.

والخلاصة ان علامتي (ى، ه) الرئيستين وبعض العلامات و الخصوصيات الاخرى التى تحدثنا عنها سالفاً تربط في اللهجة الكرمانجية الجنوبية بين المضاف و المضاف اليه.

وقد يكون المضاف والمضاف اليه صفة و موصوفاً و يعاملان معاملة المضاف و المضاف اليه. اما في اللهجة الكرمانجية الشمالية فان (ا، ه، ى، ێ، ێد/ێت، ێن) تربط بين المضاف والمضاف اليه.

والذي يميز علامة الاضافة في اللهجتين الرئيستين فهي اسماء العدد والجنس. فعلامة الاضافة في اللهجة الجنوبية لا ترتبط باسماء الاعداد واسماء الاجناس.

فالعلامات المذكورة جميعاً لا يتميز بعضها عن بعض في حالات الافراد و الجمع و التذكير و التانيث، في حين يتميز بعضها عن بعض في اللهجة الشمالية بحسب اسماء العدد واسماء الجنس، فعلامانا(ا، ه) للمفرد الؤنث، وعلامتا (ى، ێ) للمفرد المذكر.

اما (ێد/ێت،ێن) فلجمع المذكر والمؤنث. لافرق بين علامات الضافة من حيث الدلالة على المعنى ودورها الوظيفي في كلتا اللهجتين

الرئيسـتين في اللغـة الكرديـة، حتـى يمكـن التعـبير عـن علامـات (ێـد/ێت، ێـن) في جمـع الاسمـاء في اللهجـة الشـمالية بمسـاعدة علامـة الجمـع مـع (ی) المسـتعمل للاضـافة فـی اللهجـة الجنوبيـة. هـذا وغـيره مـن الامـور العلميـة يطالع القارىء في هذا الكتاب.

اسـتعملنا في هـذا الكتـاب بعـض المصـطلحات الخاصـة في اللغـة – القواعد، فوجدنا من الضروري ان نجمعها منشورة في نهاية هذا الكتاب.

وقـد اعتمـد المؤلـف لاعـداد هـذا الكتـاب علـى (٨٤) مصـدرا كرديـا و فارسـيا و روسـيا و عربيـا و انگليزيـا، كمـا فـاد مـن (٢٢) كتابـا مـن وثـائق الفولكلـور الكـردي و دواويـن الشـعراء، وذلـك للاتيـان بالامثلـة و الشـواهد اللغوية التی يبرهن بها على صحة ما ذهب عليه.

***

# فەرهەنگۆك (*)

| | | |
|---|---|---|
| ئامراز | اداة | |
| ـ ئامرازی پەیوەندی | حرف العطف | Conjunction |
| ـ ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشتن | اداة التعجب والنداء | Interjection |

---

*- ئێمە لە نووسینی ئەم كتێبەدا پێویستمان بە هەندێ زاراوە بوو. ئەوەی لەلایەن كۆڕی زانیاری كورد و بەڕێوەبەرێتیی گشتیی خوێندنی كوردییەوە دانراوە و بەلامانەوە لەبارو ڕەسەنە وەرمان گرت. ئەوەش كە نەبوو بە سەلیقەی خۆمان جێگەیمان پڕكردەوە.
لە بەجێ هێنانی ئەم كارەدا بەزۆری پەنامان بردۆتە بەر زمانی كوردی و مایەی خۆشییە زمانەكەمان دەوڵەمەندە و توانیومانە وشەی وەها بهێنینە كایەوە كە گەلێك لەبار و گونجاو بن و جێگەی زاراوەی بێگانە بە تەواوی بگرنەوە. بێگومان ئەگەر زاراوەیەك لە كوردیدا نەبێ، یاخود پڕ بەپێستی عەرەبیەكەی نەبێت، ئەوسا هەر عەرەبییەكەیمان وەرگرتووە. ناوەناوەش پەنامان بردۆتە بەر لاتینی ، بەتایبەتی لەو زاراوانەدا كە زمانناسە عەرەبەكانیش هەر شێوە لاتینییەكەیان بەكارهێناوە، بەوێنە وەك: (مۆرفێم — المورفیم، مۆرفۆلۆژی — المورفولوجیا...).
لێرەدا پەنجە بۆ ئەوە ڕادەكێشین كە كەمێ جیاوازی لە نێوان زاراوەكانی بەڕێوەبەرێتیی گشتی خوێندنی كوردی و كۆڕی زانیاری كورددا هەیە. جا بۆ ئاسان كردنی تێگەیشتن ئەوە دەخەینە پێش چاو كە جگە لەوانەی ئێمە لەم نووسینەماندا پەسەندمان كردوون، ئەو شێوە بەكارهاتنانەی خوارەوەش دەبینرێن:
ئاوەڵفرمان ، ئاوەڵكار — الظرف
ڕاناو — الضمیر
فرمان ، كار — الفعل
ناسراو — المعرفة
نەناسراو — النكرة
ناوی بەرجەستە — الاسم المادی
... هتد.

| | | |
|---|---|---|
| Intonation | نغمة الكلام | ئاواز |
| Voiced | المجهور | ئاوازەدار |
| Adverb | الظرف | ئاوەڵکردار |
| Derivational adverb | الظرف المشتق | ـ ئاوەڵکرداری داڕێژراو |
| Simple adverb | الظرف البسيط | ـ ئاوەڵکرداری سادە |
| Compound adverb | الظرف المركبة | ـ ئاوەڵکرداری لێکدراو |
| Adjective | الصفة | ئاوەڵناو |
| Derivational adjective | الصفة المشتقة | ـ ئاوەڵناوی داڕێژراو |
| Simple adjectivee | الصيفة البسيطة | ـ ئاوەڵناوی سادە |
| Compound adjective | الصفة المركبة | ـ ئاوەڵناوی لیَکدراو |
| Diminutive | التصغير | بچووك كردنەوە |
| Syllable | المقطع | بڕگە |
| Vowels | حروف العلة | بزوێن |
| Parts of speech | اقسام الكلام | بەشەكانی ئاخاوتن |
| Particles | | پارتیكل |
| Suffix | الاحقة | پاشگر |
| Preposition | حرف الجر | پریپۆزیشن |
| Letter | الحرف | پیت |
| Prefix | السابقة | پێشگر |
| Singular | المفرد | تاك |

| | | |
|---|---|---|
| Assimilation | المماثلة | تواندنەوە |
| Gender | الجنس | جنس |
| Genders of noun | اجناس الاسم | ـ جنسەکانی ناو |
| Neuter gender | الجنس المحايد | ـ جنسی بێ لایەن |
| Epicene | الجنس المزدوج | ـ جنسی دوولایەن |
| Feminie gender | الجنس المؤنث | جنسی مێ |
| Masculine gender | الجنس المذكر | جنسی نێر |
| Pronoun | الضمير | جێناو |
| Infinitive | المصدر | چاوگ |
| Derivation | الاشتقاق | دارِشتن |
| Unit | وحدة | دانە |
| Sound | الصوت | دەنگ |
| Case | الحالة | دۆخ |
| Cases of noun | حالات الاسم، اعراب الاسماء | ـ دۆخەکانی ناو |
| Direct case | حالة الاسم الصريح | ـ دۆخی ئاسایی |
| Postpositional attributive group | حالة الاضافة | ـ دۆخی ئیزافە |
| Vocative case | حالة المنادى | ـ دۆخی بانگهێشتن |
| Oblique case | حالة الاسم غير الصريح | ـ دۆخی تیان |

| | |
|---|---|
| Dependent member, determinatum | دیارخراو |
| (Attribtive (adherent adjunct, attribute | دیارخەر |

| | | |
|---|---|---|
| Sentence | الجملة | ڕستە |
| Root | جذر | ڕەگ |
| Roots of verb | جذر الفعل | ـ ڕەگی کردار |
| Grammar | القواعد | ڕێزمان |
| Language | اللغة | زمان |
| Linguist | عالم اللغة، لغوی | ـ زماننناس |
| Linguistics | علم اللغة | ـ زماننناسی |
| Iranianlanguages | اللغات الایرانية | ـ زمانە ئێرانییەکان |
| Indo– Europeanlanguages | اللغات الهندو أوروبية | ـ زمانە هیندو ئەوروپاییەکان |
| Pahlavi | اللغة الفارسية الوسطى (البلهوية) | ـ زمانی فارسی ناوەڕاست (پەهلەوی) |
| Numeral | العدد | ژمارە |
| Syntax | علم النحو | سینتاکس |
| Allomorph | نمط المورفيم | شێوەی مۆرفێم |
| Phrase | العبارة (العقدة) | فرێز |
| Phraseology | علم الكناية، علم العبارات الاصطلاحية | فرێزیۆلۆژی |
| Phonetics | علم الاصوات | فۆنەتیك |
| Phonology | علم وظائف الاصوات | فۆنۆلۆژی |
| Phoneme | الوحدة الصوتية | فۆنێم |
| oiceless | المهموس | کپ |
| Verb | الفعل | کردار |

| | | |
|---|---|---|
| ـ کرداری ئێستا | الفعل المضارع | Present tense |
| ـ کرداری تێپەڕ | الفعل المتعدی | Transitiveverb |
| ـ کرداری تێنەپەڕ | الفعل الازم | Intransitive erb |
| ـ کرداری داڕێژراو | الفعل المشتق | Derivational verb |
| ـ کرداری ڕابوردوو | الفعل الماضی | Past tense |
| ـ کرداری سادە | الفعل البسیط | Simple verb |
| ـ کرداری لێکدراو | الفعل المرکب | Compound verb |
| کۆ | الجمع | Plural |
| کۆنسۆنانت | الحروف الصحیحة | Consonants |
| لێکدان | الترکیب | Composition, Compounding |
| لێکسیۆلۆژی | علم المفردات القاموسیة | Lexicology |
| مانا | المعنی | Meaning |
| ـمانای داڕێژە | المعنی الاشتقاقی | Derivational meaning |
| ـ مانای نیسبی | المعنی النسبي | Relational meaning |
| مۆرفۆلۆژی | علم الصرف، المورفولوجیا | Morphology |
| مۆرفێم | المورفیم | Morpheme |
| ـ مۆرفێمی ڕیشەیی | المورفیم الجذري | Root morpheme |
| ـ مۆرفێمی وشە داڕێژ | المورفیم المکون للکلمة | Derivational morph |
| ـ مۆرفێمی وشە گۆڕ | المورفیم المغیر للکلمة | In flexional morph |
| مێ | المؤنث | Feminine |
| ناو | الاسم | Noun |

| | | |
|---|---|---|
| ـ ناوی تایبەتی | الاسم الخاص، اسم علم | Proper noun |
| ـ ناوی چاوگ | اسم المصدر | Action noun |
| ـ ناوی داڕێژراو | اسم المشتق | Derivational noun |
| ـ ناوی سادە | اسم البسيط | Simple noun |
| ـ ناوی کرداری | اسم الفعل | Verbal noun (substantive |
| ـ ناوی کۆمەڵ | اسم الجمع | Collective noun |
| ـ ناوی گشتی | الاسم العام | Common noun |
| ـ ناوی لێکدراو | الاسم المركب | Compound noun |
| ـ ناوی مادی | الاسم المادي | Material noun |
| ـ ناوی واتا (ناوی مەعنەوی) | الاسم المعنوی | Abstract noun |
| نیشانە | العلامة | Marker |
| ـ نیشانەی ناسیاوی | علامة التعريف | Definite articles |
| ـ نیشانەی نەناسیاوی | علامة التنكير | Indefinite articles |
| نیمچە بزوێن | نصف الطليق | Semi – Vowel |
| نێر | المذكر | Masculine |
| وشە | الكلمة | Word |
| ـ وشەی تەواو | الكلمة التامة | Autosemantic word |
| ـ وشەی داڕێژراو | الكلمة المشتقة | erivational word |
| ـ وشەی سادە | الكلمة بسيطة | Simple word |
| ـ وشەی لێکدراو | الكلمة المركبة | Compound word |

| | | |
|---|---|---|
| ـ وشەی ناتەواو | الكلمة ناقصة | Syntactic word |
| ـ وشەی هاوێیژ | المشترك اللفظي | Homonym |
| ـ وشەی هاوواتا | المرادف | Synonym |
| | | |
| وشە ڕۆنان | بناء الكلمة | Word – formation |
| هێز | النبرة | Stress |

# نیشانەی نموونەکان (*)

١- (بێکەس)

دیوانی بێکەس، محەمەدی مەلا کریم ڕێکی خستووە و سەرپەرشتیی لە چاپ دانی کردووە، بەغدا، ١٩٧٠.

٢- (پەندی پێشینان)

پەندی پێشینان، کۆکردنەوەی شێخ محمدی خاڵ، چاپی دووەم، ١٩٧١.

٣- (پیرەمێرد)

پیرەمێردی نەمر، محەمەد ڕەسووڵ هاوار، بەغدا، ١٩٧٠.

٤- (تحفةء مظفرية، ب ١)

ئۆسکارمان، تحفة مظفرية، بەرلین، ١٩٠٥. پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥.

٥- (تحفةء مظفرية، ب ٢)

ئۆسکارمان، تحفة مظفرية، بەرلین، ١٩٠٥. پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٧٥.

---

* - بۆ پێ سەلماندن و چەسپاندنی ئەو دەستووره ڕێزمانییانەی لێیان دواوم، بەزۆری لە کەرەستەی فۆلکلۆر و ئەدەبەوە نموونەم هێناوەتەوە و کردوومنەتە بەڵگە. بێگومان ئەم جۆرە ڕێبازەش پتر شێوازی زانستیی دەداتە لێکۆڵینەوەی زمان... بۆ هەرنموونەیەك کە هێناومەتەوە، سەرچاوەکەیم دیاری کردووە، بەلاّم لەبەر کەم داگیرکردنی جێگەو دووپات نەبوونەوە، نیشانەم بۆ داناون. جا لێرەدا ناونیشانی تەواویان دەنووسم.

٦- (جزیری)

دیوانا مەلایێ جزیری، تویژاندنا صادق بەهائەدین ئامێدی، بەغدا، ١٩٧٧.

٧- (جگر خوێن)

جگر خوین، سەورا ئازادی، شام، ١٩٥٤.

٨- (خانی)

ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئەستەموولێ، ١٩٦٠، م. بۆز ئەرسەلان لە چاپی داوە.

٩- (زێوەر)

دیوانی زێوەر، بەغدا، ١٩٥٨.

١٠- (صەبری)

عوسمان صەبری، باهۆز و چەند نڤیسارێن دن، شام، ١٩٥٦.

١١- (فۆلکلۆر)

فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری، کۆکردنەوەی محەمەد کەریم شەریف، کەرکووك، ١٩٧٤.

١٢- (کوردۆ)

کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی، پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ لە زاری کوردەکانی سۆڤێتەوە تۆماری کردووە. شوکر مستەفاو ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی، بەغدا، ١٩٧٦.

١٣- (کوردی)

دیوانی کوردی، چاپی کوردی و مەریوانی، بەغدا، ١٩٣١.

١٤- (کۆیی)

حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد، محەمەدی مەلا کریم، بەغدا، ١٩٦٠.

١٥- (گۆران، ب)

گۆران، بەهەشت و یادگار و، فرمێسک و هونەر لەگەڵ دوو هاوینە گەشت، سلێمانی، ١٩٧١.

١٦- (گۆران، س)

گۆران، سروشت و دەروون لەگەڵ ئۆپەرێتی ئەنجامی یاران، سلێمانی، ١٩٦٨.

١٧- (لە خەوما)

جەمیل صائب، لە خەوما. پێشکەش کردن و لێکۆڵینەوەی جمال بابان، بەغدا، ١٩٧٥.

١٨- (مەحوی)

دیوانی مەحوی. لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی : مەلا عبدالکریمی مدرس و محمەدی مەلا کریم، بەغدا، ١٩٧٧.

١٩- (مەسەلەی ویژدان)

ئەحمەد موختار جاف، مەسەلەی ویژدان. پێشەکی و لێکۆڵینەوەی د.ئیحسان فوئاد.

٢٠- (مەمیٚ ئالان)

مەمیٚ ئالان، چیرۆك نڤیس کۆی کردووەتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە. صالح عەلی گوللی و ئەنوەر قادر محەمەد لە ڕێنووسی لاتینییەوە هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی، بەغدا، ١٩٧٧.

٢١- (نالی)

دیوانی نالی. لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی : مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، بەغدا، ١٩٧٦.

22- O.Mann Oskar Mann, Die Mundart der Mukri – Kurden, Teil I, Berlin, 1906 .

***

# سەرچاوە

## بە زمانی کوردی


(١) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد، ڕێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٦.

(٢) د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، بەرکولێکی هەڵە زانستییەکانی کورتەی نامەی دوکتۆرییەکەی د. کوردستانی موکریانی، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ)) ژ٧٠، بەغدا، ١٩٧٨، ل ١١ — ١٨.

(٣) د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، چی لەبارەی زمانی کوردی یەوە نووسراوە، بەغدا، ١٩٧٤.

(٤) د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، بەغدا، ١٩٧٦.

(٥) د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کۆی ناو لەزمانی کوردیدا،((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد))ب٦، بەغدا، ١٩٧٨، ل ١٨٥ — ٢٢٥.

(٦) د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٧.

(٧) د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٥.

(٨) د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، هەوڵێکی سەرەتایی بۆ دۆزینەوەی نیشانەکانی ناسیاوی و نەناسیاوی لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداا، گۆڤاری ((زانکۆ))ب٣، ژ٢، سلێمانی، ١٩٧٧، ل ١٢٢ — ١٦٦.

(٩) د.برایمـی عـەزیزی برایمـی، کورتـە پـێش چاوخسـتنێکی نامـەی دوکتۆرای کوردستان عەبدولرەحمان لـەتیف، گۆڤـاری ((ڕۆشـنبیری نـوێ))، ژ٥٧، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٥٣ — ٥٥.

(١٠) تۆفیق وەهبی، دەسـتووری زمـانی کـوردی، جزمـی یەکـەم، بەغـدا، ١٩٢٩.

(١١) جگر خوێن، ئاوا ئو دەستورا زمانێ کوردی، بەغدا، ١٩٦١.

(١٢) د. جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی،بامبێرگ، ١٩٧٦.

(١٣) ڕەشـید عومـەر دزەیـی، چـەند سـەرنجێکی زمانـەوانی، ڕۆژنامـەی ((هاوکاری))، ژ١٥، بەغدا،١٩٧١،ل٤.

(١٤) ڕەشـید عومـەر دزەیـی، چـەند سـەرنجێکی زمانـەوانی، ڕۆژنامـەی ((هاوکاری))، ژ١٥، بەغدا، ١٩٧٤.

(١٥) ڕەشید کورد، ڕێزمانا زمانێ کورمانجی، چاپخانەیا کەرەم، ١٩٥٦.

(١٦) ڕێزمـانی ئاخـاوتنی کـوردی بـەپێی لێکۆڵینـەوەی لیژنـەی زمـان و زانستەکانی، ((گۆڤـاری کـۆڕی زانیـاری کـورد))، ب ٣، ژ١، بەغـدا، ١٩٧٥، ل ٣٩٨ — ٤٩٦ ، ب٣، ژ٢، بەغـدا، ١٩٧٥، ل ٢٤١ — ٣٥٨، ژ٤، بەغـدا، ١٩٧٦، ل ٢٨٩ — ٤٠٠.

(١٧) ڕێزمـانی ئاخـاوتنی کـوردی بـەپێی لێکۆڵینـەوەی لیژنـەی زمـان و زانستەکانی، بەغدا، ١٩٧٦.

(١٨) زاراوە زانسـتییەکان، دانـان و لێکۆڵینـەوەی لیژنـەی زاراوە زانستییەکانی کۆڕ، بەغدا، ١٩٧٦.

(١٩) سەعید صدقی، مختصر صرف و نحوی کوردی، بەغدا،١٩٢٨.

(٢٠) صادق بەهائەدین ئامێدی، ڕێزمانا کرمانجی، بەغدا، ١٩٧٦.

(٢١) صەباح غالب، کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی لەبەر تیشکی لێکۆڵینەوەدا، ڕۆژنامەی ((هاوکاری))، بەغدا، ١٩٧٧،بەشی یەکەم، ژ ٣٦٥، ل ٤، بەشی دووەم، ژ ٣٦٦، ل ٤ و ١١، بەشی سێیەم (ئەم بەشەی وتار چاپ نەبووە... ئێمە دەستنووسەکەیمان بینیوە)، بەشی چوارەم، ژ ٣٦٨،ل ٤ و١١ ، بەشی پێنجەم، ژ ٣٦٩، ل ٤ و ١١، بەشی شەشەم، ژ ٣٧٠، ل ٤، بەشی حەوتەم، ژ ٣٧١، ل ٤ و ١١، بەشی هەشتەم، ژ ٣٧٢، ل ٤و ١١.

(٢٢) عەبدولرەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی، قامووسی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٧.

(٢٣) عەبدوڵلا شالی، د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، د. ئەمین عەلی، نووری عەلی ئەمین، فەرەیدوون عەلی ئەمین، عەلائەددین سەجادی، کەمال مەحمود فەرەج، ئەبووزەید مستەفا سەندی، زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی، بەغدا، ١٩٧٦، بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی، بەغدا، ١٩٧٦، بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، بەغدا، ١٩٧٦، بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی، بەغدا، ١٩٧٦، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، بەغدا، ١٩٧٦، بۆپۆلی شەشەمی ئامادەیی، بەغدا، ١٩٧٦.

(٢٤) فاروق عومەر صدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد))، ب٣، ژ١،بەغدا، ١٩٧٥، ل ١٩٨ — ٢٤٢.

(٢٥) قەناتی کوردۆ، زمانێ کوردی، چاپی یەکەم، یەریڤان، ١٩٤٩.

(٢٦) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی، پێشەکی و ڕێکخستنی د. ئەورەحمانی حاجی مارف، بەغدا، ١٩٧٥.

(٢٧) محەمەد ئەمین هەورامانی، سەرەتاییێك لە فیلۆژیی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٣.

(٢٨) مەسعوود محەمەد، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد))، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٣، ل ٣٩ – ١١٤.

(٢٩) مەسعوود محەمەد، هەڵدانەوەی چەند رووپەڕێیکی زمانی کوردی، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد))، بەرگی پێنجەم، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٢٦٤ – ٣١١.

(٣٠) نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠.

(٣١) نووری عەلی ئەمین، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٥٨.

(٣٢) نووری عەلی ئەمین، قواعیدی زمانی کوردی لە (صرف و نەحو)دا، بەرگی یەکەم ن بەغدا، ١٩٥٦، بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٥٨.

### بە زمانی فارسی

(٣٣) دکتر پرویز ناتل خانلری، تاریخ زبان فارسی، جلد اول، ١٣٥٤، جلد دوم، ١٣٥٤، جلد سوم، ١٣٥٤.

(٣٤) ذوالنور دستور پارسی در صرف و نحو و املای فارسی، تهران، ١٣٤٣.

(٣٥) سيد كمال طلقانى، دستور زبان فارسى، چاپ ششم، ١٣٥١.

(٣٦) على برناك، دستور زبان فارسى، ١٣٤٧.

(٣٧) محسن ابو القاسمى، دربارۀ زبان أسى، ١٣٤٨.

(٣٨) محمد كيوان پور، نامهاى پرندگان در لهجەهاى كردى، تهران، ١٣٢٦.

## **بەزمانی عەرەبی**

(٣٩) ابو العباس محمد بن يزيد المبرد، المذكر والمؤنث. حققة وقدم لة وعلق علية: الدكتور رمضان عبدالتواب و صلاح الدين الهادى، الجمهورية العربية المتحدة، ١٩٧٠.

(٤٠) الدكتور ابراهيم انيس، من اسرار اللغة، الطبعة الرابعة، القاهرة، ١٩٧٢.

(٤١) الدكتور ابراهيم سامرائى، فقه اللغة المقارن، بيروت، ١٩٦٨.

(٤٢) الدكتور ابراهيم سامرائى، مباحث لغوية، النجف، ١٩٧١.

(٤٣) توفيق وهبى، قواعد اللغة الكردية، الجزء الاول، الباب الثانى، بيروت، ١٩٥٦.

(٤٤) عبدالباقى الصافى، دراسة مقارنة للكلمة و علم الصرف فى اللغتين العربية و الانكليزيه، مستل من مجلة كلية الاداب جامعة البصرة، العددان ٤ و ٥

(٤٥) عبدالمهدى مطر، دراسات فى قواعد اللغة العربية، الجزء ١ — ٣ النجف، ١٣٨٥هـ.

(٤٦) الدكتور علي عبدالواحد وافى، علم اللغة، الطبعة السابعة، القاهرة، ١٩٧٢.

(٤٧) فتحية توفيق صلاح، التيسير، في النحو والصرف، عمان، ١٩٧٨.

**بە زمانی ڕووسی**

(٤٨) ئۆ. س. ئاخمانۆڤا، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان، مۆسکۆ، ١٩٦٦.

(٤٩) ك. ڕ. ئەیووبی و ئی. ئا. سمیر نۆڤا، دیالێکتی کوردی موکری، لێنینگراد، ١٩٦٨.

(٥٠) ئی.م. ئۆرانسکی، زمانە ئێرانییەکان، مۆسکۆ، ١٩٦٣.

(٥١) د.ن. ئوشاکۆڤ، فەرهەنگی زمانی ڕووسی، مۆسکۆ، بەرگی یەکەم، ١٩٣٥ ، بەرگی دووەم، ١٩٣٨ ، بەرگی سێیەم، ١٩٣٩، بەرگی چوارەم، ١٩٤٠.

(٥٢) ئی. پ. ئیڤانۆڤا، س.پ. بالاشۆڤا، د.ن. بۆریسۆڤا، ن.ڤ. ڤارگینا، ل.پ. ڤینۆگرادۆڤا، م. ئا. کاشێیڤا، ڤ.ڤ.مێنکۆڤا، ئی.ئا. پۆتاپۆڤا، ل.ن. سۆلۆڤیۆڤا، ل. پ. چاخۆیان، پێکهاتنی ناو لە زمانی ئینگلیزیدا، مۆسکۆ، ١٩٧٥.

(٥٣) چ.خ. باکاییێڤ، بەشەدیالێکتی کوردی تورکمەنستان، مۆسکۆ، ١٩٦٢.

(٥٤) چ. خ. باکاییێڤ، زمانی کوردەکانی ئازەربایجان، مۆسکۆ، ١٩٦٥.

(٥٥) چ. خ. باکاییێڤ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ، ١٩٧٣.

(٥٦) س. ڤ. برۆملێی، ل. ن. بوولاتۆڤا، دەربارەی مۆرفۆلۆژیی بەشە دیالێکتەکانی زمانی ڕووسی، مۆسکۆ، ١٩٧٢.

(٥٧) ڤ. س. ڕاستۆرگویڤا، زمانی فارسیی ناوەڕاست، مۆسکۆ، ١٩٦٦.

(٥٨) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسکی، سەرەتایێکی زمانناسی، چاپی چوارەم، مۆسکۆ، ١٩٦٧.

(٥٩) ئی. ئا. سمیر نۆڤا، شێوەی ژمارەی ناو لە زمانە ئێرانی یەکاندا، لێنینگراد، ١٩٧٤.

(٦٠) س. ن. سۆکۆلۆڤ، زمانی ئاوێستا،مۆسکۆ، ١٩٦١.

(٦١) فارووق عومەر صدیق، ڕۆنانی ناو لە زمانی ئەدەبیی کوردی عێراقدا (کورتەی نامەی دوکتۆری)،مۆسکۆ، ١٩٧٧.

(٦٢) ڤ. ئا. فورۆلۆڤا، زمانی بلووجی، مۆسکۆ، ١٩٦٠.

(٦٣) ن. س. ڤالگینا، د. ئێ. ڕۆزێنتاڵ، م. ئی. فۆمینا، ڤ. ڤ. تساپکێڤیچ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ، چاپی چوارەم، مۆسکۆ،١٩٧١.

(٦٤) ڤ. ڤ. ڤینۆگرادۆڤ، زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ (مۆرفۆلۆژی)، مۆسکۆ، ١٩٧٢.

(٦٥) کوردستان عەبدولرەحمان لەتیف، دیارخەرو شێوەکانی دەربڕینی پێوەندییە دیارخەرییەکان لە زمانی کوردیدا ــ دیالێکتی سۆرانی (کورتەی نامەی دوکتۆری)، مۆسکۆ، ١٩٧٦.

(٦٦) ق. کوردۆ، بەراوردکردنی ڕێزمانی زمانی کوردی(کرمانجیی ژووروو و خواروو)، (کورتەی نامەی دوکتۆرای علوم)، مۆسکۆ، ١٩٦٥.

(٦٧) ق. کوردۆ، دوو بنچینەی ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا، ((کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی))، ١٩٥٩، ب ٢٩.

(٦٨) ق. کوردۆ، دەستووری زمانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٥٧.

(٦٩) ق. کوردۆ، دەستووری زمانی کوردی (بەکەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو)مۆسکۆ، ١٩٧٨.

(٧٠) ق. کوردۆ، دیسان دەربارەی فۆرمەی ناوی کۆ لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری ((نووسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات))، مۆسکۆ، ١٩٧٧، ل ٢٥٦ — ٢٥٩.

(٧١) ق. کوردۆ، ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا، ((ڕێزمان و مێژووی زمانەکانی ڕۆژهەلات))، لێنینگراد، ١٩٥٨، ل ١٠٩ — ١٤٢.

(٧٢) ق. کوردۆ، زمانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٦١.

(٧٣) ئیَ. ئۆ. کۆستێتسکایا، ڤ. ئی. کارداشێڤسکی، ڕێزمانی فەرەنسی، چاپی حەوتەم، مۆسکۆ، ١٩٧٣.

(٧٤) ئا. ن. گڤۆزدێڤ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ، بەرگی یەکەم، چاپی سێیەم، مۆسکۆ، ١٩٦٧.

(٧٥) ئی. ئا. گۆلانۆڤ، مۆرفۆلۆژیی زمانی ڕووسیی ئەمڕۆ، چاپی دووەم، مۆسکۆ، ١٩٦٥.

(٧٦) ڤ. ن. یارخۆ، ڤ.ئی. لۆبۆدی، زمانی لاتینی، چاپی دووەم، مۆسکۆ، ١٩٦٩.

(٧٧) ڤ. ئا. یفیمۆڤ، خاسیەتی گشتیی پێشکەوتنی جنسەکانی ناو لە زمانە ئێرانییەکاندا، کتێبی ((زمانە ئێرانییەکان))، مۆسکۆ، ١٩٧٦، ل ٢٣ — ٣٤.

**بە زمانی ئینگلیزی**

78- G.O. Curme, A Grammar of English Language, London, N – Y., 1933

79- H. A Gleason, Linguistics and English Grammar, New York, 1966

80-James Sledd, A Short Introduction to English Grammar, Chicago, 1959

81- J.c. Nesfield, English Grammar. Past and Present, London, 1931

82- Norman C. Stageberg, An Lntroductory English Grammar, New York 1965

83-Paul Roberts, Patterns of English, New York, 1956

84-A.V. Williams Jackson, Avesta Grammar, Part L, Stuttgart W. Kohlhamer, 1892

# ناوەرۆك

***